ناوی کتێب: کۆمەڵگا و غەریبەکانی
ناوی نووسەر: مەریوان وریا قانع
بابەت: فکری
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٨
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٦٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٥٢٨)ـی ساڵی (٢٠١٨)ـی پێ دراوە.

پێشکەشە بە:

غەریبان و مرۆڤە پەراوێزخراوەکانی دونیای ئێمە،

دونیای دوای ڕاپەڕین.

## ناواخن

### بەشی یەکەم
### پێشەکی



### بەشی دووهەم
### شڵەژانی پێوانەیی
### شیکردنەوەی ژینگەی خۆکوشتنی ژنان لە کوردستاندا

## بەشی سێیەم
## شارەکانی هەرێم و دروستبوونی "ڕووبەری گشتی"ی نوخبەوی

## بەشی چوارەم
## موناجاتی عیرفانی
## سەبارەت بە ڕۆحانیەتی بێڕۆحانیەت لە دونیای ئێمەدا



## بەشی پێنجەم
## لەودیوی تەکنۆلۆژیاوە
## تەکنۆلۆژیای پەیوەندی لە ژیانی ڕۆژانەدا

## بەشی شەشەم

## کۆتاییی سیستمی خوێندن وەک سیستمێکی یەکسانخواز لە هەرێمدا

## لە گیتۆ کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ گیتۆکانی خوێندن



## بەشی حەوتەم

## سەلەفیەت و شار

## بەشی هەشتەم
## سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوە و گوێگرتن
## لەدایکبوونی جمهوورێکی نائایدیۆلۆژی

## بەشی نۆهەم
## پێشەسازیی دروستکردنی نوخبە
## نوخبە وەک رەعیەت

"لــه هــەر شـوێنێکدا مــرۆڤ بابەتـی شیکردنەوە و ڕاڤەکــردن بـوو، لەوێدا یــەک زائیـد یـەک ناکاتـە دوو، بەڵکــو دەکاتــە ســێ، ڕەنگــە بەتــەواوی نەکاتە سـێش، بــەڵام بەدڵنیاییــەوە زیاتـرە لـە دوو."

– حیکمەتێکی کۆمەڵناسانە

# پێشەکی

## جیهانی کۆمەڵایەتی وەک جیهانێکی ئاڵۆز

ئـەم کتێبـە تەرخـان کـراوە بـۆ قسـەکردن لەسـەر ئـەو کۆمەڵگایـەی لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا دروسـت کـراوە و تـا ئەمـڕۆش بەبەردەوامـی لـە دروسـتکردندایە. وەک زۆرێـک لـە نووسـینەکانی تـری مـن، ئـەم کتێبـەش خواسـتێکی گـەورەی تێگەیشـتن لـە کۆمەڵـگا وەک دروسـتکراوێکی کۆمەڵایەتـی ئاراسـتەی دەکات، خواسـتی ناسـینی کۆمەڵـگا وەک بەرهەمـی بەرجەسـتەی سـەدەها و هەزارەهـا بڕیـاری کۆنکریتـی چەندەهـا بکـەری سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ئابـووری و دینـی و ڕۆشـنبیری. کۆمەڵـگا وەک شـتێک بەبەردەوامـی دروسـتی دەکەیـن، نـەک وەک شـتێک لـە سـەدەها و هەزارەهـا سـاڵ لەمەوبـەرەوە بۆمـان مابێتـەوە. بـە پێچەوانـەی زۆرێـک لـەو تێزانەشـەوە کـە لـە دونیـای ڕۆشـنبیریی ئێمـەدا ئامـادەن، ئـەم کتێبـە بەرگـری لـەو دیـدە دەکات کـە پێـی وایـە ئـەو دونیایـەی لـە دوای ڕاپەڕینـەوە دروسـتمان کـردوە، دونیایـەک نییـە لـە ڕابردووەوە بۆمـان مابێتـەوە و ئێمـە بـەزۆر خرابینـە نـاو بونیـاد و سیسـتم و میکانیزمـە جیاوازەکانییـەوە، شـتێک نییـە لـە بـاو و باپیـران و سـەدە کۆنەکانـەوە هاتبێـت، بەڵکـو دونیایەکـی تـەواو

تازەدروستکراوە و لە زۆر ئاستیشدا لە دابڕانێکی گەورەدایە لەگەڵ ئەو ڕابردووەدا کە لە دواوەیەتی. ئەم کتێبە نیشانی ئەدات چۆن و بە چ مانایەک دونیای دوای ڕاپەڕین دونیایەکی تازەیە و بەردەوامیی دونیای بەر لە ڕاپەڕین نییە، هەروەها نیشانی ئەدات ئەوەی هەیە و دروست کراوە بەرهەمی ئەو کردە و پلان و بڕیارە تاکەکەسی و دەستەجەمعییانەیە کە ئینسانی ناو ئەو کۆمەڵگایە لە چارەکەسەدەی ڕابردوودا داویانە و تا ئێستاش دەیدەن.

بێگومان هیچ بڕیارێکی کۆمەڵایەتی لە بۆشاییدا نادرێت و نەدراوە، هیچ چالاکییەکی دروستکردنی دونیای کۆمەڵایەتیی بێ پێشینە و پاشخان و بونیاد و ڕەوت و ڕێگر و ئەگەر و پێدراوی مێژوویی نییە، مرۆڤ و کۆمەڵگا هەرگیز لە خاڵی سفرەوە دەست پێ ناکەن، هەموو دروستکردنێکیش پێشینەیەکی تایبەتی هەیە، لە ڕاستیشدا شتێک لە فیکری زانستیدا بە ناوی خاڵی سفری دەستپێکردنەوە بوونی نییە، کە هێما بۆ سەرەتایەکی سەد دەر سەد تازە و ڕەها بکات، بەبێ پەیوەندیی بە ساتەوەخت و جووڵە و ڕێگرەکانی دونیای بەر لە خۆی. بەڵام هەموو ئەمانە هەرچییەک بن و هەرچۆنێک بووبن، هەر فۆرم و ناوەرۆکێکیان هەبێت، هێشتا بە ڕەهایی ڕێگر نین لەبەردەم ئەوەدا مرۆڤ دونیای کۆمەڵایەتیی خۆی بە شێوەیەکی تازە و لە فۆرم و ناوەرۆکێکی دیکەدا دروست بکات. دەزگای تر و کایەی تر و شێوازی تری حوکمڕانی و سیستمی نوێی بەها و ئەخلاقیاتی تر بهێنێتە کایەوە، جۆری تر لە ڕۆشنبیر و نوخبە و بکەری کۆمەڵایەتی دروست ببێت، فۆرمی تازە لە فیکر و زانیاریی

و مەعریفە بێتە کایەوە. بە کورتییەکەی شتێک بوونی نییە بەرەهایی ڕێگر بێت و نەهێڵێت شێوازی تر لە دینداری و لەبەرخۆریی و لە پەیوەندیی دەرەکی و ناوەکی دروست ببێت، یان فۆرمی تر لە متمانە و بڕوا و ترس و بەدگومانی بێتە کایەوە، جیاواز لەوانەی هەن و باڵادەستن. یاخود ڕێگر بن لەوەی تێگەیشتنی تازە بۆ مەسەلەی پیاوەتی و بۆ ژنبوون و بۆ هەژاری و دەوڵەمەندی لەدایک ببێت. یان ڕێگر بن لەبەردەمی دروستبوونی خوێنەری تر و نووسینی تر و بەرخوردی تردا. یان نەهێڵن فەزای گشتیی نوێ و پەیوەندیی تر لەنێوان نێر و مێدا دروست ببێت. دروستبوونی هەموو ئەمانە پابەستە بە کردە و جووڵە و توانا و خواست و خەون و بڕیار و زمانی ئەوانەوە کە لەناو ئەو دونیا کۆمەڵایەتییەدا ئامادەن. ئەوەش کە ئەم گشتە کۆمەڵایەتییە گەورەیە بەو شێوەیەیە کە ئێمە ئەمڕۆکە دەیبینین، کە دونیای ئێمە لە چارەکەسەدەی ڕابردوودا ئەو فۆرمە قەیراناوییەی ئەمڕۆکەی وەر گرتووە، کە کۆمەڵگایەکمان هەیە خاڵی لە متمانە و دەرگیر لەگەڵ چەندان قەیران و شڵەژانی پێوانەییدا، ئەوەی فۆرمی زۆر تایبەتی بەرخۆری و پیاوەتی و هەژاری و دەوڵەمەندبوونمان هەیە، هیچ یەکێکیان پێدراوێکی پێشین و دێرین نین و لە کۆنی کۆنەوە نەهاتوون و بۆمان نەماونتەوە، بەڵکو هەموویان پابەستی ئەو بڕیار و هەڵسوکەوت و ستراتیژانەیە کە بکەرە سەرەکییەکانی ناو ئەو دونیایە لە چارەکەسەدەی ڕابردوودا بەکاریان هێناوە و پەنایان بۆ بردووە. بەم مانایە ئەو ئێستایەی لە مرۆدا دروست کراوە و باڵادەستە، ئێستایەکی مێژووییە، کە

بڕیار و کردەی مێژوویی زۆر تایبەت و شێوازی تایبەتتری بەرخورد و زانیاری و تێفکرین و کۆمەڵێک بکەری تایبەت دروستی کردوون، کە چالاکانە لەناو دونیای کۆمەڵایەتیی خۆیاندا ئامادە بوون و هەم پراکتیکی تایبەتیی دەسەڵاتیان پیادە کردووە و هەم لەپاڵ فۆرمێکی تایبەتی مەعریفەدا دونیایان بینیوە و مامەڵە کردووە. هەموو ئەو شتانەش کە لەو شێوەیەی ئەمڕۆیاندا دروست بوون، دروستبوونەکەیان حەتمی نەبووە و دەکرا بە شێوازی تر و بە ناوەڕۆکی تر و بە مانای ترەوە لەئارادا بوونایە. بەکورتی دەکرا لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا کۆمەڵگایەکی جیاواز دروست بکرێت لەوەی کە ئەمڕۆ هەیە و بونیاد نراوە. ئەوەی کە نەکراوە و ڕووی نەداوە، ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە ئەم کۆمەڵگایەمان هەیە کە هەمانە، بەرهەمی بڕیار و چالاکی و ستراتیژەکانی کارکردنی بکەرە سەرەکییەکانی دونیای دوای ڕاپەڕینە.

ئەم ڕوانینە بۆ چۆنیەتیی دروستکردن و بونیادنانی دونیا و ئەم خۆگرێدانەوەیە بە ئێستا و بە بکەرە کۆنکریتییەکانی ناو ئێستایەوە، درێژەدانە بەو هێڵە لە بیرکردنەوە کە من بەبەردەوامی بەرگریم لێ کردووە، ڕەنگوڕیشە فیکرییەکانی لەناو نووسینەکانی ژنە فەیلەسوفی ئەڵمانی: هانا ئارێنتدا ئامادەیە. بیرکردنەوەیەک جگە لەوەی لەسەر بڕیاری تاکەکەسی و دەستەجەمعی و لەسەر کردەی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکان کار دەکات و دەچێتە ئەودیوی شێوە جیاوازەکانی سیستمگەراییەوە، هاوکات بیرکردنەوەیەکیشە لەسەر دیاردە کۆنکرێتی و بەرجەستەکانی ناو ژیانی گشتی ڕادەوەستێت و ئەوان دەکاتە کەرەستەی نووسین و هەوڵی لێکدانەوە

و ڕاڤەکردن و تێگەیشتنیشیان ئەدات.[1] هەموو ئەمانەش بە مەبەستی گۆڕین و دەسکاریکردن و دارشتنەوەی سەرلەنوێی ئەو ژیانە گشتییە بە شێوەیەک بتوانێت باوەش بە پلورالبوونی مرۆڤەکان و پلورالبوونی دیدەکان و پلورالبوونی خوست و ویستەکاندا بکات و بتوانێت کۆمەڵگایەک دروست بکات خاوەنی کەمترین کێشە و گرفت و نەهامەتی و هەڵگری زۆرترین کردە و ڕۆحیەتی هاریکاری و بەدەم یەکەوە چوون و لێبوردەیی.

بەڵام ئەم کتێبە ئەگەرچی ئەم دیدە ئارێنتییە لە گرنگیدان بە ژیانی گشتی و دەرچوون لە سیستمگەرایی ئاراستەی دەکات، کتێبێکی فەلسەفی نییە. فەلسەفە ئەو سەرزەمینە نییە کە وتارەکانی ئەم کتێبە و لۆژیکی بیرکردنەوە و تێڕامانەکانی ئاراستە دەکات. واتە ئەم کتێبە بەدوای هەقیقەتی جەوهەری و پرنسیپە بنەڕەتییەکان و چەمکە گەورە و گریمانکراوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە نییە، هەروەها سەرقاڵی گشگیری و کردنی پرسیاری پشتی پرسیارەکان و شتە گشتییەکان نییە، خەریکی ئەو شتانەش نییە کە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا ناوی پرسیارە قووڵ و نەمرەکانی مرۆڤ و مەسەلە جەوهەرییەکانی کۆمەڵگایان لێ نراوە، ئەم کتێبە دەیەوێت لەو دونیا کۆمەڵایەتییە ڕۆژانەییە تێبگات کە لە دوای ڕاپەڕینەوە و لە ماوەی چارەکەسەدەیەکدا لە هەرێمی کوردستاندا دروست کراوە. باسی ئەو دونیایە دەکات کە کۆمەڵێک بکەری

1 _لە ڕاستیدا ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە تەنها لای هانا ئارێنت ئامادە نییە، بەڵکو شێوازی باڵادەستی بیرکردنەوەشە لای میشێل فوکۆ. باسکردنی پەیوەندیی نێوان فیکری هانا ئارێنت و میشێل فوکۆ دەکەوێتە دەرەوەی بابەتی ئەم کتێبەوە.

کۆمەڵایەتی و مێژوویی، بە میزاج و چاوەڕوانی و تەماحی کۆمەڵایەتیی تایبەتەوە، لە ڕێگای چەندەها بڕیاری تاکەکەسی و دەستەجەمعیی کۆنکریتەوە، لەناو کۆمەڵێک پەیوەندی و ستراتیژیەتی تایبەتدا دروستیان کردوە و لەمرۆشدا بەبەردەوامی دروستی دەکەن و دەیپارێزن.

وەک وتم ئەو بکەرانەی ئەو دونیایەیان دروست کردوە و دروستیشی دەکەن، کەسانی خاڵی و بێپێشخان و بێفەرهەنگ و بێڕوانینی پێشوەخت نین، کەسانێک نین لە بۆشاییدا بژین و لە بۆشاییدا کردە کۆمەڵایەتییەکانیان ئەنجام بدەن، بێ خوو و عادەت و کەلەپووری تایبەت نین، بێ زمان و خولیاو و چاوەڕوانیی تایبەت نین، بە پێچەوانەوە هەریەکێک لەو بکەرانە هەڵگری هەبیتۆسی کۆمەڵایەتیی تایبەتن، کە گرێ دراوە بە گەشەکردنێکی مێژوویی تایبەت و بە شێوازی تایبەتی گەورەبوون و پەروەردەکردن و بەتاکەکەسبوونی هەریەکێکیانەوە.[1] ئەم بکەرانە ڕەنگە بیانەوێت و بخوازن

---

١ هەبیتوس یەکێکە لە چەمکە هەرە سەرەکی و بەناوبانگەکانی ناو سۆسیۆلۆژیای پیار بۆردیۆ. بۆردیۆ(١٩٣٠-٢٠٠٢) کۆمەڵناسێکی فەرەنسیی گەورەیە و نووسینێکی زۆری لەسەر کردە و بکەری کۆمەڵایەتی هەیە. لای ئەم کۆمەڵناسە هەبیتوس هێما بۆ سەرجەمی ئەو خوو و عادەت و ئامادەگییە کۆمەڵایەتییە ناوەکییانە دەکات کە ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو کەسەکاندا دەیچێنێت یان دروستی دەکات. هەبیتۆس هەم کۆمەڵێک شێوازی هەڵسوکەوت و هەم کۆمەڵێک ئاسۆی بیرکردنەوە و هەم هەندێک توانا نیشان ئەدات کە مرۆڤ بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت لەمیانەی کردەی پەروەردەکردندا لەناویدا دروست دەبێت. هێما بۆ ئەو مەیل و ڕوانین و هەڵسەنگاندنە دەکات کە پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی لەناو مرۆڤدا دروستی دەکات و لە ڕێگایانەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەڕوانێت و کاراندنەوەکانی نیشان ئەدات. هەروەها هەبیتوس کاریگەریی لەسەر چێژی مرۆڤ هەیە، کاریگەریی لەسەر ئەوە هەیە مرۆڤ چی

وەک بکەری دروستکردنی ئەو دونیایە دەر نەکەون و خۆیان بە بەرپرسی دروستبوونی شتەکان و دیاردەکانی ناوی نەزانن، بەلام ئەم خۆشاردنەوە کۆمەلایەتییە ناتوانێت ڕێ لە هاتنەکایەی ئەو دیدە مێژووییە بگرێت کە دەتوانێت ورد بڕوانێت و بکەرەکان و بڕیار و خواست و تەماحەکانیان بناسێتەوە و بە شێوازی جیاوازیش شییان بکاتەوە. بەم مانایە ڕوانین بۆ کۆمەڵگا لەم کتێبەدا ڕوانینێک نییە لەسەر جیاکردنەوەی تاکەکەس لە گروپ، یان ئاگایی لە نائاگایی یان بابەتی لە خودیی یان بونیاد لە بکەر، کار بکات. یان پێی وا بێت بونیادێکی قووڵی نەگۆڕ هەیە کە هەموو هێزەکان لەناویدان، یان یەک عەقڵیەت و یەک سیستم هەیە کە هەزاران ساڵە لەوێدایە و هەموو کۆمەڵگا، بەهەموو هێز و گروپە جیاوازەکانی ناویەوە، هەڵگری ئەو تاکە عەقڵیەتە و لەناو ئەو تاکە سیستمەدا نوقمن. ئەم کتێبە دژ بەم ڕوانینە سیستگەرا و گشتگیر و نامێژووییەیە، بەلام بەبێ ئەوەی بکەوێتە ناو مەسەلەی ئیرادەگەرێتییەکی سادەوە، ئەوەی بەئینگلیزی پێی دەڵێن ڤۆلەنتریزم Voluntarism، کە هیچ حیسابێک بۆ ڕێگرە بابەتییەکان نەکات.

ڕوانینی سیستمگەرایی، کە ڕوانینێکی دۆگمایی و سادە و جێگیر و نادینامیکی و خورافییە بۆ کۆمەڵگا، ئەو ڕوانینە

---

بە جوان و چی بە ناشیرین، چی بە خۆش و چی بە ناخۆش، چی بە گونجاو و چی بە نەگونجاو بزانێت. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر چەمکی هەبیتۆس لای پیار بۆردیۆ بڕوانە:

Lizardo, O. 2004, "The cognitive origins of Bourdieu's Habitus", Journal for the Theory of Social Behaviour, vol. 34, no. 4, pp. 375-448.

نییە کە نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە ئاراستە دەکات، بە پێچەوانەوە ئەم کتێبە هەوڵی ئەوە ئەدات وێنەیەکی زۆر ئاڵۆزتر بۆ دونیای کۆمەڵایەتی بکێشێت و نیشانی بدات کە تیایدا ڕووبەرێکی گەورە بۆ بڕیار و کردەی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان بکاتەوە. لەم ڕووەوە ئەم کتێبە نیشانی ئەدات چۆن لە چارەکەسەدەی پێشوودا چەندان گۆڕانکاریی گەورە و بێپێشینە بەسەر کۆمەڵگای ئێمەدا دروست بوو، کە پێشتر بوونیان نەبووە و ئەم دروستبوونەش پابەستی بڕیار و کردەی بکەرە کۆمەڵایەتییەکانی ناو ئەو دونیایەن. کۆمەڵگا لەو ڕوانینەدا کە ئەم کتێبە ئاراستە دەکات یەکەیەکی هاوشێوە و گەورەی بێجیاوازی و بێناکۆکی و بێململانێ نییە، خاوەنی کولتوور و بونیادێکی عەقڵیی و کۆمەڵایەتیی نەگۆڕ و یەکانگیر و هاوشێوە نییە، سیستمێک بوونی نییە یەک لۆژیک بەسەر هەمووانیدا بسەپێنێت. کۆمەڵگا لەم کتێبەدا پێکهاتێکی ئاڵۆزە، کە لە چەندەها کایە و هەبیتۆس و میزاج و خواست و ویست و خەون و تەماحی کۆمەڵایەتیی جیاواز پێک هاتوە، کە بەسەریەکەوە هەم دیاردە و ڕووداوی تازە و جیاواز و هەم کردە و جووڵە و ڕوانینی جیاواز و ناکۆکیش لەناو دونیای کۆمەڵایەتیدا دروست دەکەن. لەناو هەر کایەیەکی کۆمەڵایەتییشدا هەم بونیادی تایبەت و هەم بکەری تایبەت و هەم پرۆژە و تەماح و ستراتیژی جیاواز ئامادەن، هەریەکێک لەم بکەرانەش هەڵگری هەبیتۆسی تایبەت و توانای کردەی کۆمەڵایەتیی تایبەت و خەون و تەماحی تایبەتن.

خاڵێکی دیکە کە لە ڕووی تیوری و میتۆدییەوە نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە ئاراستە دەکات؛ ئەو پێدراوە

ئەنترۆپۆلۆژیەیە کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی تەئویلی دەناسێنێت، مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی ڕاڤەکار. لەم کتێبەدا مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی ڕاڤەکەر مامەڵە دەکرێت، کە توانای تەفسیرکردن و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی دونیای هەیە، بە تەفسیرکردن و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی خودی ئەو بونیاد و سیستمانەشەوە کە وەک دەرەنجامی کەڵەکەبوونی بڕیاری بکەرەکان دێنە کایەوە. ئەمەش مانای ئەوەی ئەم کتێبە لە دۆخی گریمانکردنی بوون و ئامادەگیی بونیاد و کەلەپوور و سیستمی گشتیدا، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەریەکێک لەوانە مانای جیاواز و وێناکردنی جیاواز و تایبەتی لەلایەن بکەرە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانەوە هەیە و هەریەکێکیشیان دەچێتە پەیوەندییەکی تایبەتەوە لەگەڵ ئەو بکەرانەدا. هەموو ئەمانەش سەرچاوەی دروستبوونی ئاڵۆزی و فرەمانایی و لێکنەچوون و فرەتەفسیرییە لای بکەرە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان و بەمەش کردە و پراکتیکی مرۆڤەکان و گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتی بەتەواوی ئاڵۆز دەبێت و ئاڵۆز دەکرێت. بۆیە هیچ یەکێک لە پێدراوە کۆمەڵایەتییەکان، تەنانەت ئەوانەش کە لە شێوەی بویناد و سیستمدا ئامادەن، یەک جۆر بیرکردنەوە و فشار و خەون و ویست و کردە و پراکتیک و خواست بەسەر هەمووانـدا ناسەپێنن. مادام مرۆڤ بوونەوەرێکی تەئویلییە، ناکرێت تەنها یەک تەئویل بۆ دونیای کۆمەڵایەتی بوونی هەبێت، لێکدانەوەی جیاوازیش بۆ دونیای کۆمەڵایەتی کردە و دەرەنجامی جیاواز لەو دونیایەدا دروست دەکات.[1]

---

١ _بڕوانە:

خاڵێکی گرنگی تر لەم ڕوانینەدا ئەوەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی جگە لە بونیاد و چوارچێوە و سیستم، چەندەها ئایدیال و باوەڕ و قەناعەت و هەست و ئیحساساتی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی تێدایە، کە کاریگەریی گەورە لەسەر ڕووداوەکان و لەسەر ژیانی تاکەکەس و ژیانی دەستەجەمعیی مرۆڤەکان جێ دەهێڵن، بێ ئەوەی ئەو ئایدیال و باوەر و قەناعەت و هەستانە بەشێک بن لە بونیادەکان و چوارچێوەکان و سیستمەکان. دونیای کۆمەڵایەتی دونیایەک نییە کورت بکرێتەوە بۆ جەبر و میکانیزم و فشاری سیستم و بونیادەکان، هەمیشە شتێک هەیە ناوی مرۆڤ و تاکەکەس و بکەرە، کە سەرجەمی ئەو شتانە ئاڵۆز دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا خواست و ویست و چاوەڕوانیی جیاواز دەهێنن و چەندان ئەگەر و سەرەتای نوێ بۆ ناو مێژوو و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان دەگوێزنەوە. جارێکی دیکە دووبارەی دەکەمەوە کە پێ لەسەر ئەم ڕەهەندە دینامیکییەی ژیانی کۆمەڵایەتی دادەگرم، مەبەستم ئەوە نییە لە بونیادگەری و سیستمگەراییەوە بپەڕینەوە بۆ ئەو ئاراستەیەی بە "voluntarism"، واتە ویستگەرایی، ناو دەبرێت. ویستگەرایی بە مانای وێناکردنی مرۆڤ و گروپەکان وەک بکەری خاوەن ویست و ئیرادە و لەوێشەوە بکەری تەواو ئازاد و سەربەست لە هەر بونیاد و ڕێگر و چوارچێوە و سیستمێک. ئەگەر ویستگەرایی مانای ئەوە بێت مرۆڤ ئازادە لەوەدا چی بوێت بیکات و ئەنجامی بدات، ئەوا ئەو دیدەی نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە ئاراستە دەکات لە دوور

---

Loseke ،Donileen R. (2010 ). Thinking about Social Problems: An Introduction to Constructionist Perspectives. New Jersey, Transaction Publishers. P 188-189.

و نزیکەوە پەیوەندیی بەم دیدە ویستگەرایییەوە نییە.[1]

بەکورتی، هیچ واقیعێکی مێژوویی تەنها بەرهەمی سیستم و بونیاد و چوارچێوە گشتییەکانی نییە، تەنها فشاری ئەو شتانە دروست و ئاراستەی ناکات، شتێک نییە تەنها ڕابردوو دروستی کردبێت، ژیانی کۆمەڵایەتی پڕیەتی لە بڕیاری تایبەت و دەستەجەمعی، لە عەقڵانیەت و ناعەقڵانیەت، لە هەست و نەستی تایبەتی، لە تووڕەبوون و هەڵچوون و ناڕازیبوونی کۆمەڵایەتی، لە تراوما و دڵشادی و خەمباری، لە ویست و خەونی جۆربەجۆر، لە بەها و ئایدیالی هەمەرەنگ، لە توانا و شێوازی جیاوازی لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی دونیای کۆمەڵایەتی، کە وا دەکەن نەکرێت واقیع، هیچ واقیعێک، لەناو هیچ سیستم و بونیادێکی گشتیدا زیندان بکرێت. هەمیشە چەندەها ئەگەری گرنگ هەن کە ناچنە ناو میکانیزمی ئیشکردنی بونیادەکان و ڕووبەری سیستمەکانەوە. لە ڕاستیدا هەم بونیادگەری و هەم سیستمگەرای، مرۆڤ بە مانا فراوانەکەی، دەکەنە دەرەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و لە شوێنی ئەودا کۆمەڵێک میکانیزم و فۆرمی جیاوازی حەتمیەت و پەیوەندیی ناشەخسی جێگیر دەکەن، کە بەسەریەکەوە هەموو مانایەکی ڕاستەقینە لە

---

١ _ ڕەگەکانی دیدی ویستگەرایی دەچێتەوە سەر ڕۆشنگەری، بەتایبەتی ئەو ئاراستەیەی کە ناوی کانتیزمی نوێ، نیو کانتیزمی لێ نراوە. لەناو فیکری سۆسیۆلۆژیشدا لەناو زیاد لە ئاراستەیەکدا بوونی هەیە، لەوانە قوتابخانەی ئینتەرئاکسیۆنی سیمبۆلی، تیۆرەی ئالوگۆر، سۆسیۆلۆجیای وجودی، سۆسیۆلۆجیای فینۆمینۆلۆژی. بڕوانە:
Jeffrey C. Alexander (1978). Formal and Substantive Voluntarism in the Work of Talcott Parsons: A Theoretical and Ideological Reinterpretation. American Sociological Review, Vol. 43, No. 2 (Apr., 1978), pp. 177-198

چرپەتی و ئاڵۆزیی ژیانی کۆمەڵایەتی دەسێنێتەوە. هاوکات ژیان وەک جووڵەی سەر تەختەی شاترەنج وێنا دەکەن، کە یاسا و جەبری زۆر ڕوون و ئاشکرا ئامێرەکان دەجووڵێنێت و لە خانەیەکەوە دەیانباتە خانەیەکی تر. ئەوەی ئەم دیدە دەیدۆڕێنێت دینامیکەت و وزەی ناوەکیی شتەکان و بکەرەکان خۆیانە، ئاخر جیاوازیی نێوان فیل و ئەسپێک لەسەر تەختەی شاترەنج لەگەڵ فیل و ئەسپێکی ناو دونیادا زۆر زۆر گەورە و هەمەلایەنەیە. سەربازێکیش لەسەر تەختەی شاترەنج بە جۆرێک دەجووڵێت و دەچێتە پەیوەندییەوە تەواو جیاواز لە سەربازێک لەناو جیهاندا. کێشەی نمرە یەک و هەرە گەورەی سیستەمگەرایی ئەوەیە تەختەی شاترەنج بە یاسا و نۆرمە داخراوەکانیەوە دەخاتە شوێنی جیهان بە توانا ناوەکییە پێشبینەکراوەکانیەوە.

با لێرەدا نموونەیەک لە سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر بهێنمەوە، بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کە ئیشی ڕاستەقینەی فیکر، بەتایبەتی فیکری سۆسیۆلۆژی، چییە و لە کوێدایە. لە سۆسیۆلۆژیای ئاییندا ماکس ڤێبەر لە بیرۆکەیەکی گشتی و گەردونییەوە دەست پێ دەکات، کە بیرۆکەی نیشاندانی ئارەزوو و خواستی گشتیی مرۆڤە بۆ گەڕان بەدوای ڕزگاربوونی یەکجارەکیدا، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن salvation. بەلام ڤێبەر تەنها لەسەر ئەم خواستە گشتییە ناوەستێت و هەموو دونیای کۆمەڵایەتی لەپاڵ ئەو چەمکە گشتییەدا لێک ناداتەوە، بەڵکو زۆر بەوردی نیشانی ئەدات چۆن لە سەردەم و کۆمەڵگا و ڕۆژگارە جیاوازەکاندا، مرۆڤ چەندان شێواز و ڕێگای جیاوازی داهێناوە بۆ گەیشتن بەو

ڕزگاربوونە. ئەگەر گەڕان بەدوای ڕزگاربووندا پرنسیپێکی گشتی بێت، ئەوا ڕێگاکانی گەیشتن بەو ڕزگاربوونە فرەجۆر و جیاوازن و لە سەرەدەم و مێژوو و کۆمەڵگای جیاوازیشدا، شێواز و ناوەرۆکی جیاواز دەگرنە خۆ. یەکێکیش لەو ڕێگایانە بۆ گەیشتن بەم ڕزگاربوونە یەکجارەکییە؛ ئایینە، داهێنانی ئایینەکانە. ئایینەکان ڕێگایەکی تایبەتی گەیشتنن بەو ڕزگاربوونە کە مرۆڤ بیری لێ کردۆتەوە، بەڵام ئایینەکانیش لەناو خۆیاندا هەم جیاوازن و هەم بکەرە دینییە جیاوازەکانیش مانا و فۆرمی جیاواز بەو ڕزگاربوونە دەبەخشن، ئەمە جگە لەوەی لە سەردەمە مێژووییە جیاوازەکاندا و لەناو کۆمەڵگا جیاوازەکاندا، ئەو ئایینانە چەندان فۆرم و مانای جیاواز بەو ڕزگاربوونە دەبەخشن و بەخشیوە. هاوکات لە دیدی ڤێبەردا لەناو هەر دینێکیشدا یەک یان زیاد لە یەک سیستمی ئەخلاقیی و زیاد لە جۆرێک لە ئەخلاقیاتی کردەیی و پراکتیکی هەیە، کە هەریەکێکیان هەم دەرەنجامی کۆمەڵایەتی و ئینسانیی جیاوازی لێ دەکەوێتەوە و هەم شێوازی جیاوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییش بۆ ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی ژیانی کردەیی مرۆڤ دروست و پێشنیار دەکەن.[1] لەم ڕوانینەدا ئیشی فیکر لەو خاڵەدا کۆتایی نایەت ئەوە دووبارە بکاتەوە کە مرۆڤ بونیادێکی دەرونیی تایبەتی هەیە وای لێ دەکات بەدوای ڕزگاربووندا بگەڕێت، کاری ڕاستەقینەی فیکر ئەوەیە ڕێگا تایبەتەکان و فۆرمە جیاوازەکان و بکەر و دەلالەتە مێژووییە ئاڵۆزەکانی

١ _بڕوانە :
Weber, Max. (1997). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism. London: Routledge.

گەڕان بەدوای ئەو ڕزگاربوونەدا بدۆزێتەوە و ڕاڤە بکات.

ئەگەر ڤێبەر لەناو دیندا خەریکی لێکدانەوەی ئەم ئارەزوو و خواستە ئینسانییە گشتییە بۆ ڕزگاربوون بووبێت و دینی بە سەرزەمینیی ئەو گەڕانە زانیبێت، ئەوا لە ئێستادا ئەو ڕاستییە بۆ هەمووان ئاشکرایە کە دەشێت ئەو ڕزگاربوونە لەناو نادین و لەناو چەندەها ئایدیۆلۆژیا و فۆرمی نادینیی ڕۆحانیەت و سیاسەتیشدا ئامادە بێت. بەکورتی ژیانی کۆمەڵایەتی ژیانێک نییە بە بوونی ئەم یان ئەو پرنسیپی گشتی، یان بە بوونی بونیادی کۆمەڵایەتی و عەقڵی و سایکۆلۆژیی گشتی، یاخود بە بوون یان نەبوونی ئەم یان ئەو سیستمی گەورە و گشتگیر، لێک بدرێتەوە و بخوێندرێتەوە. هەموو هەوڵێکی لەو بابەتە لە تێنەگیشتن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و لە تەمەڵی فیکری و لە بێئاگابوونێکی گەورەشەوە لە دەیان تێز و تیورە و کایەی زانستیی جیاوازەوە دێت، کە هەموویان لە دەرەوەی گشتگیرییە گەورە و زەبەلاحەکاندا بیر دەکەنەوە.

بەکورتی، ئەوەی نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە ئاراستە دەکات؛ ئەم تێز یان ئەو تێزی فەلسەفیی دیاریکراو نییە، هەروەها تەماحی دروستکردنی تیورییەک نییە بتوانێت گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتی لێک بداتەوە، هەروەها پێشنیارکردنی چوارچێوەیەک یان سیستمێک نییە کە گوایە لەناو هەموو ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکاندا ئامادەیە و بە یەک لۆژیک کار دەکات و یەک جۆر لە عەقڵی گریمانکراو ئاراستەی دەکات. ئەوەی نووسینەکانی ئەم کتێبە ئاراستە دەکات ئەو ڕوانینە سۆسیۆلۆژییەیە کە دونیای کۆمەڵایەتی وەک دونیایەکی دروستکراو و ئاڵۆز و پلورال وێنا دەکات، کە دەکرا بەو

شێوەیە نەبووایە کە ئەمڕۆ هەڵگریەتی. ئەوەشی بەرپرسە لە دروستکردنی ئەو دونیایە، ئەو بکەرە کۆمەڵایەتییانەن کە بە ڕوانین و بە هەبیتۆس و بە تەماحی کۆمەڵایەتی و ئاکاری جیاوازەوە ئەو دونیایەیان دروست کردوە.

وتارەکانی ناو ئەم کتێبە لەم دیدگا تیۆرییەوە نووسراون و هەوڵدانێکن بۆ ڕوانین لە زیاد لە ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتی و دۆزینەوەی بەها و بکەرەکانی ناو ئەو ڕووبەرانە و ئاشکراکردنی شێوازی بیرکردنەوە و جموجووڵ و کردە و پراکتیکی کۆمەڵایەتییان، هەموو ئەمانەش وەک ڕێگایەک بۆ وێناکردنی دونیای کۆمەڵایەتیی ئێمە وەک دونیایەکی ئاڵۆز، کە هەم هێزی جیاوازی تێدایە و هەم هەمووشیان لە جووڵە و کردەی مێژوویی تایبەتی خۆیاندان، جا یان بە ئاراستەی بەرهەمهێنانەوەی ئەو دونیایە بەو شێوەیەی کە هەیە و ڕێگەگرتن لەوەی کە بگۆڕدرێت و سەرلەنوێ دابرێژرێتەوە، یان بە ئاراستەی سەرلەنوێ دڕاشتنەوە و دەسکاریکردنی.[1]

ئەگەرچی لەم کتێبەدا گەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ دیدی هەندێک فەیلەسوف و هەندێک بیرۆکەی فەلسەفی ئامادەیە، بەڵام ئەوەی لەم گەڕانەوانەدا ئامادەیە ئەو ڕوانینە کۆمەڵناسانەیە کە لەناو ئەو دید و چەمکە فەلسەفییانەدا ئامادەن. ئەو زمانە گەردوونییەی گوایە فەلسەفە قسەی پێ دەکات زمانی ئەم نووسینانە نییە، چونکە ئەو زمانە زۆر جار زمانێکی تەواو ناکۆنکریت و نامێژوویی و موجەرەد و گشتگیرە، کە ناتوانێت

١ _بۆ وردەکارییە تیۆرییەکانی ئەم ڕوانینە بۆ هێنانەکایە و ڕێگەگرتن لە گۆڕانکاریی زیاتر لەسەر ئەم خاڵانە بڕوانە: بیار بۆردیۆ (١٤٢٥). اسباب عملیە. اعادە النزر بالفلسفە. تعریب: د. انور مغیث. سرت. الدار الجماهیریە للنشر و التوزیع الاعلان. ل ١٥-١٩.

هاریکارمان بێت بۆ خوێندنەوەی هیچ دیاردەیەکی کۆنکریتیی ناو هیچ واقیعێکی مێژوویی. وەک بۆردیۆ لە ڕەخنەکردنیدا بۆ زمانی گەردوونی کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان دەڵێت، "ئەم شێوەزمانە توانای دەستنیشانکردنی نییە و سەرچاوەشی لە کۆمەڵێک زاراوەوە وەر گرتوە کە گشتگیر و ناقۆڵان".[1] بەکورتی ئەوەی نووسینەکانی ناو ئەم کتێبە ئاراستە دەکات دید و ڕوانینی ناو زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکانە، بەتایبەتی زانستی کۆمەڵناسی، سۆسیۆلۆژیا. زانستی کۆمەڵناسی پێ لەسەر بوونی پێکەوەییی مرۆڤەکان و بوونیان لەگەڵ یەکتردا دادەگرێت، ژیانی کۆمەڵایەتییش بە دروستکراوی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان دادەنێت. لە دیدی کۆمەڵناسییەوە منی تاکەکەسی منێکی دابڕاو و بێپەیوەندیی نییە، بەڵکو دروستکراوێکی کۆمەڵایەتییە کە لە پەیوەندییەکی بەردەوام و فرەشێوەدایە لەگەڵ ئەوانی تردا و بەسەریەکیشەوە بەشێکن لە گشتی گەورەتر، کە لە دواوێستگەدا کۆمەڵگا و ژیانی کۆمەڵایەتی دروست دەکەن. مرۆڤ بەتەنها لە ناو دونیادا ناژی، مرۆڤ بەردەوام لەگەڵ ئەوانی تردا و لەناو پێکەوەبوون و بە هاوبەشی لەگەڵ کەسانی تر لەناو دونیادا دەژیی. دونیاش شتێک نییە بە مرۆڤ بەخشرابێت، بەڵکو شتێکە مرۆڤ بەبەردەوامی دروستی دەکات. ئەم کردەی دروستکردنەیە ئەم کتێبە هەوڵی خوێندنەوەی ئەدات، کردەی دروستکردنی کۆمەڵگایەک لە چارەکەسەدەی دونیای دوای ڕاپەڕیندا، کە کردەیەکی مێژووییە و وەک هەموو کردەیەکی تری دروستکردنی دونیاش کردەیەکی دەستەجەمعییە و بەرهەمی سەدەها و هەزارەها بڕیاری تایبەتیشە.

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢.

## سۆسیۆلۆژیای شار

ئەوەی خوێنەر لەم کتێبەدا دەیخوێنێتەوە زیاتر باسکردنی ژیانی شار و دیاردەکانی ناو شارە گەورەکانی کوردستانە، کتێبەکە کەمتر بەلای دیاردەکانی ناو شارۆچکە و لادێکانی کوردستاندا چووە. هۆکاری ئەمەش ئەوە نییە کە ژیانی شارۆچکە و لادێکانی کوردستان گرنگ نەبن و شتێکیان تیا نەبێت مرۆڤ لەسەریان بوەستێت و شییان بکاتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هەم ڕووبەری کتێبەکە سنووردارە و هەم نووسەرەکەشی کەمتر شارەزای ژیانی ناو لادێ و شارۆچکەکانی کوردستانە، ئەگەرچی هەندێک لەو دیاردانەی کتێبەکە باسیان دەکات ڕووی لە گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێمەیە.[1] لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک لە نووسینەکانی ناو کتێبەکە تەرخانە بۆ سۆسیۆلۆژیای خوێنەران و خوێندنەوە و بابەتی سەرەکیی ئەو نووسینە دروستبوونی جۆرێک لە خوێنەر و گوێگری تازە و نائایدیۆلۆژییە کە لە دەرەوەی شارە گەورەکاندا و لەناو شارۆچکەکانی هەرێمدا دروست بوون.

شار لەم کتێبەدا یەکەیەکی شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی گەورەیە، کە شوێنی دروستبوونی دەیان دیاردەی کۆمەڵایەتی و پرۆسە و ئاکار و فەرهەنگی نوێ و جیاوازە. کە باس لە شار دەکەم تەنها باس لە سەرزەمینێکی جوگرفیای گەورە و لە ژمارەی زۆری مرۆڤ و لە ئامادەگیی چەندەها بازاڕ و

1 _هیچ لێکدانەوەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی دونیای ئێمە کامڵ و مانادار نابێت گەر بەوردی لەسەر دیاردە تایبەتەکانی ناو لادێ و شارۆچکەکانی کوردستان ڕانەوەستێت. گرنگیدان بەم بەشە تایبەتەی کۆمەڵگای ئێمە ئەرکێکی مەعریفی و سیاسی و ئەخلاقیی گرنگە.

مۆڵ و پارک و چاپخانە و کتێبخانە و چاخانە و شتی دیکەی لەم بابەتانە ناکەم بەتەنها، گەرچی هەموو ئەمانە دەرکەوتی گرنگی شارن و لە زیاد لە بابەتێکی ناو ئەم کتێبەدا بەوردی قسە لەسەر هەندێکیان کراوە، بەڵکو بەر لە هەموو شتێک باس لە ماف دەکەم. شار وەک ڕووبەرێک بۆ ماف، لەوانەش، بۆ نموونە، مافی هەبوونی شار، یان مافی بوونی "ماف لە شار"دا. لە هەموو ئەو دۆخانەدا کە باس لە شار دەکەم لەم دیدە تایبەتەی پێداگرتن لەسەر مافەوە باسی دەکەم، دیدێک کە دوو کۆمەڵناسی بەناوبانگی وەک هێنری لۆفۆفێر و دیفید هارفی بە "مافی هەبوونی شار" ناوی دەبەن.[1] مافی هەبوونی شار، یاخود بوونی ماف لە شاردا، کۆمەڵێک مافی سەرەکی دەگرێتە خۆی، کە دەشێت بەم شێوەیە ڕیزیان بکەین: مافی هەبوونی ماڵ، هەبوونی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، هەبوونی کار، هەبوونی ئاستێک لە ژیانی گونجاو، هەبوونی شوێنی یاری و پشوودان، توانای دەستگەیشتن بە زانیاری، هەبوونی ئازادیی خۆڕێکخستن و کۆبوونەوە، هەبوونی ئاو و خۆراک، مافی هەبوونی توانای بەشداربوون و تەعبیرکردن لە خود، هەبوونی خزمەتگوزاریی تەندروستی و خوێندن و پەروەردە و ڕۆشنبیری، هەبوونی ژیانی تایبەت و ئاسایش، هەبوونی ژینگەیەکی پاکژ و تەندروست، هتد... ئەمە جگە لە مەسەلەی پاراستنی پلورالیزم و فرەڕەنگی لە شاردا و پاراستنی مێژوو و شوناسە فەرهەنگییەکەی شار و پاراستنی

---

١ _بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر دیدی ئەم دوو نووسەرە بۆ شار، بڕوانە: دیفید هارفی (٢٠١٧). مدن متمردە: من الحق فی المدینە الی ثورە الحزر. ترجمە لبنی سبری. بیروت، الشبکە العربیە للابحاث و النشر.

ژیانی کۆمەڵایەتی لەناویدا.[1]بە مانایەکی دیکە کە باس لە شار دەکەم وەک ماف، باس لە هەندێک پرنسیپی فیکری و تیوریی موجەرەد ناکەم، بەڵکو باس لە ئامادەگیی ئەم مافانەش دەکەم لەناو سەرجەمی ئەو میکانیزمانەدا کە شار دروست دەکەن. بۆ نموونە لەم کتێبەدا من بەرگریی لە "ڕووبەری گشتی" دەکەم وەک ڕووبەرێکی مافپەروەر، بەرگری لە سیستمی خوێندن و فێربوون دەکەم وەک سیستمی دروستکردنی سەرتایەکی یەکسان و دادپەروەر بۆ هەمووان، بەرگری لە ژیانێکی گشتی دەکەم بێ ترس و فشاری دەرەکی هتد... ئەم کتێبە لە ئاستە نۆرماتیڤ و پێوانەییەکەیدا بەرگریی لە بوونی جۆرە شارێک دەکات کە دانیشتووانەکەی وەک ڕێگر و بەربەست لەبەردەم پرۆژەکانیدا نەبینێت، شارێک دانیشتووانەکەی لێ زیاد نەبێت و وەک مرۆڤی زیادە وێنایان نەکات، بەڵکو پرۆژەکانی لە خزمەت و لە پێناوی دانیشتووانەکەیدا ئەنجام بدرێت. پێشکەوتن و تازەبوونەوەی ڕاستەقینەی شار مانای پێشکەوتن و تازەبوونەوەی دانیشتووانەکەی دەگەیەنێت، نەک پێشکەوتنێکی دەرەکی، کە فۆرمی گیتۆی کۆمەڵایەتی و دابەشبوونی قووڵ و زیاتر و دروستبوونی ڕووبەری گشتی نایەکسان و لەدایکبوونی دەزگای نادادپەروەر بگرێتە خۆی. ئەو خاڵەش کە ئاراستەی ئەم دید و ڕوانینە بۆ شار دەکات، ئەو ڕوانینەی کۆمەڵناسی ئەمریکیی بەناوبانگ "ڕۆبرت پارک"ە کە پێی وایە مرۆڤ لە پرۆسەی دروستکردنی شاردا کەسایەتیی خۆشی سەرلەنوێ

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩-١٠

دروست دەکاتەوە.[1] شار تەنها ڕووبەرێکی دەرەکی نییە، بەڵکو ڕووبەرێکی دەرونی و ناوەکییە و ڕۆڵێکی گەورە لە دروستبوونی کەسایەتیی مرۆڤدا دەبینێت. ئەم دیدە بۆ شار وا دەکات، بۆ نموونە، دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان لە کوردستاندا وەک دیاردەیەکی شاری ببینم و وەک بەشێک لەو فەزا و بەها و دۆخە سایکۆلۆژییە وێنای بکەم کە لە شارەکانی هەرێمدا دروست بوون و هاتوونەتە کایەوە. وا دەکات تەواو دژی ئەو پرۆسەی بەتایبەتیکردن و بەبزنسکردنەی سیستمی خوێندن بم کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا سیستمی فێربوون و پەروەردەی وێران کردوە. هتد...

## دروستبوونی کۆمەڵگایەکی جیاواز

دیدی باڵادەست لە دونیای ڕۆشنبیریی ئێمەدا ئەوەیە کە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی جێگیر و نەگۆڕە، ئەوەتەی هەیە خەریکی خۆدووبارەکردنەوەیەکی بێکۆتایی خۆیەتی، تازەبوونەوەی تێدا نییە، تا ئێستاش فەرهەنگ و کولتووری هەزاران ساڵ لەمەوبەر لەناویدا سەروەرە، گوند و پەیوەندییە تەقلیدییە خێڵەکی و داخراوەکان بەڕێوەی دەبەن، هتد... هاوکات باس لەوە دەکرێت لەم کۆمەڵگایەدا عەقڵیەتێکی دینیی نەگۆڕ و سیستمێکی ئەخلاقیی چەقبەستوو ئامادەیە، کە ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی ئێمە ئاراستە دەکەن. باس لە ئامادەگیی بونیادێکی سیاسیی گەورەش دەکرێت، کە گوایە بە درێژایی مێژووی سیاسیی ئێمە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و وەکو خۆی ماوەتەوە. باسی ڕۆڵی نەگۆڕی دین و پاتریارکیەت دەکرێت و وەک هۆکاری زۆرێک

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩-٣٠.

لە بیمارییە کۆمەڵایەتییەکان وێنا دەکرێن. ئەم کتێبە لە دێڕی یەکەمیەوە تا دواهەمین دێڕی دژ بەم وێناکردنە خورافی و نامێژوویی و جەوهەرگەرا و هەڵەیەی کۆمەڵگای ئێمەیە. ئەو تێزەی ئەم کتێبە بەرگریی لێ دەکات ئەوەیە کە کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕین کۆمەڵگایەکە پڕ لە گۆڕانکاریی فرەشێوە و هەمەجۆر لە زۆربەی هەرەزۆری بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و دینی و ئەخلاقییدا و ئەوەی ئەمڕۆ لەو کۆمەڵگایەدا ڕوو دەدات بە هیچ شێوەیەک درێژکراوەی دونیای بەر لە ڕاپەڕین نییە، چ جای درێژکراوەی مێژوویەکی هەزاران ساڵە. بۆ نموونە، ئەوەی لە کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕیندا ڕوو ئەدات لەناو ژینگەیەکی شاریدا ڕوو ئەدات کە درێژکراوەی ژیانی گوند و بەها و کولتوور و پەیوەندییە خێڵەکییەکانی ناو گوند نییە. نە دین، نە سیاسەت، نە ئابووری، نە ئەخلاق، نە کایەکان هیچیان سەر بە دونیای بەر لە ڕاپەڕین نین و هەموویان لەو دونیایەدا سەرلەنوێ درێژ کراونەتەوە و چوونەتە پەیوەندیی تازەوە و ناوەڕۆکی نوێیان وەر گرتوە، زۆربەشیان بکەری کۆمەڵایەتیی نوێ هەڵی گرتوون کە بەر لە ڕاپەڕین بوونیان نەبووە یان بوونێکی لاواز و پەراوێزیان هەبووە. بەم مانایە ئەم کتێبە کتێبی دەسکاریکردنی دیدە باڵادەست و ناڕاستەکانی ناو دونیای فیکری و تیوری و مەعریفیی ئێمەیە. هەندێک تا ئەو شوێنە دەڕۆن کە هێڵێکی ڕاستەوخۆ لەنێوان کۆمەڵگای ئێستا و مێژووی دوو هەزار ساڵ لەمەوبەردا دەکێشن و پێیان وایە کۆمەڵێک "ڕاستیی نەگۆڕ!" هەیە لە مێژووی کورد و مێژووی ناوچەکەدا کە هەزاران ساڵە بێ هیچ گۆڕانکارییەک ماونەتەوە. هەروەها "کۆمەڵێک ڕاستیی نەگۆڕ"یش لەناو کەسایەتیی مرۆڤی

ئەم دەقەرەدا گریمانە دەکەن کە گوایە لە کۆنی کۆنەوە تا ئەمڕۆ وەک خۆیان ماونەتەوە و بەردەوام دووبارە کراونەتەوە. هەم ڕاستییەکان نەگۆڕاون و هەم کەسایەتییەکانیش. ئەم کتێبە دژ بەم شێوازە لە گشتگیری و لەم جۆرە لە بیرکردنەوەیە، کە لە ڕاستیدا بیرنەکردنەوەیەکی تەواوە، دژایەتییەکی هەمەلایەنە و هەمەجۆریشە. ئەم کتێبە ئەم شێوازە لە هۆشیاری وەک هۆشیارییەکی ساختە و هەڵە دەبینێت و مامەڵە دەکات، کە توانای ئەوەی نییە سادەترین دەرکەوتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ببینێت و کەمترین زانیاریمان لەسەر ئەو دونیا کۆمەڵایەتییە کۆنکریتییە پێ بڵێت، کە لە ماوەی چارەکەسەدەیەکدا دروست بووە. هەموو واقیعێک، بە واقیعی کۆمەڵگای ئێمەوە، واقیعێکی پڕ جووڵە و گۆڕانکارییە، واقیعی جێگیر و نەگۆڕ بوونی نییە، ئەگەر شتێک هەبێت ناوی یاسایەکی مێژوویی بێت، ئەوا ئەو یاسایە یاسای گۆڕانکاریی بەردەوامە. بەڵام گۆڕانکاری مەرج نییە هەمیشە پۆزەتیڤ و تەندروست بێت، چەمکی گۆڕان چەمکێکی پێوانەیی نییە، هەندێک گۆڕانکاریی هەیە تەواو نێگەتیڤ و ناتەندروستە و کێشە و گرفتی گەورە بۆ تاکەکەس و کۆمەڵگا دروست دەکات. دونیای ئێمە بێبەش نییە لە گۆڕانکاری بە هەردوو ماناکەی، هەم بە مانا پۆزەتیڤەکەی و هەم مانا نێگەتیڤەکەی. ئەم کتێبە نیشانی ئەدات کە دونیای دوای ڕاپەڕین لە چەندان ئاستدا گۆڕانی گەورە و هەمەلایەنی بەسەردا هاتووە و دیاردەی تازەی تیادا دروست بووە، هەروەها گۆڕانکارییش بەسەر مانای ئەو شتانەدا هاتوون کە پێشتر لە دونیای ئێمەدا لە فۆرمی تر و بە دەلالەتی ترەوە، لەئارادا بوون. گۆڕانی ماناکانی دین و دینداری، گۆڕانی ماناکانی سیاسەت، قوتابخانە، بڕوانامە، ژیانی پێکەوەیی، ترس، ئەخلاق،

ژنبوون و پیاوبوون، هتد... بەشێكن لەو جوگرافیا بەرفراوانەی گۆڕانكاری لە دونیای ئێمەدا، كە ئەم كتێبە هەوڵ ئەدات لێیان تێبگات و شییان بكاتەوە.

تیۆدۆر ئەدۆرنۆ لە شوێنێكدا دەپرسێت ئایا پێویستە زانستی كۆمەڵناسی چۆن بێت؟ لە وەڵامدا دەڵێت، "سەیركردن و بەئاگابوون لە كۆمەڵگا، بەئاگابوون لەو شتانەی كە لە كۆمەڵگادا جەوهەرین، بەئاگابوون و شارەزابوون لەو دونیایەی كە لەئارادایە... ئاگاداربوونێكی ڕەخنەگرانە".[1] ئەم وتارانە لەم دیدە ڕەخنەییەوە نووسراون كە ئەدۆرنۆ باسی دەكات، دیدێكی ڕەخنەیی نیشانی ئەدات چۆن هێزە تازەكانی دونیای دوای ڕاپەڕین شوێن و جێ و پێگەی خۆیان لەناو ڕیزبەندییە كۆمەڵایەتی و پەیوەندییە چینایەتییەكانی ئەو دونیایەدا جێ كردۆتەوە و بە هۆی پەیوەندییەكانی هێز و بەكارهێنانی دەسەڵاتەوە دونیای خۆیان ڕێك خستوە. لە سەرێكە "ڕووبەرێكی گشتی"ی نوخبەوی و داخراو و "سیستمێكی گیتۆی"ی پەروەردە و فێربوونیان دروست كردوە، وەك بەشێك لە پرۆسەی بەچینبوون و باڵادەستبوونی كۆمەڵایەتییان، بەڵام لە سەرێكی دیكەوە جۆرێك لە دینداریی سەلەفی و جۆرێك لە ڕۆحانیەتی بەتاڵ و ناسیاسی بڵاو دەكەنەوە، كە هەم دین هەم ڕۆحانیەت لە هەموو ڕەهەندێكی گۆڕانخوازیی بەتاڵ دەكاتەوە، هاوكات ترسیشیان لە پێدراوێكی سایكۆلۆژییەوە گۆڕیوە بۆ ئامرازێكی سیاسیی سەرەكیی حوكمڕانیكردن. لە

---

١ _تیودور أدرنو (٢٠١٢). محاضرات في علم الاجتماع. ترجمة، تحقیق: جورج كتورة. بیروت، مركز الانماء القومي. ل١٧.

سەرێکی دیکەوە ئەم کتێبە نیشانی ئەدات چۆن هێزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و گروپە نارازییەکانی کۆمەڵگای ئێمە، لە دونیای دیجیتالی نوێدا ئامادەن و چۆن شتگەلێک دەڵێن و دەنووسن سەبارەت بە دونیای کۆمەڵایەتیی خۆیان، جیاواز لەوەی هێزە دەسەڵاتدارەکان دەینووسن.

یەکێک لە بابەت گرنگەکانی ئەم کتێبە تێرامانە لەو شتەی ناوی "ژیانی هاوبەش"ە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا. ئایا چ شێوازێک لە "ژیانی هاوبەش" لەم کۆمەڵگایەدا دروست بووە و لە دروستبووندایە؟ ئایا شتێک هەیە هاوبەشبێت لەنێوان هێزە جیاوازەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەدا، یاخود ئەوەی هەیە ئامادەگیی کۆمەڵێک گێتۆی کۆمەڵایەتیی داخراوە، کە لەناو زیاد لە ڕووبەرێکدا و لەناو زیاد لە دەزگا و سیستمێکی ئەو کۆمەڵگایەدا ئامادەیە؟ ئایا ژیانێکی هاوبەشی عەقڵانی هەیە یان ماڵبەشکردنێکی نایەکسان و نادادپەروەرانەی تەواوی هەموو ڕووبەرەکان لەئارادایە؟ ئایا شتێک بە ناوی پەیوەندیی وەزیفی لەنێوان ئەم گێتۆیانەی دروست بوون و سەرجەمی ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکانی تردا بوونی هەیە؟ یاخود ئەمانە دونیای دابڕاون لەیەکتری کە پاسەوان و دیوار و پارە لە یەکتریان جیا دەکاتەوە؟

بێگومان ئەو دۆخە پڕ دابەشبوون و پارچەپارچەبوونە کە ئەم کتێبە شیی دەکاتەوە و ڕاڤەی دەکات ڕەچەتەیەک نییە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی هێمن، کە هیچ گروپێک هەقی بەسەر گروپەکانی ترەوە نەبێت و کەس دەست نەخاتە ناو ژیانی ئەوی تریانەوە، بەڵکو ڕێک پێچەوانەکەی ئامادەیە، ئەم دۆخە ڕەچەتەیەکە بۆ ململانێی کۆمەڵایەتیی

توند و ئەگەری تەقینەوە و لەدەستدانی ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی. ئەوەی کە گیتۆکان بە پاسەوان، یان بە دیوار و تەلبەند، یان بە پارە و سەرمایە پارێزراون، دەرکەوتە هەرە سەرەتاییەکانی دروستبوونی دونیایەکی کۆمەڵایەتییە، کە ڕەنگە پێکدادان و بەریەککەوتنی توند و خەست تاقە ئایندەیەک بێت کە ڕووی تێ دەکات.[1] لەم ئاستەدا ئەم کتێبە لێدانی شووتەی مەترسییەکە بۆ کۆمەڵێک کارەسات کە لە پێشمانەوەیە و کۆمەڵگای ئێمە ڕۆژانە بە خێراییەکی گەورە بەرەو ڕوویان دەچێت.

### هاوکێشەیەکی پێچەوانە

وەک پێشتریش هێمامان بۆ کرد، ئەو کۆمەڵگایەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست کراوە کۆمەڵگایەکە لە زۆر ڕووەوە تەواو تازەیە و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەو کۆمەڵگایەوە نییە و نەماوە کە لە سەدەی نۆزدەهەم و بەشێکی درێژی سەدەی بیستەمدا ئامادە بووە. لە کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕیندا چەندان دابڕان و پچڕان و جیابوونەوە هەیە کە پێویستیان بە خوێندنەوە و تێگەیشتن و ڕاڤەکردن هەیە. مامەڵەکردنی ئەم کۆمەڵگایە بە لۆژیکی مامەڵەکردنی کۆمەڵگا لە سەدەی

---

١ _ئەدۆرنۆ لە کتێبی "محاضرات فی العلم الاجتماع"دا باس لە دۆخی نەبوونی پەیوەندی دەکات لەنێوان گروپەکاندا وەک ڕەچەتەیەک بۆ ئاشتیی کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەدۆرنۆ ئەم نەبوونی پەیوەندییە لە کۆمەڵگا هەرە سەرەتاییەکاندا باس دەکات، ئەو کۆمەڵگایانەی کە بە "کۆمەڵگای میوەکۆکردنەوە" ناو دەبرێن و کەسەکان لە ڕێگای کۆکردنەوەی بەروبومی درەختەکانەوە دەژیان. لەو کۆمەڵگایانەدا وەک ئەدۆرنۆ دەڵێت قازانج و مەسەلەحەتی گروپەکان زۆر دژبەیەک نەبووە ل ٢٩-٣٠.

نۆزدەهــەم و بیســتەمدا، یاخــود مامەڵەکردنــی وەک یەکەیەکــی کۆمەڵایەتیــی جێگیــر و نەگــۆڕ، هەڵەیەکــی فیکــری و سیاســی و کۆمەڵایەتیــی گەورەیــە. بــۆ نموونــە بــا ســەیرێکی خێــرای ئــەو پەیوەندییــە بکەیــن کــە لەنێــوان سیاســەت و کۆمەڵگادا لــە دونیــای دوای ڕاپەڕینــدا دروســت بــووە، پەیوەندییــەک لــە زۆر ڕووەوە شوناســی ســەرەکیی ئــەو کۆمەڵگایــە و بەشــێکی گرنگــی میکانیزمەکانــی کارکردنــی دەستنیشــان دەکات.

لــە بەشــێکی بەرچــاوی ئەدەبیاتــی زانســتە کۆمەڵایەتــی و سیاســییەکاندا پێداگریــی هەیــە لەســەر ئــەوەی کــە بەبــێ تازەبوونــەوەی کۆمەڵایەتــی، تازەبوونــەوەی سیاســی و ئابووری زەحمەتــە، یــان لانــی کــەم، تازەبوونــەوەی کۆمەڵایەتــی دەکەوێتــە پێش تازەبــووەوەی سیاسییەوە و ئــەو تازەبوونــەوە کۆمەڵایەتییــە بنەمــا و کۆڵەکــەی تازەبوونــەوەی سیاســی و ئابوورییــە. بــۆ ئــەوەی سیاســەت و ئابوورییەکــی بــاش و تەندروســت هەبــن، دەبێــت پێشــوەخت کۆمەڵگایەکــی تەندروســت بوونــی هەبێــت. بــۆ ئــەوەی سیاســەت و ئابوورییــش بــە بــاری باشــدا بگۆڕێــن، پێویســتە ســەرەتا کۆمەڵــگا گۆڕابێــت. بەکورتــی، ئــەم تێــزە پــێ لەســەر ئــەوە دادەگرێــت کــە بەبــێ تازەکردنــەوەی پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییــەکان ناکرێــت پەیوەندییــە سیاســی و ئابوورییــەکان تــازە ببنــەوە. لــەم لۆژیکــەدا هیــچ دەوڵــەت و هێزێکــی سیاســی ناتوانێــت بیــر لــە تازەبوونــەوەی سیاســی و ئابــووری بکاتــەوە، لــە ســایەی باڵادەســتبوونی پەیوەندیــی کۆمەڵایەتیــی دواکەوتــوودا. دەوڵــەت ناتوانێــت مۆدێــرن بێــت لەپــاڵ ئــەو پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییانــەدا کــە پــێ لەســەر پەیوەندیــی خزمایەتــی و پەیوەدنیــی خوێــن و پەیوەندیــی

خێڵەکی و پەیوەندیی دینی و شێوازەکانی تری پەیوەندی نامۆدێرن و تەقلیدی، دادەگرن. بە بۆچوونی من ئەم ڕوانینە سۆسیۆلۆژییە گشتییە کە بێگومان هەڵگری برێک لە ڕاستییە، بەڵام هاوکات ڕوانینێکە بەرەهایی ڕاست نییە، بەتایبەتی بۆ دونیای ئێمە لە قۆناغی دوای ڕاپەڕیندا. ئەم ڕوانینە.لە کاتێکدا ڕاستە کە هێزە سیاسییەکان و حوکمڕانانی وڵات و بەڕێوەبەرانی دەوڵەت، ئەوانەی کە دەسەڵاتە مادی و دەزگایی و یاساییەکانیان لەبەردەستدایە، خۆیان هێزی مۆدێرن بن و لە خەمی تازەکردنەوەی کۆمەڵگادا بن، نەک ئامرازی سەرەکیی بەرهەمێنانەوە و بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییە سونەتی و تەقلیدییانە بن کە لە کۆمەڵگادا هەن و ئامادەن. ئەم ڕوانینە لەو دۆخانەدا ڕاستە کە نوخبەیەکی سیاسیی مۆدێرن بە دیدگا و خەونی مۆدێرنەوە لە خەمی تازەکردنەوەی بونیاد و پەیوەندی و پێگە و عەقڵیەتە تەقلدییەکاندا بێت. واتە نوخبەیەک بێت، وەک گرامشی دەڵێت، سەرقاڵی پیادەکردنی شۆڕشێکی پاسیڤ بێت،[1] لە سەرەوەڕا و لەناو ئۆرگانەکانی دەوڵەت و حوکمڕانییەوە گۆڕانکاریی هەمەجۆر بۆ ناو خانە کۆمەڵایەتییەکان دابەزێنێت و خەریکی دروستکردن و بەرهەمهێنانی هێزی کۆمەڵایەتیی نوێ و دەزگای نوێ و پراکتیک و بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتیی نوێ بێت. ئەگەر ئەو نوخبەیە لەو پرۆسەی تازەکردنەوەیەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، ئەوان کۆمەڵگا و پەیوەندییە

١ سەبارەت بە شۆڕشی پاسیڤ لای گرامشی بڕوانە:
Thomas, Peter (20026). “Modernity as “passive revolution”: Gramsci and the Fundamental Concepts of Historical Materialism"

سونەتی و تەقلیدییەکان خودی نوخبە حوکمڕانەکەش بە تەقلیدی و سونتەی دەکەن.

ئەم دیدە بۆ ڕوانین و ڕاڤەکردنی کۆمەڵگای ئێمە لە قۆناغی دوای ڕاپەڕیندا ڕاست نییە. لە ڕاستیدا پێچەوانەی ئەم دیدە ڕاستە و هاوکێشە لە کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕیندا بەم شێوەیە: بەبێ تازەکردنەوە و گۆڕانی پەیوەندییە سیاسییەکان گۆڕانی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان هێجگار زەحمەتە، ئەگەر مەحاڵ نەبێت. لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا ئەو نوخبە باڵادەستەی کە حوکمڕانە و دەزگاکان و یاساکان و ئابووری نەوتی لەبەردەستدایە، بە جۆرێک تەقلیدیی و داخراو و تەماحکار و نابەرپرسیار و مافیاوییە، دۆخێکی دروست کردوە کە بەبێ گۆڕانی پەیوەندییە سیاسییەکان و بەبێ ڕێکخستنەوەی کایەی سیاسی هیچ تازەبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتیی دیکە ڕوو نادات، یاخود زۆر زەحمەت بێت ڕوو بدات. بەم مانایە هاوکێشەی تازەبوونەوە لە دونیای ئێمەدا هاوکێشەیەکی پێچەوانەیە. بە حکومی ئەوەی سیاسەت و هێزە سیاسییە حوکمڕانەکان زۆربەی دەرکەوت و میکانیزمەکانی گۆڕانکارییان لە دونیای ئێمەدا شێواندووە و لە ناوەوەڕا لۆژیکی کایە کۆمەڵایەتی و ئابووری و هونەری و فەرهەنگی و ڕۆشنبیرییەکانیان دەسکاری کردوە، نوخبە جیاوازەکانی کۆمەڵگای ئێمەیان لە نوخبەبوون خستوە، بۆیە بەبێ دەسکاریکردنی پەیوەندییە سیاسییەکان دەسکاریکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زەحمەتە، بەبێ گۆڕانی سیاسەت وەک دەزگا و پراکتیک و عەقڵیەت، واتە بەبێ دەسکاریکردنی لۆژیکە تەقلیدی و داخراو و مافیاکەی سیاسەت لە کوردستاندا،

دەسکاریکردنی کایەکانی دیکە زۆر زەحمەتە، گەر مەحاڵیش نەبێت.

ئەم کتێبە نیشانی ئەدات چۆن نوخبەی حوکمڕان و ئەو گروپە کۆمەڵایەتییانەی بەدەوری خۆیدا دروستی کردوە، خەریکی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی دونیای ئێمەن بەو شێوەیە کە لەگەڵ خواست و ویست و قازانجی چینایەتی و نوخبەوی خۆیاندا بگونجێت و لەناو دونیایەکی تا ڕادەیەک نیولیبرالدا پێگە سیاسی و ئابوورییەکانیان بپارێزێت. لە ئاستە کۆمەڵایەتییەکەیدا ئەمە مانای سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ڕەهەندە تەقلدی و داخراو و نامۆدێرنەکانی دونیای ئێمە لەناو ژینگەیەکی تەواو جیاواز لە ژینگە تەقلیدییە ڕەسەنەکەی خۆیاندا. ئەم کتێبە دەیەوێت نیشانی بدات کە هیچ دیاردە و پەیوەندی و خواستێکی تەقلیدی و ترادیسیۆنی نامۆدێرن لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەتەنها "نامۆدێرن" نییە، هەڵگری مانا و دەلالەت و پێگە تەقلدی و نامۆدێرنەکانی قۆناغە کۆنەکان نییە، بەڵکو هەموویان بەشێکن لە دونیایەکی تەواو تازە کە ئەرکی نوێ و مانای نوێ و خواستی نوێ بەو ڕەهەندە تەقلدییانە دەبەخشێت. بە مانایەک لە ماناکان هیچ شتێکی تەقلیدی و نامۆدێرن بە مانا ترادیسیۆنییەکەی لە دونیای ئێمەدا بوونی نەماوە، ئەوەی هەیە و دروستکراوە "سەرلەنوێ بەنامۆدێرنکردن" و "بەتەقلیدیکردنەوە"ی ئەو دونیایەیە. "نامۆدێرن" و "تەقلیدی" و "ترادیسیۆنی" بوونیان نەماوە، ئەوەی هەیە کۆمەڵێک ڕەگەزی جیاواز و نوێی ناو کۆمەڵێک پەیوەندی و بونیاد و خواست و پراکتیکی تازەی حوکمڕانییە.

وەک لە زۆر لاپەڕەی ئەم کتێبەدا بەوردی باسی دەکەین، نوخبە حوکمڕانەکەی کوردستان خەریکی دروستکردنی ڕووبەرێکی گشتیی داخراو و نوخبەوییە بۆ ئەندامەکانی خۆی، خەریکی تێکدانی سیستمی پەروەردە و خوێندنە بە شێوەیەک بالادەستیی سیاسی و کۆمەلایەتیی ئەوان سەرلەنوێ بەرهەم بهێنێتەوە، تەواو دەستی بەسەر میکانیزمەکانی بەرهەمهێنان و پاراستن و وێرانکردنی نوخبەکانی تری ناو کۆمەڵگای ئێمەدا گرتوە، لەناو کایەی ڕۆشنبیریدا لەشکرێک ڕۆشنبیری بەیعە و لەشکرێک ڕۆشنبیری بێدەنگی دروست کردوە، بڕەو بە جۆرێک لە سەلەفیەتی دینیی ئەدات جیاواز لە دینی میللی و پەیوەندییە خێڵەکییەکانی گۆڕیوە بۆ پەیوەندیی ئەمنی و سەربازی، هتد... هەموو ئەمانەش بە مەبەستی پاراستنی دەسەلاتی ئەو نوخبە سوڵتانییەی لە ولاتەکەدا حوکمڕانە.

**سۆسیۆلۆژیای تیوری**

خاڵێکی تر کە پێویستە لەم سەرەتایەوە بۆ خوێنەران ئاشکرا بێت ئەوەیە، کە جگە لە باسی یەکەمی ناو ئەم کتێبە، کە درێژترین باسی کتێبەکەیە، هەموو باسەکانی تری کتێبەکە کەمتر پشتیان بە ژمارە و ئامار و ڕاپرسی و تەکنیکەکانی تری لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژیی بەستوە، زیاتر وەک کۆمەڵێک مەشق و ڕاهێنانن لەسەر ئەو شێوازانەی تری سۆسیۆلۆژیا کە بە "سۆسیۆلۆژیای تیوری" یان باشترە بڵێم، "سۆسیۆلۆژیای تێرامان" یان "تەئەمولی" ناو دەبرێن.[1] جگە

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە "سۆسیۆلۆژیای تیوری" بڕوانە:

لە وتاری یەکەم، وتارەکانی دیکە، پشتیان بە داتا و ئامار و ژمارە نەبەستووە، دەرەنجامی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی زۆر و بەرفراوان نین، بەڵکو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەو سەرنج و ڕوانین و تێبینییە زۆرانەوە هەیە کە لە تێڕامانی خۆمەوە لەو دیاردانەوە دروست بووە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو نووسینانە بە هیچ جۆرێک پشتیان بە گفتوگۆ و چاوپێکەوتن و سەردانی ئەو دەزگایانە نەبەستووە کە باس دەکرێن، زۆر جار گفتوگۆ و چاوپێکەوتنی کورت و سنووردار و هەندێک جاری تر خوێندنەوەی چەندان نووسین و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دیاردانە و لە هەندێک کاتی تردا بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی خۆم بەو دیاردانە خۆیانەوە، سەرچاوەی شیکردنەوە و خوێندنەوەکانن. بۆ نموونە کە باس لە تێکچوونی سیستمی خوێندن و نەمانی بەهای یەکسانی لەناو ئەو سیستمە لە کوردستاندا دەکەم، سەرنجەکانم دەرەنجامی تێڕامانە لە خوێندنی هەندێک لە منداڵانی هاوڕێ و دۆست و ناسراوە نزیکەکانم و دەرەنجامی سەردانە بۆ هەندێک لەو قوتابخانە تایبەتانەی لە دەرەوەی سیستمی گشتی خوێندندا دروست کراون، هاوکات دەرەنجامی قسەکردنە لەگەڵ کەسانێکدا کە هەندێکیان منداڵەکانیان لەو قوتابخانە تایبەتانەدا دەخوێنن و هەندێکی تریان بۆ ماوەیەک کاریان لەو جۆرە قوتابخانە تایبەتانەدا کردوە. یان کە باس لە سۆسیۆلۆژیای کۆڕگرتن و دروستبوونی جمهوورێکی

---

Turner, Jonatahn (2014). Theoritical Sociology. **A Concise Introduction to Twelve Sociological Theories.** SAGE Publication..

نائایدیۆلۆژیی تازە لە کوردستاندا دەکەم، ئەوەی دەیلێم پەیوەستە بە ئەزموونی خۆمەوە، وەک کەسێک کە لە هەموو گەڕانەوەیەکمدا بۆ کوردستان و لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکانی دەرەوەی کوردستانیشدا، لەگەڵ ژمارەیەک لە گوێگرانی ناو کۆڕەکاندا ڕا و بۆچوونم، هەم لە کاتی کۆڕەکاندا و هەم لەدەرەوەی کۆڕەکاندا گۆڕیوەتەوە. ئەوەی لەسەر لەدایکبوونی ئەو جمهوورە تازەیە دەیلێم، بەرهەمی ئەو بەشداربوونە ڕاستەوخۆیەی خۆم و مامەڵەکردنمە لەگەڵ ئەو جمهوورەدا. بە مانایەکی دیکە هیچ یەکێک لە وتارەکانی ناو کتێبەکە بێبەش نییە لەو ڕەهەندە پراکتیکی و تەتبیقییەی کە هەموو شیکردنەوەیەکی سۆسیۆلۆژیی، چەند تیوری و تەئویلییش بێت، پێویستیی پێیەتی.

لە کۆتایدا ئەوەی من لەم کتێبەدا ئەنجامی ئەدەم سەر بەو شێوازانە لە سۆسیۆلۆژیا نییە کە خۆیان بە سۆسیۆلۆژیایەکی بێلایەن دەزانن. هەر لە بنەڕەتیشەوە باوەڕم بە بێلایەنیی هیچ زانستێک لە زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکان نییە لە کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا، یان لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگاکانی جیهانی سێدا. مەعریفەی زانستی لەم بەشەی جیهاندا بۆ ئەوەی بتوانێت ڕۆڵی هەبێت لە باشترکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، کە لە زیاد لە ڕەهەندێکدا وێران و بیمارە، ناتوانێت مەعریفەیەکی بێلایەن بێت. لەم بەشەی دونیادا بوونی زانستی بێلایەن وەهم و خورافەیەکی گەورەیە، بێلایەنی خۆشی لە هەر بوارێکی ژیانی سیاسی و فیکری و ڕۆشنبیریدا خورافەتێکی گەورەترە. بۆیە ئەو دید و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنانەی لێرەدا بەرهەم دەهێنرێن زانیارییەک

نین بیانەوێت لەناو خۆیاندا بژین، بەڵکو شتگەلێکن دەیانەوێت ببن بە بەشێک لە کردە و ستراتیژیەتی دەسکاریکرنی ئەو دونیایە. لە ڕاستیدا ئەم کتێبە دەخوازێت هەڵگری ئەو شێوازە لە مەعریفە بێت کە فۆکۆ ناوی "مەعریفەی ستراتیژی"ی لێ دەنێت، مەعریفەیەکی کۆنکریت سەبارەت بە دیاردەیەکی کۆنکریت، کە ستراتیژەکەی ئەوە بێت ڕاستەوخۆ بەشدار بێت لە کردەی دروستکردنی دونیادا.[1]

**مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە**

ئیشی ئەم کتێبە ئەوەیە بمانباتە ناو شیکارکردنەوەی ئەو دونیا کۆمەلایەتییەوە کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا دروست بووە، بمانبەستێتەوە بەو ئێستایەوە کە ئامادەیە و دیاردەکان لەناویدا هەم ڕوو دەدەن و هەم چوارچێوە و بونیادە سەرەکییەکانی دەستنیشان دەکەن. ئەم دونیایە دونیایەکە ڕۆژانە لەبەردەمماندا دروست دەکرێت و مرۆڤەکان بە شێوازی جیاواز و لە پێگەی جیاوازەوە هەم بەشدارن لەم دروستکردنەدا و هەم بەشێکن لە کردەی قبووڵکردن و ڕەخنەکردنیشیدا.

وتارەکانی ناو ئەم کتێبە لە کاتێکدا تەعبیرن لە پەیوەندیی هۆشیاری بە واقیعەوە، هاوکات هەستێکی تایبەتیش بە واقیعەوە گرێی داون، هەستێک پڕیەتی لە دڵەڕاوکێ و گومان

[1] سەبارەت بە مەعریفەی ستراتیژی لای فوکۆ بڕوانە:
Carrette, R. Jeremy (2001). Foucault, strategic knowledge and the study of religion: A response to McCutcheon, Fitzgerald, King, and Alles. Culture and religion, An Interdisplinary Journal, Vol 2, 2001, Issue 1.

و توورەبوون و غەمباری بەرامبەر بەوەی دروست دەکریت و دروست دەبێت. دەشێت ئەم هەستە بە هەستێکی بریندار ناو ببەین، کە لەوە بەئاگایە شتێک لەبەرچاوماندا دروست دەبێت نارێک و ترسناکە و گەر بەری پێ نەگیرێت سبەینێیەک دروست دەکات پڕ لە کێشە و قەیران و ململانێی گەورە و بەرفراوان، کە ڕەنگە زۆریان بە کارەساتی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی گەورە کۆتاییان بێت.

دونیای کۆمەڵایەتیی ئێمە، وەک هەر دونیایەکی کۆمەڵایەتیی دیکە، دونیایەکی دروستکراوە، دونیایەکە دروست دەکرێت، دروستکردنی ئەم دونیایەش پابەستە بە کشتێتیی ئەو بڕیارە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەوە کە دەدرێن و پەیوەستە بەو بکەرانەشەوە کە لەناو کردەی دروستکردنی ئەو دونیایەدا پێگەی تایبەت و جیاواز و ڕۆڵی جیاواز و تێگەیشتنی جیاوازیان بۆ ئەو دونیایە هەیە. ئەگەر شتێکیش هەبێت ناوی قەدەر و بونیاد و سیستم بێت، ئەوا هەموویان دروستکراوی کۆمەڵایەتین، بەرهەمی بڕیار و کردە و ستراتیژیی مێژوویی تایبەتن و بە بڕیار و کردە و ستراتیژیی مێژوویی دیکە دەتوانرێت بگۆڕدرێن و شوێنیان بە دونیایەکی دیکە بگیرێتەوە.

ئەم کتێبە دەخوازێت ئەو دونیایەی دروست کراوە بگۆڕێت و دەسکاریی بکات، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش پێویستی بە خوێنەرانێک هەیە بیانەوێت دەسکاریی خۆیان و دونیاکە بکەن.

ئەمستردام

هاوینی ٢٠١٨

## سەرچاوەکان

Alexander, Jeffrey C. (1978). Formal and Substantive Voluntarism in the Work of Talcott Parsons: A Theoretical and Ideological Reinterpretation. American Sociological Review, Vol. 43, No. 2 (Apr., 1978), pp. 177-198

Carrette, R. Jeremy (2001). Foucault, strategic knowledge and the study of religion: A response to McCutcheon, Fitzgerald, King, and Alles. Culture and religion, An Interdisplinary Journal, Vol 2, 2001, Issue 1

Loseke, Donileen R. (2010 ). Thinking about Social Problems: An Introduction to Constructionist Perspectives. New Jersey, Transaction Publishers. P 188-189.

Lizardo, O. 2004, "The cognitive origins of

Bourdieu's Habitus", Journal for the Theory of Social Behaviour, vol. 34, no. 4, pp. 375-448.

Turner, Jonatahn (2014). Theoritical Sociology. A Concise Introduction to Twelve Sociological Theories. SAGE Publication.

Weber, Max. (1997). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism. London: Routledge.

بيار بورديو (١٤٢٥). اسباب عمليه. اعادة النظر بالفلسفه. تعريب: د. انور مغيث. سرت. الدار الجماهيريه للنشر و التوزيع الاعلان.

ديفيد هارفي (٢٠١٧). مدن متمردة: من الحق في المدينة الى ثورة الحضر. ترجمة لبنى سبرى. بيروت، الشبكه العربية للابحاث و النشر.

تيودور أدرنو (٢٠١٣). محاضرات في علم الاجتماع. ترجمة، تحقيق: جورج كتورة. بيروت، مركز الانماء القومي.

# شڵەژانی پێوانەیی

## پێشەکی

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە هەوڵدانێکـی زانسـتییە بـۆ تێگەیشـتن لـە دیـاردەی خۆکوشـتنی ژنـان لـە کوردسـتاندا لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا.[1] ئامانجـە سـەرەکییەکەی شـیکردنەوە و تێگەیشـتنە لـەو ژینگـە کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگـی و سیاسـییە تایبەتـەی لـە دونیـای دوای ڕاپەڕیندا دروسـت دەبێت و دەبێتـە ژینگـەی سـێ شـێوازی سـەرەکیی توندوتیژیـی ڕەگـەزی دژ بـە ئافرەتـان لـە کوردسـتاندا. ئـەو سـێ شـێوازەش بریتیـن لـە: ١-کوشـتن بـە نـاوی شـەرەفەوە. ٢-خۆکوشـتن. ٣-سـووتان و خۆسـووتاندنی ئافرەتـان. بێگومـان ئـەم سـێ شـێوازە تایبەتـەی توندوتیژیـی هەمـوو شـێوازەکانی توندوتیژیـی ڕەگـەزی دژ بـە ئافرەتـان لـە کوردسـتاندا ناگرێتـە خـۆی، لەوانـە بـۆ نموونە لێدانی جەستەیی،

---

١ _ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکەم جار لە نیسـانی سـاڵی ٢٠١٥ بە زمانی ئینگلیزیی بڵاو کرایـەوە، لەمیانـەی "بەرنامـەی زانیاریـی دەربـارەی کۆمەڵگای مەدەنی لە خۆرئـاوای ئاسـیادا". دەزگای گەشـەکردنی مرۆیـی هاوبـەش لەگـەڵ وڵاتـە تازەپێشکەوتوەکاندا

Humanist Institute for Co-operation with Developing countries. P.O. Box 85565 | 2508 CG The Hague | The Netherlands. www.hivos.net

بەدکاریی سایکۆلۆژی و سێکسی، ئیتر لە گێچەڵی سێکسییەوە بیگرە بۆ لاقەکردن، توندوتیژیی عاتیفی و ئابووری، فشاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، هتد... لەبەر سنوورداربوونی کات و شوێن ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنها لەسەر ئەو سێ شێوازە لە توندوتیژیی دەوەستێت کە باسمان کرد.

بێگومان لێکجیاکردنەوەی ئەو سێ شێوازە لە توندوتیژیی جێندەری دژ بە ژنان لە کوردستاندا لەیەکتری کارێکی زەحمەتە، چونکە لە زۆر دۆخدا هەر سێ شێوازەکە پەیوەندیی بەهێزیان بەیەکترەوە هەیە و زەحمەتە لەوە دڵنیا بین ئایا ئەوەی خۆی کوشتوە بەڕاستی خۆی کوشتوە یاخود کوژراوە، یان ئەوەی سووتاوە لە واقیعدا سووتێنراوە یاخود خۆی خۆی سووتاندوە. دەڵێم سەرەڕای ئەم زەحمەتییە گەورانە لە جیاکردنەوە و پۆلینکردنی شێوازەکانی توندوتیژیی جێندەری لە کوردستاندا، مەسەلەی جیاکردنەوە و پۆلینکردنی شێوازەکانی توندوتیژی لەیەکتری مەسەلەیەکی گرنگە، نەک تەنها لە ڕووی تێگەیشتنی ئەکادیمی و دۆزینەوەی هۆکارەکانی پشتی هەریەکێکیانەوە، بەڵکو لە ڕووی مەسەلەی بیرکردنەوەشەوە لە دۆزینەوەی ستراتیژیەتی تایبەت و گونجاو بۆ بەرنگاربوونەوەی هەریەکێکیان.

ئەرکێکی سەرەکیی کە ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەنجامی ئەدات، جێگیرکردنی هەرسێ شێوازەکەی توندوتیژیی ڕەگەزییە لەناو ئەو فەزا و سەرزەمینە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییە نوێیەدا، کە لە سەرەتای سالانی نەوەدی سەدەی بیستەمەوە لە کۆمەڵگای کوردستانی لە هەرێمدا دروست بووە. واتە هەرسێ شێوازەکەی توندوتیژیی لەناو دونیا و کۆمەڵگای دوای

ڕاپەڕیندا جێگیر دەکات. بەمەش یەکێک خاڵە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە گومانکردنە لەو لێکدانەوە سونەتییانە کە توندوتیژیی ڕەگەزی دژ ب ەژنان لە کوردستاندا بە "سروشت"ی نەگۆڕی پیاوی کورد، یان بە "سروشت"ی پاتریارکیەت، یان بە دین، یان بە فەرهەنگی خێڵەکی و تەقلیدی، یان بە "عەقڵیەت" و "مێنتالیتی"ی خۆرهەلاتی، یان "سیستم"ی ئەخلاقیی نەگۆڕاوی ناو کۆمەڵگای کوردییەوە دەبەستنەوە. یەکێک لە ئەرکەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ئیتر ئەم شێوازە لە لێکدانەوەی حازربەدەست و سادەگۆ، لێکدانەوەی پڕ لە گشتگیری و وێنەی پێوانەیی، تێبپەڕێنرێت و لەباتیی ئەوە بەوردی سەیری وردەکارییە زۆر و گرنگەکانی ئەو دونیا پڕ گۆڕانکارییە بکرێت کە لە دوای ڕاپەڕینەوە لە هەرێمدا دروست بووە.

### کێشەی شڵەژانی پێوانەیی Normative Disorientation

بە پێچەوانەی لێکدانەوە تەقلیدییەکانەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەرسێ شێوازەکەی توندوتیژی لە هەرێمدا لەناو ئەو دۆخەدا تازەیەدا جێگیر دەکات، کە ناوی دۆخی "شڵەژانی پێوانەیی" لێ دەنێت، بە عەرەبی "الارتباك المعیاری" و بە ئینگلیزی Normative Disorientation. ئەم شڵەژانە یەکێکە لە ئاکارە هەرە سەرەکییەکانی ئەو کۆمەڵگایەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست کراوە. "شڵەژانی پێوانەیی" مانای تێکچوونی تەواوی سیستمی بەهاکان، شڵەژانی سەرجەمی ئەو بەها سەرەکییانەی کە ژیانی تاکەکەس و

گروپـەکان لـە بـوارە جیاوازەکانـی ژیانـی کۆمەڵایەتیـدا ڕێـک دەخـەن، بـە جۆرێـک بەشـێکی بەرچـاوی تاکەکانـی ئـەو کۆمەڵگایـە، بەتایبەتـی نـەوە نوێیـەکان، تووشـی سەرلێشـێوان ببـن و نەتوانـن بـاش لـە خـراپ و ئەشـێ لـە ناشـێ و ڕاسـت لـە هەڵـە و درۆ لـە ڕاسـتی و جـوان لـە ناشـیرینی و دڵسـۆزی لـە خیانـەت و گەندەڵـی لـە دەسـتپاکی جیـا بکەنـەوە. شـڵەژانی پێوانەیـی مانـای سـەرلێتێکچوونی تاکەکـەس و گروپەکانـە، لـەوەدا کـە نەتوانـن بزانـن چـی باشـە بکرێـت و چـی خراپـە نەکرێت، چـی شـیاو و پۆزەتیڤـە و چیـش نەشـیاو و نەکردەیـە. "شـڵەژانی پێوانەیـی" پەیوەنـدی بـە سـەرلەنوێ بەرهەمهێنانـەوە و نەگـۆڕان و خۆدووبارەکردنـەوەی سیسـتمە ئەخلاقییەکانـەوە نییـە، چونکـە گـەر ئـەو سیسـتمانە بیانتوانیایـە خۆیـان دووبـارە بکەنـەوە و وەک نەگـۆڕ و چەسـپاوێک کار بکـەن، ئـەوەدەم شـتێک بـە نـاوی شـڵەژانی پێوانەییـەوە دروسـت نەدەبـوو. بـە پێچەوانـەوە، شـڵەژانی پێوانەیـی هێمایـە بـۆ گۆڕانـی خێـرا و فرەلایەنیی ڕیشـەیی لە بونیادە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا، لە سیسـتمی سیاسـی و سیسـتمی بەهاکاندا، لە سیسـتمی ئەخـلاق و هەڵسـوکەوتی کۆمەڵایەتیـدا، لـە پەیوەندییـەکان و مـەرج و پێشـینەی ئاڵۆگـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا، لـە فۆرمەکانـی ژنبـوون و پیاوبوونـدا، لـە ڕۆڵ و وێنـە کـۆن و سـونەتییەکانی ژنـان و پیاواندا، لـە ماناکانـی هـەژاری و دەوڵەمەنـدی و تاکەکەسـبوون و نەبووندا. ئـەم شـڵەژانە لەنـاو سـەرجەمی بوارەکاندایـە، لەنـاو بـواری سیاسـەت و ئابـووری و فەرهەنـگ و دیـن و خێـزان و پەیوەندییەکاندایـە. بـۆ نموونـە، لـە پەیوەندیـی نێـوان نێـر و مێـدا ئـەم شـڵەژانە تـا ئـەو شـوێنە ڕۆیشـتوە لـە هەندێـک

ئاستدا لەشی ژن و لەشی پیاو لەناو ئابووریی بەرخۆریی دونیای دوای ڕاپەڕیندا وەک لەشێکی سێکسیی ڕووت وێنا بکرێت و وەک لەشێکی سێکسی لەناو فەزای گشتیدا ئامادە بێت، بەمەش چاوەڕوانیی تر و ڕۆڵی تر و ئەرکی تر بەو لەشە ببەخشرێت. بەکورتی، "شڵەژانی پێوانەیی" دەرەنجامی بەردەوامی و نەگۆڕانی بونیادەکان و وێنەکان و پەیوەندییەکان نییە، وەک لێکدانەوە تەقلیدییەکان پێی لەسەر دادەگرن، بەڵکو دەرەنجامی گۆڕانی خێرا و قووڵ و ڕیشەییی ئەو بونیادانەیە، کە بەهای تر و چاوەڕوانیی تر و ڕۆڵی تر پێشنیار دەکەن.

بەکورتی، ئەم لێکۆڵینەوەیە دەچێتە ئەودیوی ئەو گریمانە سادە و گشتگیرانەوە کە پێیان وایە بنەما و کۆڵەکەکانی توندتیژیی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا پاتریارکیەت، خێڵگەرایی، ئیسلامی سیاسی، ناسیۆنالیزم و چەوساندنەوەی نەتەوەییە، کە هەندێکیان هەزار ساڵ تەمەنیان هەیە و بەبێ گۆڕان لە ڕابردوویەکی دێرینەوە بۆ ئەمڕۆ پەڕیوەنەتەوە. دەشیەوێت ئەو پارادیمە ناسیۆنالیستییە تێپەڕێنێت کە پێی وایە سەرچاوەکانی توندوتژیی بەگشتی و توندوتیژیی دژ بە ژنان سەرچاوەی دەرەکین و ناحەزانی کوردستان و داگیرکەران لێی بەرپرسیارن. ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕێگای بەیەکەوەگرێدانی تیورە تازەکانی بواری پیاوەتیناسی، یان رجولەت، masculinities، بە ڕوانینەکانی کۆمەڵناسیی فەرەنسیی ئیمیلی دورکهایمەوە بۆ دیاردەی "خۆکوشتن"، گرنگی بەو ژینگە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییە تازەیە ئەدات کە لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەوە تا ئەمڕۆ لە هەرێمدا دروست بووە و لەناویدا توندوتژیی ڕەگەزیی دژ بە ژنان

پیادە دەکرێت. بەم کارەشی هیواداره دەستپێک و ڕوانینێکی نوێ بهێنێتەکایەوە بۆ مەسەلەی لێکۆڵینەوە لە توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا، دەسپێک و ڕوانینێک هاریکارمان بێت بۆ تێگەیشتنێکی وردتر و هەمەلایەنتر لەم دیاردە ترسناکە و یارمەتیدەرمان بێت بۆ دۆزینەوەی شێواز و ڕێگای نوێ بۆ بەگژاچوونەوە و چارەسەرکردنی.

### ئامارەکانی توندوتیژی دژ بە ژنان

ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتی تەواوی بەو ژمارە و ئامارانە بەستوە کە (بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان) ساڵانە بڵاویان دەکاتەوە. بێگومان کارێکی زەحمەتە بتوانین ژمارە و ئاماریی ڕاستەقینە و باوەڕپێکراو سەبارەت بە توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لە هەرێمدا بەدەست بهێنین. نە نەخۆشخانەکان و دەزگاکانی تەندروستی ژمارەی تەواوی قوربانییەکانی توندوتیژیی ڕەگەزی کۆ دەکەنەوە، نە دادگاکانیش، نە دەزگاکانی پۆلیس و نە دەزگا ئەمنییەکانیش. هاوکات ژمارەیەکی کەمی قوربانییەکان دەوێرن فشار و دەستدرێژیکردنە توندوتیژەکان بە لایەنە بەرپرسەکان بگەیەنن، ئەمەش کۆمەڵێک هۆکاری زۆری لەپشتە، کە باسکردنیان دەکەوێتە دەرەوەی سنووری ئەم لێکۆڵینەوەیەوە. بۆیە لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە گەر بڵێین ژمارەی ڕاستەقینەی قوربانییەکان گەورەترە لەو ژمارە ڕەسمییانەی کە بۆ نموونە، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی گشتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان، بڵاو دەکرێنەوە. سەرەڕای ئەم ڕاستییە، ئەو ژمارە ڕەسمییانەی کە لەبەردەستدان هێما

بۆ ئەوە دەکەن کە ڕووبەری توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا ڕووبەرێکی هێجگار گەورەیە و ژمارەی ئەو ئافرەتانەی ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبنە ژمارەیەکی هێجگار گەورەیە. خۆشبەختانە لە کوردستاندا زیاد لە ڕێکخراوێکی بەرگریکردن لە مافی ئافرەتان و چەندان ئۆرگانی ناحکومی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی، ڕاپۆرتەکانی دەستەی مافی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەککرتووەکان(UNAMI)، هەروەها میدیای کوردی، ڕاپۆرتی تایبەت لەسەر دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی بەرامبەر بە ژنان بڵاو دەکەنەوە و باس دەکەن و بەسەریەکەوە چەندان ڕووی جیاوازی ئەم کێشە گەورە و ترسناکە ڕوون دەکەنەوە. تەنانەت حکومەتی هەرێم خۆشی هەستی کردوە کە ناچارە و پێویستە گرنگی بە دیاردەی توندوتیژی بەرامبەر بە ژنان بدات.[١]

ئەگەرچی ئەو هۆکارانەی سەرەوە وا دەکەن وێنە گشتی و کامڵەکەی توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لێڵ و ناتەواو بێت، ئەگەرچی دەزگا و ڕێکخراوە سەربەخۆ و بێلایەنەکان ئامارەکان بەوردی کۆ ناکەنەوە، ئەگەرچی نازانین قەبارەی ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیە چەندە، بەڵام دیسانەوە خۆشحاڵانە هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتیی نوێ لە هەرێمدا لە دروستبووندایە، کە دەرک بە مەترسییە گەورەکانی ئەم دیاردەی توندوتیژییە

١ ـ ڕاپۆرتە ساڵانەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان زانیاریی ورد و ڕێکخراویان تێدایە لەسەر دیاردەی توندوتیژیی دژ بە ژنان. ئەوەی دەبێت بگوترێت ئەوەیە ئەم دەزگایە سەر بە حکومەتی هەرێمە و چەندان ڕێکخراوی ئافرەتان و چالاکەوانی ئافرەت گومان لەم ژمارانە دەکەن و پێیان وایە ژمارە ڕاستەقینەکان گەلێک گەورەترن لەوەی بڵاو دەکرێنەوە.

دەکات و ئەمە وای کردوە مەسەلەی توندوتیژیی ڕەگەزی ببێت بە یەکێک لە بابەتە گرنگەکانی ناو ڕووبەری گشتی لە کوردستاندا. وەک چۆن چاوکرانەوەی قوربانییەکان خۆشیان و بەشداربوونیان لە گەیاندنی پێشێلکردنی مافەکانیان بە ئۆرگان و ڕێکخراو و دەزگا ڕەسمی و نارەسمییەکان، خەریکە وێنە گشتییەکەی توندوتیژی لە هەرێمدا، یان لانی کەم هەندێک دیوی کە تا دوێنێ ناڕوون و نادیار بوون، زیاتر ڕوون دەکاتەوە. بە مانایەکی دیکە بەقسەهاتنی قوربانییەکان خۆیان و دۆزینەوەی ئازایەتیی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بۆ ئەوەی خۆیان بە زمانی خۆیان باسی دەستدرێژییەکان بکەن، هۆکارێکی گرنگیی دەرکەوتنی هەندێک ڕەهەندی شاراوەی ئەم دیاردەی توندوتیژییەیە. لە ئێستادا یەک شت لە هەرێمدا قابیلی گومانلێکردن نییە، ئەویش ئەوەیە توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان چیدی دیاردەی پشتی ژوور و دەرگا داخراەکان نییە و لە "مەجالی شەخسی"ی خێزاندا بەند نەکراوە و گیری نەخواردوە، بەڵکو بووە بە بەشێک لە هەندێک دەرکەوتی ئەو "مەجالە گشتی"یە تازەیە کە لە کوردستاندا لە دروستبووندایە، توندوتیژیی ڕەگەزی ئەمڕۆ بووە بە مەسەلەیەکی گرنگیی ناو ژیانی گشتی و لە زیاد لە ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتیدا باس دەکرێت.[1]

---

١ _توندوتیژی دژ بە ئافرەتان یەکێکە لە تیما سەرەکییەکانی بەشێک لە میدیاکانی کوردستان. هەورەها بەشێکە لەو موناقەشە گشتییانەی لە کۆمەڵگای کوردستاندا ئامادەیە. ئەمە جگە لەوەی بەشێکە لە کاری ڕێکخراوەکانی ژنان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوە ناحکومییەکان. لە سەرەتاوە ڕێکخراوی ئافرەتان دروست بوون دژ بە دیاردەی تۆڵەی شەرەف و کوشتن لەسەر مەسەلەی ناموس، لەوانەش بۆ

هەموو ئەم گۆڕانکارییانە پاڵی بە حکومەتی هەرێمەوە نا چەند هەنگاوێک بە ئاراستەی بەگژاچوونەوەی توندوتیژیی خێزانی بنێت، لەوانەش بۆ نموونە دەرکردنی یاسایەک کە "تۆڵەی شەرەف" یان کوشتن بە هۆی شەرەفەوە یاساغ بکات، دروستکردنی چەندان پەناگا بۆ قوربانیان، شێلتەر، دوستکردنی چەندان ئەنجومەن و ئۆرگانی ژنان کە خۆیان بە مەسەلەی مافی ئافرەت و پێشکەوتنی ئاستی ژیانیانەوە خەریک بکەن.[1] دەسکاریکردنی هەندێک لە یاساکانیش دیوێکی دیکەی گرنگیدانە بە مەسەلەی بەگژاچوونەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان، لەپێش هەموانیشەوە لەکارخستن و ئیلغاکردنی "یاسای ئەخلاقی شەخسی"ی سالی ۱۹۹۰ ی عێراق، کە توانای ئەوەی بە پیاوان دەبەخشی ژنەکان و کچەکانیان بکوژن، گەر گومانی ڕەفتاری خراپیان لێ بکەن، بەبێ ئەوەی خەمی ئەوەیان هەبێت لە ڕووی یاساییەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت. ئەمە جگە لە دەرکردنی یاسایەک کە

---

نموونە تۆڕی ژنانی کورد دژ بە کوشتنی شەرەف. Kurdish Women Against Honour Killing (KWAHK) network.

١ _بۆ شارەزابوون دەربارەی ئەو ئۆرگانە ڕەسمی و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوی ئافرەتانەی گرنگی بە مەسەلەی توندوتیژیی ئافرەتان ئەدەن بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:
Begikhani, Nazand et al. (2010), Final report: Honour-based violence (HBV) and honour-based Killings in Iraqi Kurdistan and in the Kurdish diaspora in the UK.

هەروەها بڕوانە:
the annual UNAMI Human Rights Reports in Iraq at: http://www.uniraq.org index.php?option=com_k2&view=itemlist&layout=category&task=category&id=164&Itemid=650&lang=en.

مەسەلەی فرەژنی سنووردار دەکات. بە هەموو نووقسانی و کورتهێنانەکانیانەوە ئەم گۆڕانکارییە سەرەتاییانە دۆخێکیان دروست کردوە کە نەکرێت بەبەردەوامی توندوتیژیی ڕەگەزی لەناو سنووری داخراوی خێزاندا بهێڵدرێتەوە و هەندێک ڕێگا و میکانیزم بۆ هاتنەدەرەوەیان دروست بووە. بەلام وەک ژمارەکان و ئامارەکان نیشانمان ئەدەن، سەرباری پیادەکردنی هەندێک گۆڕانکاری و بەدەستهێنانی هەندێک سەرکەوتنی بچووک لە بواری یاساییدا، هێشتا دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی و ژمارەی ئەوانەی دەکوژرێن و ئەوانەی خۆیان دەکوژن و ئەوانەی ئەسووتێن و خۆیان ئەسووتێنن، هێجگار گەورەیە و بەڵگەیەکیش لەبەردەستدا نییە پێمان بڵێت کە ئەو دیاردانە لە کەمبوونەوەدان[١]. بە مانایەکی دیکە، نە چارەسەرە یاساییەکان و نە بوونی کێشەی بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە ئافرەتان بە بەشێک لە گفتوگۆ و باس و خواستی ناو ڕووبەری گشتی، نە دامەزراندنی هەندێک دەزگای ڕەسمی و نارەسمی بۆ گرنگیدان بەم دیاردەیە، نەیانتوانیوە چارەسەری ئەم دیاردە ترسناکە لە هەرێمدا بکەن.

### پرسیارەکان و میتۆد و سنووری لێکۆڵینەوەکە

ئەو میتۆدەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا پیادە کراوە، میتۆدی باوی ناو زانستە کۆمەلایەتییەکانە لە ڕێگای تێکەڵکردنی لێکۆڵینەوەی مەیدانییانە بە هەندێک ڕوانینی تیۆرییانە لەسەر ئەو بابەتەی

---

١ _بۆ زانیاریی ورد لەسەر گۆڕینی یاساکان بڕوانە ئەو سەرچاوەیەی لە یاداشتی ژمارە ٢ هێمای پێ کراوە

لێکۆڵینەوەکەی دەربارە دەکرێت. لە کاتی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە مەیدانیییەکەدا لە کوردستان چاوپێکەوتن و گفتوگۆی قووڵ in-depth interviews ئەنجام دراوە لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا کە لەم بوارەدا کار دەکەن و وەک چالاکەوانی مافەکانی ئافرەت دەستبەکارن. هەروەها قسە لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەنووسانەدا کراوە کە لێزانی ئەم بوارەن و کاریان گرنگیدانە بە مەسەلەی ئافرەت و کەوتنە دوای کێشەکانیان لە ڕۆژنامەکانیاندا، جگە لەمانە قسە لەگەڵ ئەو ژنانەشدا کراوە کە لە ڕیزەکانی پۆلسیدا ئەفسەرن و ڕۆژانە سەرقاڵی مەسەلەی تودنوتیژین دژ بە ئافرەتان، هاوکات قسە لەگەڵ چەند ژنێکی ئەندامی دەورەکانی پێشووی پەرلەمانی کوردستاندا و لەگەڵ بەڕێوەبەری چەند ئۆرگانێکی ژناندا کراوە. ئەم چاوپێکەوتنانە هەم لە شاری هەولێر و هەم لە شاری سلێمانی و هەم لە لەندەن و هەم لە هۆڵەندا ئەنجام دراون. لە ساڵی ٢٠١٠ پێشنیاری ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی هاوشێوەی لە زانکۆی ئەمستردام کرد و ئەودەمیش کۆمەڵێک زانیاریی زۆرم لەسەر دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا کۆ کردبووەوە. جگە لەمە نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە لە چەند ساڵی ڕابردوودا چەند جارێک لەسەر بابەتی مافەکانی ژن و دیاردەی توندوتیژیی دژ بە ژنانی نووسیوە.[1]

لە ئاستێکی دیکەدا ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتئەستوورە بە بەشێکی سەرەکی ئەو ئەدەبیاتە تیورییە زۆرەی لەسەر مەسەلەی توندوتیژیی ڕەگەز و مەسەلەی پیاوەتیی و

١ _بۆ هەندێک لە نووسینەکانی نووسەر سەبارەت بە کێشە و گرفتی ژنان و مەسەلەی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا سەیری ئەم ژمارانەی ڕۆژنامەی ئاوێنە بکە: ئاوێنە ٢٠ و ٢٧ مانگی ٥ ساڵی ٢٠١٤. هەروەها ٣ و ١٠ مانگی ٦ ساڵی ٢٠١٤. www.awena.com

ژنبوون لە کایە ئەکادیمییە جیاوازەکاندا نووسراوە. وەک پێشتر وترا گەڕاندنەوە بۆ هەندێک لە تێزەکانی دۆرکهایمیش سەبارەت بە خۆکوشتن و بۆ هەندێک لە تێزە سەرەکییەکانی کۆنێل سەبارەت بە مەسەلەی "پیاوەتیی خاوەن هەیمەنە" و بەکارهێنانی هەندێک تێزی گرنگ لەسەر مەسەلەی مەسرەفگەرایی بەگشتی و پەیوەندیی مەسرەفگەرایی بە پێگەی ژنەوە بەتایبەتی، لە بنەما تیۆرییە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەن. ئەمە جگە لە گەڕانەوە بۆ هەندێک لە دیدە تیۆرییەکانی فەیلەسوفی ئیتالی: ئانتۆنیۆ گرامشی، سەبارەت بە چەمکی "هەیمەنە" و "شەڕی پێگە" و "شەڕی دەستەویەخە". هاوکات ئەم لێکۆڵینەوەیە بەشێکی سەرەکیی ئەو ئەدەبیاتە تیۆرییە سەرلەنوێ دەخوێنێتەوە و لێک ئەداتەوە کە لەسەر دیاردەی توندوتیژیی ژنان لە کوردستاندا نووسراوە، بەتایبەتی ئەو ئەدەبیاتەی کە بە زمانی ئینگلیزیی لەم بوارەدا نووسراوە. جگە لەمانە ئەم لێکۆڵینەوەیە شیکردنەوەی بڕێک لەو نووسینانەش دەگرێتە خۆی کە لەناو ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتەکانی سەر ئینتەرنێتدا لەسەر ئەم دیاردەیە نووسراون.

**پرسیاری لێکۆڵینەوەکە:**

پرسیارە سەرەکییەکانی لێکۆڵینەوەکە بریتین لەم سێ پرسیارەی لای خوارەوە:

١- چۆن سێ شێوازە سەرەکییەکەی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا بخوێنینەوە و شی بکەینەوە؟ مەبەست لەو سێ شێوازەش کوشتن و خۆکوشتن و سووتان و خۆسووتاندنی ئافرەتانە.

٢- ئایا خێڵگەرای، پاتریارکی، ئیسلامی سیاسی و ناسیۆنالیزم، هۆکاری سەرەکیی توندتیژیی ڕەگەزین بەرامبەر بە ئافرەتان؟ ئەگەر ئەوان نین ئایا هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم دیاردەیە چین؟

٣-ئایا ئەم شێوازانەی توندوتیژی لە چ ژینگەیەکی سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیدا ڕوو دەدەن و دروست دەبن؟

**هەندێک شیکردنەوەی سەرەتایی بۆ ئامارەکان**

بەر لە هەمووشتێک، ئامارەکان بەسەرهاتێکی تەواو تراژیدیی دۆخی بەکارهێنانی توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتمان لە هەرێمدا نیشان ئەدەن و وێنەیەکی تەواو تەڵخ و تاریکمان بۆ دەکێشن. ئەو ژمارانە نیشانمان ئەدەن کە سەدەها ئافرەت ساڵانە قوربانیی دەستی هەر سێ شێوازەکەی توندوتیژین، چ لە شارە گەورەکان و چ لە قەزا و ناحیەکان و چ لە گوندەکانی کوردستاندا. واتە شێوازەکانی توندوتیژی لە هەموو ڕووبەرە جوگرافییەکانی کۆمەڵگای کوردستانیدا ئامادەیە و دیاردەی توندوتیژی بەرامبەر بە ئافرەتان دیاردەیەکی بەربڵاو و هەمەلایەنە.

ئەگەر سەیری ژمارەی قوربانییەکان لە هەریەکێک لە سێ شارەکەی هەرێمدا بکەین، بۆمان دەر دەکەوێت لە سلێمانی لەنێوان ساڵی ٢٠١٠ و ٢٠١٣دا ٣١ ئافرەت کوژراون، ٦٧ ئافرەت خۆیان کوشتوە، ٣٢٤ بە "قەزاوقەدەر" سووتاون و ١٣٧ ئافرەتیش خۆیان سووتاندوە، بەسەریەکەوە ٥٥٩ ئافرەت. دۆخەکە لە هەولێر بە هەمان شێوە تراژیدییە، ژمارەی ئەوانەی لەنێوان ٢٠١٠ بۆ ٢٠١٣ کوژراون ٩٩

ئافرەتن (ئەم ژمارەیەش نزیکەی سێ جار گەورەترە لەوەی سلێمانی)، ٤٥ ئافرەت خۆیان کوشتوە (سێ_یەکێک کەمتر لەوەی سلێمانی)، ٣٦٢ ئافرەت سووتاون بە هۆی "قەزاوقەدەر"ەوە، (بیست لە سەد زیاتر لەوەی سلێمانی)، ١٩٢ ئافرەتیش خۆیان سووتاندوە (زیاد لە بیستوپێنج لەسەد زیاتر لە سلێمانی)، بەسەریەکەوە ٦٩٢ ئافرەت. هەمان وێنە لە دهۆکیش بە ڕادەیەکی گەورە تاریکە، ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لەنێوان ئەو ساڵانەدا کوژراون ٢٩ ئافرەتن (نزیک لە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لە سلێمانی کوژراون، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتووانی سلێمانی نزیکەی دووجاری دانیشتووانی دهۆکە) هەروەها ٤٣ ئافرەت خۆیان کوشتوە (یەک لەسەر سێ کەمتر لە ژمارەی سلێمانی)، ٢١١ ئافرەت بە هۆی "قەزاوقەدەر"ەوە سووتاون و ژمارەی ئەوانەشی کە خۆیان سووتاندوە ١٧٣ ئافرەتن (بیست لە سەد زیاتر لەوانەی سلێمانی)، بەسەریەکەوە ٤٥٦ ئافرەت.

ژمارەی گشتیی ئەو ئافرەتانەی لەنێوان ساڵانی ٢٠١٠ و ٢٠١٣ لە هەرێمی کوردستاندا بوونەتە قوربانیی ئەم سێ شێوازە لە توندتیژی، بریتییە لە ١٧١٣ ئافرەت، لەوانە کۆی ئەوانەی لەو چەند ساڵەدا کوژراون ١٥٩ ئافرەتن، ئەوانەی خۆیان کوشتوە ١٥٥ و ئەوانەی خۆیان سووتاندوە ٥٠٢ ئافرەتن، ئەوانەشی بە "قەزاوقەدەر" سووتاون ٨٩٧ ئافرەتن. وەک پێشتر هێمامان بۆ کرد ئەم پۆلینکردن و جیاکارییە جیاکارییەکی ڕەها نییە، بۆ نموونە مەحاڵە بزانین بڕی ئەو ئافرەتانەی کە سووتاندنەکەیان دەدرێتە پاڵ قەزاوقەدەر، چەندیان لە واقیعدا کوشتن یان خۆسووتاندنن، یان چەندیان

هەوڵدان بوون بۆ خۆکوشتن. لە دۆخی نائامادەیی زانیاریی ورد و باوەڕپێکراودا سەبارەت بە ژمارەی ڕاستەقینەی قوربانییەکان، ئەم لێکۆڵینەوەیە هیچ هەڵبژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نییە، جگە لە قبووڵکردنی ئەو ژمارانە بەو شێوەیەی کە هەیە.[1]

بە ڕوانین بۆ ئەو ژمارانە، دەکرێت هەندێک گشتگیریی سەرەتایی بکەین و بڵێین هەولێر شاری کوشتنی ئافرەتانە، (٩٩) ئافرەت لەو چوار ساڵەدا کوژراون، سلێمانی شاری خۆکوشتنی ئافرەتانە، (٦٧) ئافرەت خۆیان کوشتوە، دهۆکیش شاری هەردووکیانە، (٢٩) ئافرەت کوژراون و (٤٣) ئافرەت خۆیان کوشتوە. ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لە هەولێردا کوژراون لە هەردوو شارەکەی تری هەرێم زیاترە و ژمارەی ئەوانەی لە سلێمانیدا خۆیان کوشتوە لەوانەی هەولێر و دهۆک زیاترە و هەردوو شێوازەکەش لە دهۆک بە ژمارەی زۆر ئامادەن، بەتایبەتی گەر ئەو ڕاستییە سادەیەمان لەبەرچاو گرت کە ژمارەی دانیشتووانی دهۆک لە ژمارەی دانیشتووانی هەولێر و سلێمانی زۆر کەمترە. لە دەرەوەی ئەم ئەنجامگیرییە گشتگیرەدا با ئێستا کەمەکێک وردتر لەو ئامارانە و زانیارییەکان ورد ببینەوە و هەندێک دەرەنجامی سەرەتایی دیکەش وەدەست بهێنین:

١- ئەوەی ژمارەکان نیشانمان ئەدەن ئەوەیە کە

---

١ چەند چالەکەوانێکی ژنان و هەندێک لە بەرپرسی دەزگاکانی بەگژاچوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان لە کاتی گفتوگۆکانمدا لەگەڵیاندا بە منیان وت، "لانی کەم نیوەی ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە گوایە بە هۆی قەزاوقەدەرەوە سووتاون حاڵەتی خۆسووتاندنن، بەڵام هەرکەسە و بۆ هۆیەک ئەو ڕاستییە ناڵێت".

خۆکوشتنی ژنان دیاردەی ژمارەیەکی توندوتیژییە بەرامبەر بە ئافرەتان لە کوردستاندا، نەک کوشتن لەسەر شەرەف. ڕاستە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لەنێوان ٢٠١٠ و ٢٠١٣ کوژراون ١٥٩ و ژمارەی ئەوانەی خۆیان کوشتوە ١٥٥ ئافرەتن، بەلام هەموو ئەو ئافرەتانەی کە کوژراون لەسەر مەسەلەی شەرەف نەکوژراون، بەڵکو ژمارەیەکی زۆریان بە هۆی ناکۆکییەکانی تری ناو خێزان و بە هۆی دەمەقاڵێ و کێشەی کۆمەلایەتی و تورەبوون و شتی دیکەی تری لەم بابەتەوە کوژراون. جگە لەم ڕاستییە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ٥٠٢ ئافرەت خۆیان سووتاندوە و لەوانەش ژمارەیەکی گەورەیان مردوون. ئەگەر ئەم ژمارەی خۆسووتاندنە بخەینە سەر ژمارەی ئەوانەی خۆیان کوشتوە، ئەوا ژمارەکە سەر دەکەوێت بۆ ٦٥٧ ئافرەت، ئەودەم ژمارەی ئەوانەی خۆیان کوشتوە یان هەوڵی خۆکوشتنیان داوە زۆر گەورەتر دەبێت لە ژمارەی ئەوانەی لەسەر مەسەلەی شەرەف کوژراون. خۆسووتاندن جۆرێکی تایبەتە لە خۆکوشتن، یان هەوڵدان بۆ خۆکوشتن. خۆ ئەگەر بۆچوونی هەندێک لە چالاکەوانە ئافرەتەکانی بواری بەگژاچونەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان ڕاست بێت، کە دەڵێن نیوەی ژمارەی ئەوانەی گوایە بە قەزاوقەدەر سووتاون لە ڕاستیدا خۆسووتاندنن، ئەوا ژمارەی خۆکوشتن و هەوڵدان بۆ خۆکوشتن زۆر زیاتر بەرز دەبێتەوە، بە ڕادەیەک دەکرێت بەئاسانی بڵێین ژمارەی ئەوانەی خۆیان دەکوژن یان هەوڵی خۆکوشتن ئەدەن، بۆ نموونە لە ڕێگای خۆسووتاندنەوە، لانی کەم ١٠ جار بەرزترە لە ژمارەی ئەوانەی لەسەر تۆڵەی شەرەف دەکوژرێن،

ئەگەر زۆر بەرزتریش نەبێت. ئەمەش، وەک وتمان، ئەوە دەگەیەنێت کە کێشەی ژمارە یەک و شێوازی سەرەکیی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا تۆڵەی شەرەف نییە، بەڵکو خۆکوشتنی ژنانە.

٢- توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ژنان لە هەرێمدا بە پلەی یەکەم دیاردەیەکی شارییە، ژمارەیەکی گەورەی ڕووداوە توندوتیژەکان لەناو شار و قەزا گەورەکانی کوردستاندا ڕوو دەدەن. ئامارەکان نیشانی ئەدەن زۆرینەی قوربانییەکان لە شار و قەزا گەورەکاندا دەژین و بەشی هەرەزۆری هەر سێ شێوازەکەی توندوتیژی لەو دوو شوێنەدا ڕوو دەدەن. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە لە لادێ و شوێنە بچووکەکاندا ئەم دیاردانە بوونیان نییە، لەو ناوچانەشدا هەرسێ شێوەکەی توندوتیژی هەیە، بەڵام بەشی زۆری قوربانییەکان نیشتەجێی ئەو ناوچانە نین.[1] ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات ئەنجامگیرییەکی سەرەتایی بکەین و بڵێین: ئەم سێ شێوازە لە توندوتیژی بەرامبەر بە ئافرەتان بە

---

١ ـ پێویستە لێرەشدا بەوریایی مامەڵە لەگەڵ ژمارەکاندا بکەین، چونکە ئەو ژنانەی لە شارە گەورەکاندا دەژین دەتوانن ئاسانتر پەیوەندی بەو لایەنانەوە بکەن کە بەرگری لە ئافرەتان دەکات و بەسەرهاتی خۆیانیان بۆ بگێڕنەوە. بە پێچەوانەوە تاوان و توندوتیژییەکان لە ناوچە ناشارییەکان و لە گوندەکاندا دەشاردرێنەوە و ڕاپۆرت ناکرین. لێرەشدا دیسانەوە دەبێت دوو خاڵ ئاشکرا بێت. یەکەمیان ئەوەیە کە زۆربەی گوندکانی کوردستان لەدوای پەلامارەکانی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ وێران کراون و تا ئێستاش بەشێکی بەرچاویان دروست نەکراونەتەوە. دووهەم، گەشەی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی دۆخێکی دروست کردوە، تەنانەت لەناوچە دوورەدەست و سنوورییە بچووکەکانیشدا توانای ئەوە هەیە ئەوەی ڕوو دەدات ڕاپۆرت بکرێت.

پلەی یەکەم دیاردەیەکی شارییە و پێویستە وەک بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕەگەزیی ناو شارەکان ببینین و مامەڵە بکەین.

٣- زۆرینەی ڕەهای قوربانییەکان ئافرەتی گەنجن، تەمەنیان لەنێوان ١٢ ساڵ بۆ ٢٥ ساڵە. ئەمانەش بە نیشتەجێکردنیان لەناو مێژووی کۆمەڵگای ئێمەدا منداڵانی قۆناغی دەسەڵاتدارێتیی کوردیی دوای ساڵی ١٩٩١ و منداڵانی دونیا و مێژووی دوای ڕاپەڕینن. بە مانایەکی دیکە ئەو ژینگەیەی کە دەستنیشانی ئەزموونی ئەم نەوەیە دەکات، ژینگەی دونیای دوای ڕاپەڕینە. ئەم نەوەیە یادوەریی قۆناغی بەر لە ڕاپەڕین و سەردەمی خەباتی نیشتیمانیی چەکداری نییە، تاوانە گەورەکانی بەعسی لە عێراقدا نەدیوە و نەناسیوە، هەروەها شێوازە جیاوازەکانی چەوساندنەوەی ئەتنی و نەتەوەییی نەوەکانی بەر لە خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەزموون نەکردوە. بۆیە ئەو توندوتیژییانەی ئەم نەوەیە ئەزموونیان دەکات توندوتیژییەکی خۆماڵین و بەشێکن لە پێکهاتەی دونیای دوای ڕاپەڕین، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە شێوازەکانی توندوتیژی دونیای بەر لە ڕاپەڕینەوە نییە، یان لاوازە. بۆ تێگەیشتن لەم شێوازانەی توندوتیژی، پێویستە ئەم خاڵە زۆر بەجیدی وەر بگرین و بیخەینە ڕەوتی چۆنیەتی تێگەیشتن و مەماڵەکردنی توندوتیژی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا.

٤- ژمارەکان پێمان دەڵێن زۆرینەی قوربانییەکان ئافرەتی شووکردووی گەنجن، خێزانیان دروست کردوە، لە شارەکاندا دەژین، خوێندەوارن، تەنانەت دەکرێت بڵێن

برێکی بەرچاویشیان خوێندەوارییەکەیان باشە، بۆ نموونە دەرچووی دواناوەندییەکان و هەندێک جار زانکۆکانن.[1]

٥-خاڵێکی گرنگی دیکە کە ئامارەکان نیشانمان ئەدەن ئەوەیە کە بەشی زۆری قوربانییەکان دۆخی ئابوورییان یان باشە، یان مامناوەندییە و هەندێک جاریش زۆر باشە. ئەمەش مانای ئەوەی بەشێکی زۆری توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ژنان لە کوردستاندا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە دیاردەی هەژارییەوە نییە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەژاری هیچ پەیوەندییەکی بەم دیاردەی توندوتیژییەوە نییە، چونکە هەر خودی ئەو ئامارانە نیشانمان ئەدەن هەندێک لە قوربانییەکانی توندوتیژی دۆخی ئابوورییان خراپە و لە ژینگەیەکی هەژاردا ژیاون و دەژین و بەمەش دەشێت ڕەگوڕیشەکەی ئەو توندوتیژییەی دووچاریان دەبێتەوە لەناو هەژاریدا بێت. بەڵام هەژاری ناتوانێت دیاردەی بەکارهێنانی توندوتیژی لای زۆرینەی هەرەزۆری ئافرەتان لێک بداتەوە و وەک وتم زۆرینەی دۆخی ئابوورییان یان باشە یان مامناوەندییە. ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەم ئاستەدا پێشنیاری دەکات، بینینی هەژاریی نییە وەک سەرچاوە، یان ژینگەی توندوتیژییەکان، بەڵکو ژینگەی تێکچوونی پەیوەندیی نێوان هەژاری و دەوڵەمەندییە لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا هاتۆتە کایەوە، لەم دونیایەدا پەیوەندیی نێوان هەژارکەوتن و دەوڵەمەندبوون بە شێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕاوە.

---

١ _ئامارەکان لە پەیوەندیدا بە پلە و ڕادەی خوێندەوارییەوە جیاوازییەکی بەرچاو نیشان ئەدەن لەنێوان سلێمانی و دهۆکدا. زۆرینەی قوربانییەکانی سلێمانی خوێندەوارن و قوناغێک لە قوناغەکانی خوێندنیان تەواو کردوە، لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەمتر لە قوربانییەکانی دهۆک خوێندەوارن.

٦-ڕاستییەکی تر کە ئامارەکان نیشانمان ئەدات ئەوەیە، کە بەشێکی زۆری ئەو سێ شێوازەی توندوتیژیی پەیوەندییان بەو کەشە پڕ ململانێ و ناکۆکییانەوە هەیە کە لەناو خێزاندا دروست بووە. هەروەها پەیوەندیی بەو قەیرانانەوە هەیە کە لە پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەناو خێزاندا دروست بووە. لە دونیای دوای ڕاپەڕینی کوردستاندا ژیانی خێزان گۆڕانی گەورە و ڕیشەیی بەسەردا هاتووە، بە جۆرێک پەنابردن بۆ توندوتیژی یەکێکە لە ئامرازە سەرەکییەکانی پاراستنی پەیوەندییە ناهاوسەنگەکانی دەسەڵات لەناویدا، ئەم خاڵە دواتر زیاتر لەسەری دەوەستین. خێزان لە کوردستاندا لە زۆر دۆخدا، بەتایبەتی لەو دۆخانەدا کە پەیوەندییان بە مەسەلەی خۆکوشتن و خۆسووتاندنەوە هەیە، ئەو ڕۆڵ و توانای ئامێزانبوونەی لەدەست داوە کە لە قۆناغەکانی پێشتردا هەیبووە.

٧- ئامارەکان هێما بۆ ئەو ڕاستییە دەکەن کە لە کوردستاندا شێوازی نوێی هەستکردن بە خود و هەستکردن بە کەسایەتی لای ئافرەتان دروست بووە و دروست دەبێت، کە پێویستیان بە فۆرمی نوێ لە پەیوەندیی خێزانی و بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندن و بوونی ئاستێکی مامناوەندیی ئابووری و فۆرمی نوێی ژیانی خێزانیی هەیە. بۆیە ئەوەی لەم ئاستەدا پێویستە، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زیاترە لەسەر ژیانی خێزان لە پەیوەندیدا بە دروستبوونی ئەم هەستە تازەیەوە بە خود و بە لەدەستدانی ئەو ڕۆڵە ئامێزانکەرەی کە خێزان پێشتر هەڵگری بووە. نەک دووبارەکردنەوەی ئەو بۆچوونە گشتی و سواوانەی کە خێزانی کوردی وەک ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتیی نەگۆڕ و پاتریارکیەتێکی دێرین وێنا دەکەن.

**لێکدانەوە تەقلیدییەکانی دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا**

ئەدەبیاتێکی زۆر لەسەر شیکردنەوەی ڕەگوڕیشە و هۆکارەکانی توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا لەئارادایە، بەداخەوە بەشی زۆری ئەم ئەدەبیاتە هەڵگری لێکدانەوەیەکی تەواو تەقلیدین بۆ ئەم دیاردە ترسناکە، زۆر جاریش هەست ناکەیت شتێک لە شیکردنەوەکانی ناو ئەم ئەدەبیاتەدا گۆڕاوە، ئەوەی لە ساڵانی هەفتا و هەشتادا نووسراوە، هەمان ئەو شتەیە کە سی ساڵ دواتر و لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستویەکەمدا نووسراوە. وەک پێشتریش وتمان، ئەم ئەدەبیاتە بێ ماندووبوون باس لە ڕۆڵ و کاریگەریی پاتریارکیەت، ئیسلامی سیاسی، خێڵگەرایی، بەها و نۆرمی کۆمەڵایەتیی تەقلیدی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ئەتنی و کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی ناسیۆنالیزم دەکات، لە بەرهەمهێنان و هێشتنەوە و پاراستنی ئەم توندوتیژییەدا. بۆ چارەسەرکردنی ئەم توندوتیژییەش باس لە مەسەلەی پیادەکردنی مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی ئەو مافانە دەکەن. با چەند نموونەیەک لەو ئەدەبیاتە بهێنینەوە.

بۆ نموونە شارەزاد مۆجاب، کە خانمێکی دانیشتووی کەنەدایە و نووسینێکی زۆری لەسەر مەسەلەی ئافرەتان لە کوردستاندا هەیە، مەسەلەی خێڵگەرایی و ناسیۆنالیزم و پاتریارکیەت وەک هۆکارە سەرەکییەکانی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا دەبینێت. لە نووسینەکانی ئەم نووسەرەدا هەم دەسەڵاتی پاتریارکی و هەم کولتوورەکەی بەرپرسن لە شێوازە جیاوازەکانی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا،

لای ئەم خانمە بالادەستیی ئەم دەسەڵات و کولتوورە پاتریارکییە، کە مێژوویەکی دێرینی لە کوردستاندا هەیە، بەرپرسە لە توندوتیژیی ڕەگەزی.[1] هەمان ئەم نووسەرە لە شوێنێکی دیکەدا ئیسلامی سیاسییش دەخاتە پاڵ دەسەڵات و کولتووری پاتریارکیەت و بەسەریەکەوە دەیانکات بە بەرپرس لە دیاردەی توندوتیژیی جێندەری. دەربارەی ئیسلامی سیاسی ئەم خانمە دەنووسێت: "سیاسییەکان لەلایەن ئێران و سعوودیەوە یارمەتیی مادی و مەعنەوی دەدرێن بۆ ئەوەی هەوڵی بەئیسلامیکردنی پەیوەندییە ڕەگەزییەکان لە کوردستاندا بدەن." لەپاڵ ئەمانەشدا مەسەلەی ئامادەگیی خێڵگەرایی و دابونەریتی خێڵەکییانەش دێنە کایەوە و دەچنە سەر هۆکارەکانی تر کە باسمان کردن و بەسەریەکیشەوە بنەما سەرەکییەکانی توندوتیژی لە کوردستاندا دەستنیشان دەکەن.[2] لە چەند نووسینێکی تریدا ئەم خانمە ناسیۆنالیزمیش دەخاتە سەر لیستی هۆکارەکان و هێما بۆ ڕۆڵی ناسیۆنالیزم وەک دەزگایەکی پاتریارکی لە بەرهەمهێنانی توندوتیژیی

---

١ بۆ نموونە بڕوانە:
Mojab, Shahrzad. (2001). Conflicting Loyalties:Nationalism and Gender Relations in Kurdistan, in: Himani Bannerji et al. (eds.) Of Property and Propriety: The Role of Gender and Class in Imperialism and Nationalism. Anthropological Horizons, number 21. Buffalo, N.Y, University of Toronto Press.

٢ _بڕوانە:
Mojab, Shahrzad, ed. (2001a): Women of a Non-State Nation: The Kurds. Costa Mesa, California: MAZDA Publishers. p. 9.

ڕەگەزی لە کوردستاندا دەکات.[1] بە بۆچوونی ئەم خانمە، ناسیۆنالیزمی کوردی "وەک بزوتنەوە ناسیۆنالیستییەکانی تر بزوتنەوەیەکی پاتریارکییە، گەرچی بە قسە باس لە مەسەلەی یەکسانیی نێوان ڕەگەزەکانی کردوە و دەکات".[2] لە دیدی ئەم نووسەردا ئەم ناسیۆنالیزمە بەبەردەوامی داوای یەکێتی و یەکگرتنی ڕەگەزەکان و چینەکان و دینەکان دەکات، لە کاتێکدا مەسەلەی "ئازادیی ئافرەتان بەبەردەوامی بۆ ئایندە دوا دەخات".[3] بەکورتی ئەو دەزگا چەمکییەی ئەم نووسەرە بەکاری دەهێنێت بۆ خوێندنەوەی دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا، ئەوانە بوون کە هێمامان بۆ کردن.

نووسەرێکی دیکە کە لەسەر دیاردەی توندوتیژی دژ بە ژنان نووسینێکی زۆری هەیە، نەزەند بەگی خانییە، ئەم خانمەش وەک شارەزاد موجاب، پاتریارکیەت و خێڵگەرایی و ناسیۆنالیزم و ئیسلامی سیاسی وەک هۆکارە سەرەکییەکانی

---

١ _بڕوانە:

Mojab, Shahrzad (2000). 'The Feminist Project in Cyberspace and Civil Society.' Convergence 33(1-2): 106-19. See also: Mojab, Sh. (2001) Conflicting Loyalties: Nationalism and Gender Relations in Kurdistan, in: Himani Bannerji et al. (eds.) Of Property and Propriety: The Role of Gender and Class in Imperialism and Nationalism. Anthropological Horizons, number 21. Buffalo, N.Y.: University of Toronto Press. p. 9.

٢ _بڕوانە:

Mojab, Sh. and Abdo, N. (2004). Violence in the Name of Honour: Theoretical and Political Challenges. Istanbul: Bilgi University Press. p. 31.15 Ibid. p. 31.

٣ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣١.

توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ژنان لە کوردستاندا دەبینێت. ئەم نووسەرە لیستی هۆکارەکان لە یەکێک لە نووسینەکانیدا بەم شێوەیە ڕیز دەکات: "پاشماوەی بونیادی کۆمەڵایەتیی خێڵگەرای، ڕۆڵی بەهێز و سەرەکیی میلیتاریزم و بوونی کێشەیەکی نەتەوەییی چارەسەرنەکراو، هەروەها ئامادەگیی ئوسوڵیەتی ئیسلامیی."[1] لە پرۆژەی توێژینەوەیەکی دەستەجەمعیدا لەگەڵ چەند نووسەرێکی بیانیدا، نەزەند بەگی خانی و هاوکارەکانی، هەمان ئەو ڕوانینەی شارەزاد مۆجاب دووبارە دەکەنەوە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە پاتریارکیەت لە کۆمەڵگای کوردیدا "دینامیکەیتی هەرە سەرەکی و بنەڕەتیی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو جۆرە توندوتیژییەیە کە پەیوەندیی بە شەرەفەوە هەیە."[2] ئەم نووسەرە ئەو بۆچوونە گشتییە دووبارە دەکاتەوە کە پێی وایە پاتریارکیەت "لە هەموو ئاست و کایەیەکی کۆمەڵگادا ئامادەیە و ئەمەش وا دەکات نێرینەکانی ناو خێزان هەیمەنەکردن بەسەر ژنان و کۆنترۆڵکردنیان، بکەوێتە دەست."[3] جگە لەمە ئەم نووسەرە و هاوکارەکانی پێیان وایە

---

١ _بڕوانە:
Begikhani, N. (2005). Honour-based violence among the Kurds: The case of Iraqi Kurdistan. In Honour: Crimes, Paradigms and Violence against Women. (eds.) Lynn .Welshman and Sarah Hussain. Zed Books. p. 226

٢ _بڕوانە:
Begikhani, Nazand et al. (2010). Final report: Honourbased violence (HBV) and honour-based Killings in Iraqi Kurdistan and in the Kurdish diaspora in the UK. p. 51.

٣ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥١.

توندوتیژیی ڕەگەزی بەگشتی و توندوتیژییەک پەیوەندیی بە شەرەفەوە هەبێت بەتایبەتی: "ڕەگوڕیشەکانی لەناو واقیعی مادیدا بونیادی کۆمەڵایەتی و کولتوور و بەهای خێڵەکیی و عادات و تەقالیدایە، کە ئەمانیش تێکەڵ بوون بە دینامیکەیتی تایبەتی خەباتی ڕزگاریی نەتەوەیی و ئوسوڵیەتی دینیی."[1] ئەو دەزگا چەمکییەی ئەم خانمەش بەکاری دەهێنێت بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا کەم تا زۆر هەمان ئەو دەزگایەیە کە شارەزاد موجاب بەکاری دەهێنێت.

بێگومان ئەو چەمکانەی ئەم دوو خانمە بەکاری دەهێنن چەمکی تیوریی گرنگن بۆ لێکدانەوەی پەیوەندییە ڕەگەزییەکان و سیستمی جێندەر، gender order، لە هەرێمدا، هەروەها بۆ شیکردنەوەی چەند ڕەهەندێکی گرنگی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کۆمەڵگای کوردیدا. بەڵام لە نووسینی ئەو دوو خانمەدا بەکارهێنانی ئەو چەمکانە بۆ خوێندنەوە و تیوریزەکردنی دیاردەی توندوتیژی لە هەرێمدا دوو کێشەی سەرەکییان هەیە. یەکەمیان ئەوەیە لە زۆربەی نووسینەکانی ئەو دوو خانمەدا ئەم چەمکانە زۆر گشتی و ناکۆنکریتن، نیشتەجێ نەکراون لەناو ڕەوتە مێژوویی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی کۆمەڵگای کوردیدا و بە شێوازێکی تەواو نامێژوویی بەکار هاتوون. ئەو جۆرە داوەری و بۆچوونانەی لەو نووسینانەدا دەربارەی دۆخی توندوتیژیی ڕەگەزی لە کوردستاندا کراون و نیشان دراون، ئەوەندە گشتی و ناکۆنکریتن، دەشێت بەسەر چەندان کۆمەڵگا و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و مێژووی تردا، کە زۆر جیاواز بن لە مێژووی هەرێم، پیادە بکرێن. ئەوەی لەو

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥١-٥٣.

نووسینانەدا لەسەر توندوتیژی و دۆخی ژنان دەگوترێت، زۆر بەئاسانی دەشێت بۆ قسەکردن لەسەر چەندەها کۆمەڵگای تر و لە چەندەها کیشوەری جیاوازدا بەکار بهێنرێت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی کۆنکریتمان لەسەر توندوتیژیی لەو ژینگە جیاوازانەدا پێ بڵێت. هەموومان دەزانین کە فەرهەنگی پاتریارکیی یەکێک لە سەرچاوەکانی توندوتیژیی جەندەری، بەڵام ئەم فەرهەنگە لە هەر کۆمەڵگایەکدا بە شێوەیەکی تایبەت کار دەکات و بە شێوەیەکی تایبەتیش ئامادەیە. هەمووان دەزانین کە ناسیۆنالیزم چ وەک ئایدیۆلۆژیا و چ وەک بزوتنەوەی سیاسی، مەسەلەی ئافرەت بە مەسەلەیەکی سەرەکی نازانێت، بەڵام هەر ناسیۆنالیزمێک بە شێوەیەکی تایبەت کار دەکات و ئەم ناسەرەکیبوونە پیادە دەکات. بە کورتییەکەی ئەوەندە بەس نییە بڵێین پاتریارکیەت و ناسیۆنالیزم و دین بەرپرسن لە توندوتیژی دژ بە ژنان، ئەم دیدە گشتییە پێویستیی بە کۆنکریتکردن و بە نیشتەجێکردن هەیە لەناو مێژووی تایبەتی کۆمەڵگادا.

کێشەی دووهەم لە پەیوەندیدا بە دۆخی توندتیژیی ڕەگەزییەوە لە هەرێمدا، ئەوەیە کە ئەم گشتگیرییە ئەو ڕەوتە مێژووییە تایبەتە و سروشتی تایبەتی ئەو توندوتیژییە تەواو پشتگوێ دەخات کە لە ساڵی ١٩٩٠ەوە لە هەرێمدا دروست بووە. توندوتیژیی ڕەگەزی، وەک هەموو شێوازەکانی تری توندوتیژیی، تەواو گرێ دراوە بە کات و ڕەوتی مێژوویی تایبەتەوە و ماناکانیان بەپێی گۆڕانی ئەو شتانە گۆڕانی گەورەیان بەسەردا دێت. بۆ تێگەیشتن لەم گۆڕانانە و لە مانا جیاوازەکانیشیان پێوسیتە خۆمان لە سنووری قسەوباس

و داوەرییکردنێکی گشتییانەدا نەبەستینەوە و زۆر بەوردی سەیری ئەو دۆخ و هەلومەرج و ڕەوتە تازانە بکەین کە پەیوەندییە ڕەگەزییەکانی تیادا دروست دەبێت، هەوڵ بدەین لە مانا و شێوازە تازەکانی بەکارهێنانی توندوتیژی لەو ڕەوتانەدا تێبگەین. ئەمەش لە دۆخی هەرێمدا مانای ئەوەیە پێویستە زۆر بەوردی لەسەر دروستبوونی دونیای دوای ڕاپەڕین بوەستین و توندتیژیی ڕەگەزی لەناو وردەکارییەکان و گۆڕانکارییەکانی ئەو دونیایەدا نیشتەجێ بکەین.

ژنە نووسەرێکی دیکە بە ناوی مینۆ ئالینیا لە کتێبێکدا کە ساڵی ٢٠١٣دا بە زمانی ئینگلیزی بڵاو بۆتەوە بەدرێژیی لەسەر دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی لە هەرێمی کوردستاندا دەوەستێت. بە بەراورد بە نووسینەکانی شارەزاد موجاب و نەزەند بەگی خانی، ئەم کتێبە هەم وردەکاریی زیاتری تێدایە و هەم لە ڕووی تیۆرییشەوە لەوان دەوڵەمەندتر و ئاڵۆزتر و کامڵترە. مینۆ ئالینیاش توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان و چەوساندنەوەیان لە هەرێمی کوردستاندا بە هەمان ئەو هۆکارانەی سەرەوەوە گرێ دەدات کە نووسەرەکانی دیکە باسی دەکەن. ئەمیش وەک ئەوان ئەم توندوتیژییە دەکاتە دەرەنجامی چەوساندنەوەی ئەتنیی و نەتەوەیی، دەیبەستێتەوە بە پرۆژەی ناسیۆنالیزمی کوردی خۆیەوە و گرێی ئەدات بەو ژینگە دووروودرێژەی جەنگی بەردەوامەوە کە لە کوردستاندا ئامادە بووە. هاوکات پەراوێزخستنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئاوارەبوون، کردەی بەمیلیتاریزەکردن، ڕۆڵی دین و پاتریارکیەت، بونیادیی خێڵەکی و خزمخواهییش وەک ڕەگوڕیشەکانی دیاردەی توندوتیژی دژ بە ژنان وێنا دەکات.

ئـەوەی ئـەم نووسـەرە لـە لێکۆڵەرەوەکانـی تـر جیـا دەکاتـەوە ئەوەیـە لـە لێکدانـەوەی تاوانەکانـی شـەرەفدا تەنهـا ئـەو قسـە گشـتییانە دووبـارە ناکاتـەوە کـە لای دوو نووسـەرەکەی تـر بـە بەربـڵاوی ئامـادەن، بەڵکـو لـە ڕێـگای چاوپێکەوتـن و کۆکردنـەوەی زانیاریـی وردەوە کۆنکریتانەتـر کار دەکات و شـیی دەکاتـەوە. هـاوکات ئـەم نووسـەرە چەمکـی "پیاوەتـی" یـان ڕجولـەت یـان masculinity، کە چەمکێکی گرنگی بواری لێکۆڵینـەوە جێندەرییەکانـە، بـەکار دەهێنێـت بـۆ تێگەیشـتن لـە دیـاردەی توندوتیژیـی لـە هەرێمـدا. ئـەم خانمـە مەسـەلەی تۆڵـەی شـەرەف یـان کوشـتن لـە پەیوەندیـدا بـە شـەرەفەوە، گرێ ئەدات بە بوونـی "گوتارێکـی هەژموونگەرەوە سـەبارەت بـە شـەرەف" لـەلای ئـەو کەسـانەی لـە کوردسـتاندا ژنەکانیـان دەکـوژن. ئـەم گوتـارە باڵادەسـتە دەربـارەی شـەرەف توانـای ئـەوە مەیسـەر دەکات کـە ژیانـی سێکسـی و جەسـتەی ئافـرەت بـە شـێوەیەکی بەرفـراوان کۆنتـرۆڵ بکرێـت. بـە بۆچوونـی ئـەم نووسـەرە، ژنکوژەکان "شوناسـی ڕەگەزیـی خۆیـان و ڕوانینـان بـۆ پیاوبوونـی خۆیـان لەنـاو ژینگەیەکـدا دروسـت کـردوە کـە پڕە لـە چەوسـاندەوەی ئەتنی و کردەی بەرگرییکردن، جەنگ و ململانێی چەکداریی، هەروەهـا لـە ژینگەیەکدا کـە توندوتیژی وەک تاکـە ئەگەرێکـی بەلاداخسـتن و چارەسـەرکردنی ململنێـکان ئامادەیـە."[1] بـە مانایەکـی دیکـە گوتـاری "پیاوەتیـی باڵادەسـت" و هەژمونگـەر، گوتارێکـە لـەو ژینگەیـەدا دروسـت

---

1 _Alinia, Minoo (2013). Honor and Violence against Women in Iraqi Kurdistan. New York. Palgrave Macmillan.p. 81.

بووە کە پڕە لە توندوتیژی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و بەرگریکردنی توندوتیژ بەرامبەر بەم چەوساندنەوەیە. لە دیدی ئەم نووسەرەدا ئەم گوتارە سەبارەت بە پیاوەتی ڕوانینێکی بۆ شەرەف سەروەر کردوە کە کۆنترۆڵکردنی لەشی ئافرەت بنەما سەرەکییەکەیەتی. خاڵێکی بەهێزی تری کتێبەکەی مینۆ ئالینی ئەوەیە کە لە دید و دەسپێکی زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە نووسراوە، دید و دەسپێکێک کە دیاردەی توندوتیژی بە تەفاسیلەکانی ئەو ژینگە و هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە گرێ ئەدات کە لەئارادایە، بە مەسەلەی بەستنەوەی چەوساندنەوەی ئافرەتانەوە بە کارلێک و کارلێکی پێچەوانەی جیاوازی چەندان بونیادی تایبەتیی دەسەڵاتەوە، نەک ئەوەی بیبەستێتەوە بە "سروشت" یان "ئاکار"ی تاکەکەس و گروپەکانەوە.

یەکێک لەو خاڵە سەرەکییانەی کە کتێبەکەی مینۆ ئالینی لە سەرجەمی کارەکانی تر جیا دەکاتەوە گرنگیدانی ئەم نووسەرەیە بە دیاردەی خۆکوشتنی ژنان لە کوردستاندا. ئەم خانمە فەسڵێک لە کتێبەکەی تەرخان دەکات بۆ ئەم دیاردە بەرفراوانەی ناو هەرێم. لە پەیوەندیدا بە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەم دیاردەیەشەوە دەکرێت هێما بۆ دوو خاڵی سەرەکی لای ئەم نووسەرە بکەین. یەکەمیان، مینۆ ئالینی دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان بە پاشخانی لادێیی و خێڵەکی و ناشاریی ئافرەتەکانەوە دەبەستێتەوە، کە دوای جێگۆڕکێیان دەشێت لە ئێستادا هەم لەناو شارەکاندا و هەم لە دەرەوەی شارەکاندا، واتە لە لادێکاندا، بژین.[1] بە بۆچوونی ئەم نووسەرە

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١.

خۆکوشتنی ئافرەتان "دەرەنجامی ویرانکردن و ڕاگواستنی لادێکانی کوردستانە لە سەردەمی دەسەڵاتداریتیی بەعسدا" و دەرەنجامی "لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی بونیادە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان و تێکەڵبوونیان بە هەژاری و پەراوێزکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووریی"ە.[1] دووهەم، ئەم خانمە خۆکوشتن وەک دەرەنجامی ئامێزانبوونێکی کۆمەڵایەتیی تەواوی ئافرەتان و قبووڵکردنی تەواویان بۆ بەها و نۆرمە پاتریارکییە کۆنترۆڵکەرەکانی کۆمەڵگای کوردی دەبینێت، واتە بەهاکانی پاتریارکیەت بە ڕادەیەک بەهێزن، کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەلایەن ئەو ئافرەتانەوە بەناوەکی کراون و قبووڵ کراون، ئەوانەش کە خۆیان دەکوژن، جگە لە کردەی خۆکوشتن، ئامرازێکی دیکەیان لەبەردەمی فشاری ئەو بەهایانەدا بۆ نەماوەتەوە. لە دیدی ئەم نووسەرەدا کۆمەڵێک "هۆکاری مێژوویی و سیاسی هەن وایان کردوە بونیادە خێڵەکی و خزمخواهییەکان بەهێز بن" و لە دەرەنجامدا وا بکەن "ژیانی ئافرەتان پڕ ڕیسک و مەترسیی گەورە بێت."[2] بە گەڕاندنەوە بۆ ئەو پۆلینکارییەی کۆمەڵناسی فەرەنسی: ئیمیلی دۆرکهایم بۆ دیاردەی خۆکوشتنی دەکات، ئەوەی مینو ئەلینیا باسی دەکات دەکەوێتە خانەی ئەو شێوازە لە خۆکوشتنەوە کە دۆرکهایم ناوی " خۆکوژیی جەبری" یان "قەدەری"ی لێ دەنێت، fatalistic suicide.[3]

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣١-١٣٢

٢ _هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٤٣.

٣ بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم خاڵە بڕوانە:

Durkheim, Emile (1951) Suicide: A Study in Sociology. Free Press, Glencoe, Illinois.

سەبارەت بە خاڵی یەکەمی لێکدانەوەکانی مینۆ ئالینی بۆ خۆکوشتنی ئافرەتان، واتە سەبارەت بەو خاڵەی کە دیاردەی خۆکوشتن بە پاشخانی لادێ و هەژارییەوە گرێ ئەدات، دەکرێت بڵێین: ئەو ئامارانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا کۆ کراونەتەوە ئەوەمان نیشان ئەدەن کە خۆکوشتن لە هەرێمی کوردستاندا بە پلەی یەکەم دیاردەی شارە گەورەکانی کوردستانە، نەک دیاردەی لادێکان، زۆرینەی هەرەزۆری ئەوانەی خۆیان دەکوژن نیشتەجێی شارە گەورە و بچووکەکانن. جگە لەمە، زۆربەی ئەو ئافرەتانەی خۆیان دەکوژن خوێندەوارن و زۆر جار قۆناغی ناوەندییان تەواو کردوە، زۆرینەشیان هەژار نین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دۆخی ئابووری و ئاستی ژیانیان یان مامناوەندییە یان باشە و لە هەندێک دۆخیشدا زۆر باشە. سەبارەت بە خاڵی دووهەمیش، من لە لاپەڕەکانی داهاتوودا نیشانی ئەدەم، کە ناکرێت دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان لە هەرێمدا کورت بکرێتەوە بۆ ئەو فۆرمەی خۆکوژی، کە دۆرکهایم ناوی "خۆکوژیی جەبری" لێ دەنێت. لای دۆرکهایم "خۆکوژیی جەبری" ئەو شێوازەی خۆکوژییە کە پەیوەندیی بەوەوە هەیە تاکەکەسەکان بەتەواوی لەناو نۆرم و بەها و یاسا باڵادەستەلانی کۆمەڵگادا تواونەتەوە و سەرجەمی ئەو بەها و نۆرم و یاسایانەیان بەتەواوی قبووڵ کردوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە نیشانی ئەدات کە فۆرمی تری خۆکوشتن لە کوردستاندا هەیە کە پەیوەندییان بە پلەی یەکەم بە پرۆسەی "شلەژانی پێوانەیی"ەوە هەیە، واتە پەیوەندیی بە پەککەوتنی تەواوی پێوەرە میعیارییەکانەوە هەیە، بە پەککەوتنی سیستمی بەها

و نۆرم و نرخەکانەوە نەک قبوولکردن و توانەوە لەناویاندا. بە مانایەکی دیکە خۆکوشتنی ئافرەتان تەنها دەرەنجامی بەهێزی و قووڵیی دیسپلین و زۆریی سنووردانانەکانەوە، overregulation، نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە شڵەژان و پەککەوتنی پێوەرە گشتییەکانیشەوە هەیە. دەکرێت هەر بە گەڕانەوە بۆ شێوازە جیاوازەکانی خۆکوشتن لای دۆرکهایم باس لەو شێوازەی تری خۆکوشتن لە هەرێمدا بکەین کە دۆرکهایم ناوی خۆکوشتن وەک دەرەنجامی "ئانۆمی"، anomie، لێ ناوە. ئانۆمی بە مانای سەرلێشێوانی بەهایی و ئەخلاقی و کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگادا تا ڕادەی نەمانی بەهاکان و پێوەرەکان.

بەکورتی خاڵی هاوبەشی زۆرێک لەو ئەدەبیاتەی لەسەر دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ژنان لە کوردستاندا نووسراوە، پەیوەستە بە پێداگرتنەوە لەسەر مێژووی چەوساندنەوەی ئەتنی و نەتەوەیی، پێداگرتن لەسەر جەنگ، میراتی کۆلۆنیالیزم، داگیرکردن و بەمیلیتاریکردنی کوردستان، مەسەلەی خێڵەکی و بالادەستیی پاتریارکیەت و ڕۆڵی دین و ئیسلامی سیاسی. بێگومان لە ڕاڤەکردنی دیاردەی توندوتیژییدا گرنگە مرۆڤ پاشخانە مێژوویییە دێرینەکەی ئەو توندوتیژییە ببینێت و تێبگات و کاریگەریی ئەو میراتە مێژوویییە درێژەش لەسەر دۆخی ئێستا بەرچاو بگرێت. بەلام ئەوەی پێویستە ئاگامان لێ بێت ئەوەیە ئەم گەڕانەوەیە بۆ دواوە نەبێتە هۆی ئەوەی ئێستا نەبینین، واتە ئەو مێژووە ئامادە و بەردەست و هەنووکەیییە پشتگوێ نەخەین کە لە ئێستا و لێرەدا دروست دەکرێت. ئەمەش مانای ئەوەی ئەو

ژینگە ڕاستەوخۆیە پشتگوێ نەخەین کە دیاردەی توندوتیژی دژ بە ژنان لەناویدا ڕوو دەدات. وەک ئەم لێکۆڵینەوەیە نیشانی ئەدات، ئەم ژینگەیەش مێژووی دێرینی کۆمەڵگای کوردی نییە، بەڵکو ژینگەی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگییە بەرفراوانەیە کە لە سەرەتای سالانی نەوەدەوە تا ئەمڕۆ لە کوردستاندا هاتۆتە کایەوە. ئەو ڕۆژگارەیە کە کوردەکانی باشوور لەوەدا سەرکەوتوون جۆرێک لە دەسەلاتدارێتیی سەربەخۆ دروست بکەن بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکەی خۆیان.[1] بەم مانایە ئەو نووسینانەی باسم کردن بە شێوەیەکی گشتی تەنها گرنگییان بەو مێژووە داوە کە فێرناندۆ برۆدێل ناوی "مێژووی دوورخایەن"ی لێ دەنێت، longue durée، کە بێگومان لە دۆخی مێژووی کوردا مێژووی چەوساندنەوەی ئەتنی و نەتەوەیی، مێژووی جەنگ و پێکدادان: مێژووی بەرگریی چەکدارە. بەلام ئەو نووسینانە لەسەر ئەو دوو شێوازەی تر لە مێژوو ناوەستن، کە برۆدێل ناویان دەنێت: "مێژووی کورت" و "مێژووی مامناوەندی" event و conjoncture. کە باس لە "مێژووی مامناوەندی"ی هەرێمی کوردستان دەکەم، باس لە مێژووی ئەم هەرێمە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دەکەم، کە مێژوویەکە لە ٢٥ ساڵ نزیک دەبێتەوە و ئاکاری سەرەکیی ئەم مێژووە

---

١ _هەموو ئەو نووسیانەی هێمایان بۆ کراوە باس لەو گۆڕانکارییانە دەکەن کە حکومەتی هەرێم و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لە دۆخی ژناندا دروستی کردوە، لەوانەش گۆڕانی یاساکان، دروستکردنی پەناگا، شێلتەر، دروستکردنی لیژنە و گروپی تایبەت، هتد... بەلام تاکە لێکۆڵینەوەیەک نابینین بە شێوەیەکی سیستماتیک گرنگی بە گۆڕانکارییە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین دابێت.

بوونـی دەسـەڵاتێکی سـەربەخۆی کوردیـی خۆماڵییە، کـە لـەو چارەکەسـەدەیەدا چەنـدان پرۆسـەی جیـاوازی خسـتۆتەوە، کـە توندتیـژی یەکێـک لـە دەرەنجامـە ترسـناکەکانیانە. کـە بـاس لـە "مێژووی کورت"یش دەکەم، هێمـا بـۆ مێژووی دونیـای دوای سەدام حوسـەین لـە سـاڵی ۲۰۰۳ەوە دەکەم. لـەم ڕووەوە ئـەو گریمانەیـەی ئـەم لێکۆڵینـەوە بەرگـری لـێ دەکات ئەمەیـە: بـۆ تێگەیشـتن لـە دیـاردەی توندوتیژیـی ڕەگـەزی دژ بـە ژنـان لـە کوردستاندا، بەتایبەتی بۆ تێگەیشتن لە دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتـان، ئـەوەی لـە هەمووشـتێک پێویسـتترە: شـیکردنەوە و لێکدانـەوەی ئـەو مێژووە کـورت و مامناوەندییەیـە کـە ژینگـەی ڕاسـتەوخۆی شـێوازە جیاوازەکانـی توندوتیژین، بە توندوتیژیی ڕەگەزییشـەوە. خۆخەریککـردن و قەتیسـبوون لەنـاو مێـژووی دووری چەوسـاندنەوەی نەتەوەیـی و ئەتنیـدا مەترسـیی ئـەوە دروسـت دەکات لەنـاو "پارادایمێکـی ناسیۆنالیسـتی"دا گیـر بخۆیـن کـە هەمـوو خراپەکارییـەکان و هەمـوو توندوتیـژی و ناهەقییـەکان بـە مێژووی داگیرکردن و چەوسـاندنەوەی ئەتنی و نەتەوەییـەوە ببەسـتینەوە. بەمـەش ئـەو مێژووە درێژە بکەیـن بـە عەلاگەیەکـی ناسیۆنایسـتی و هەمـوو کێشـەکانی دونیـا ئەمڕۆمانـی پێدا هەڵبواسـین، بەمـەش پەردەیـەک بەسـەر کێشـە گەورەکانـی مێـژووی چارەکەسـەدەی حوکمڕانیـی خۆماڵـی و خودموختـاردا دابدەیـن، کـە ژینگـەی ڕاسـتەوخۆی پیادەکردنـی توندوتیژییەکانـە.

لـە بەشـێکی زۆری ئـەو ئەدەبیاتـەدا کـە بـاس لـە دونیـای دوای ۱۹۹۱ هەرێمـی کوردسـتان دەکات وێنەیەکـی تـا ڕادەیەکـی زۆر پۆزەتیڤ بۆ هەرێم و گۆڕانکارییەکانی دەکێشـرێت، وێنەی

سەردەمی سەرکەوتنی ڕێژەیی کورد، بۆ نموونە لەوەدا کە خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، هەڵبژاردن ڕێک بخەن، پەرلەمان دروست بکەن، حکومەت پێک بهێنن، ژێرخانی ئابووریی دروست بکەن، هتد...[1] لەدوای هێرشەکەی ئەمریکا و کۆتاییهێنانیش بە دەسەڵاتی سەدام حوسەین لە عێراقدا، کوردستان لە زۆرێک لە میدیاکاندا وەک "عێراقەکەی تر"، واتە عێراقە ئارام و ئاساییش و دیموکراس و پێشکەوتووەکە نمایش دەکرێت. ئەم لێکۆڵینەوەیە ناکەوێتە داوی دووبارەکردنەوەی ئەم وێنە بەهەشتییە ناڕاستەوە بۆ هەرێمی کوردستان و لەباتیی ئەمە هەوڵ ئەدات پرۆسە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگییە سەرەکییەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین و دونیای دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین لە کۆمەڵگای کوردیدا شی بکاتەوە. ئەو پرۆسانەی کە ئەو ژینگە سەرەکی و بنەڕەتییە دروست دەکەن کە تیایدا دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لە هەرێمدا پیادە دەکرێت. وەک پێشتر وتمان ئەم پرۆسانە ئەو سەرلێشێوان و "شڵەژانە پێوانەیی"ەیان دروست کردوە کە هێمامان پێ کرد. با وەک سەرەتایش بڕوانینە یەکێک لە قەیرانە هەرە سەرەکییەکانی ناو ئەم دونیا تازەیە، کە سەرچاوەیەکی گرنگیی سەرلێشێوان و "شڵەژانی پێوانەیی"ە لە هەرێمدا، مەبەستم قەیرانە لە "پیاوەتیی باڵادەست"دا،

---

١ بڕوانە:
McDowall, David (2001). The Kurds: A Nation Denied. London, Minority Rights Publication. See also: Kerim Yildzi (2007). The Kurds in Iraq: The Past, Present and Future. Pluto Press. London.

قەیرانـە لـە ماناکانـی پیاوەتـی و پیاوبوونـدا، ئایـا چ جـۆرە پیاوەتییـەک پیاوەتیـی باڵادەسـتی دونیـای دوای ڕاپەڕینـە. بەشـێکی گرنگـی دیـاردەی سەرلێشـێوان و شـڵەژانی پێوانەیـی لـە هەرێمـدا لـە قەیرانـی مانـا و دەلالەتەکانـی ئـەو پیاوەتییـە باڵادەسـتە خـاوەن هەژموونـەدا دەر دەکەوێـت، کـە سـاڵانێکی درێژ لـە هەرێمـدا ئامـادە بـووە. ئـەم قەیرانـە یەکێکـە لـە قەیرانـە سـەرەکییەکانی دونیـای دوای ڕاپەڕیـن لـە کۆمەڵـگای ئێمـەدا و یەکێکـە لـە پێکهاتـە سـەرەکییەکانی نـاو ئـەو ژینگەیـەی کـە توندتیژیـی تیـادا دروسـت دەبێـت. بـا کەمەکێـک وردتـر لەسـەر ئـەم قەیرانـە بوەسـتین.

**قەیرانی پیاوەتیی باڵادەست لە هەرێمدا**

وەک هێمامـان پـێ کـرد یەکێـک لـە ڕەهەنـدە بەهێزەکانـی کتێبەکـەی مینـۆ ئالینیـا، گەڕانەوەیـە بـۆ چەمکـی "پیاوەتـی" masculinity، بـۆ شـیکردنەوەی دیـاردەی توندوتیژیـی ڕەگـەزی دژ بـە ژنـان لـە هەرێمـدا.[1] ئـەم نووسـەرە لـە هەرێمـدا

---

١ _لەم چەند ساڵەی دواییدا گرنگیدان بە چەمکی پیاوەتی بۆ شیکردنەوەی پەیوەندییـە ڕەگەزییـەکان و بـۆ قسـەکردن لەسـەر کێشـە کۆمەڵایەتـی و سیاسییەکان لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، ڕەهەندێکی فراوانی وەر گرتـوە و ژمارەیەکی زۆر لێکۆڵینـەوە لـەم بارەیـەوە ئەنجـام دراون، هـەرە دیارەکانیان ئەمانەن:

Ghoussoub, Mai and Emma Sinclair-Webb, eds. (2000). Imagined Masculinities: Male Identity and Culture in the Middle East. London: Saqi Books. Lagrange, Frederic (2000). Male Homosexuality in Modern Arabic Literature. In: Imagined Masculinities: Male Identity and Culture in the Middle East, (eds.) Mai Ghoussoub and Emma Sinclair-

چاوپێکەوتنی لەگەڵ ژمارەیەک لەو کەسانەدا ئەنجام داوە کە بەشدار بوون لە ئەنجامدانی تاوانی کوشتنی ئافرەتان بە هۆی شەرەفەوە. ئەم چاوپێکەوتنانە ئەو پەیوەندییە بەهێزە نیشان ئەدات کە لەنێوان "گوتاری باڵادەست دەربارەی شەرەف" و مەسەلەی بەکارهێنانی توندوتیژیی لای پیاوی کورد لەئارادایە. ئەم گوتارە سەبارەت بە شەرەف وێنەیەکی پیاوبوون و پیاوەتی بەرهەم دەهێنێت کە بە بۆچوونی ئەم خانمە پەیوەندییەکی پتەوی بە مەسەلەی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە هەیە.[1] لەم ڕوانینەدا بۆ پیاوەتی، پاراستنی شەرەف بەشێکە لە وێناکردنی پیاو بۆ شوناسی خۆی و شەرف خۆشی شتێکە پیاو پێویستە بە هەر نرخێک بووە لە هەموو دۆخێکدا بەرگریی لێ بکات، لەم بەرگرییەشدا سڵ لە

Webb. London: Saqi Books. Inhorn, Marcia C. forthcoming (2012). The New Arab Man: Emergent Masculinities and Islam in the Middle East. Princeton: Princeton University Press. Aghacy, Samira (2009). Masculine Identity in the Fiction of the Arab East since 1967. Syracuse: Syracuse University Press. Al-Samman, Hanadi (2008). 'Out of the Closet: Representation of Homosexuals and Lesbians in Modern Arabic Literature'. Journal of Arabic Literature 39(2): 270-310. El-Rouayheb, Khaled (2005). Before Homosexuality in the Arab-Islamic World, 1500-1800. Chicago: University of Chicago Press. Jacob, Wilson C. (2011). Working Out Egypt: Effendi Masculinity and Subject Formation in Colonial Modernity, 1870-1940. Ouzgane, Lahoucine, ed. (2006). Islamic Masculinities. New York: Zed Books.

١ _بڕوانە:

Alinia (2013). p. 81.

پەنابردن بۆ بەکارهێنانی هیچ شێوازێکی توندوتیژی نەکاتەوە، تا بە کوشتنیش دەگات. لە هەمان کاتدا ئەم نووسەرە ئەوە نیشان ئەدات چۆن گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردی ئافرەت یان دایک وا نمایش دەکات وەک ئەوەی نەک تەنها هەڵگری شەرفی پیاوە، بەڵکو هەڵگری شەرەفی نەتەوەشە. هاوکات ئەم ناسیۆنالیزمە پیاوی کورد وەک پارێزەر و بەرگریکەر و فیداکار لەپێناوی ئافرەت و دایک و نەتەوەدا نمایش دەکات. لەم وێنەیەدا دایک یان ژن ڕەمزی ئەو نیشتیمانەن کە دەبێت بەرگری لێ بکرێت و بپارێزرێت لەلایەن پیاوی کوردەوە و پیاوی کوردیش وەک ئەو کەسە نمایش دەکرێت کە بەرگری لە نیشتیمان و شەرەفی کورد و ژن و منداڵانی کورد دەکات. ئەم نووسەرە تەنها پێ لەسەر باڵادەستبوونی ئەم گوتارە ناسیۆنالیستییە و ئەو ڕوانینە تایبەتە بۆ شەرف داناگرێت، بەڵکو باڵادەستبوونیشی وەک دەرەنجامی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە و بڵاوکردنەوەیەکی بەرفروانی ئەم گوتارە دەبینێت، تەنانەت لە "حیکایەتی زارەکی و کولتووری میللی و ئەدەبیاتدا."[1] ئەو ژینگە و ڕەوتەش کە ئەم گوتارەی دەربارەی شەرەف باڵادەست کردوە و وێنە باڵادەستەکانی پیاوەتیی تیادا دروست و بەهێز بووە دەبەستێتەوە بە چەوساندنەوەی ئەتنی و کردەی بەرگریکردنەوە، بە جەنگ و ململانێی چەکدارییەوە، هەروەها بە ڕەوتێکەوە کە تیایدا توندوتیژی وەک تاقە ئامرازێکی چارەسەرکردنی ململانێکان ئامادەیە."[2] لەم ژینگەیەدا "پیاوان ڕۆڵی پارێزەری شەرەف

---

١ +_هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٤.

٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨١.

و بەرگریکار لە سیستمی پاتریارکیەت، یان باوکسالارییان، بە خۆیان بەخشیوە."[1] بەکورتی ئەم خانمەش مەسەلەی بالادەستبوونی ئەو گوتارە لەسەر شەرەف، ئەو وێناکردنە تایبەتە بۆ پیاوبوون و پەیوەندیی ئەم پیاوبوونە بە پاراستنی شەرەفەوە بە مێژووی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و خەباتی چەکداری دژ بەم چەوساندنەوەیەوە دەبەستێتەوە.

بێگومان هەموو ئەم شتانە لە ڕووی مێژووییەوە ڕاستن و قابیلی گومانلێکردن نین، ئەم شێوازە ڕوانینەش بۆ چۆنیەتیی لێکدانەوەی دروستبوونی "پیاوەتیی بالادەست" ڕوانینێکی ڕاست و دروستە. هاوکات دەشێت ئەم شێوازە لە "پیاوەتیی بالادەست" لە کوردستاندا وردتر بکەینەوە و بە "پیاوەتیی پێشمەرگانە" ناوی ببەین، peshmarga masculinity. بەڵام پرسیاری سەرەکیی ئەوەیە ئایا بەڕاستی "پیاوەتیی بالادەست" یان "پیاوەتیی پێشمەرگانە" تا ئێستاش شێوازی بالادەستیی پیاوەتییە لە کوردستاندا؟ ئایا لەنێوان ساڵە درێژەکانی نێوان ١٩٩١ و ٢٠١٤دا هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر ئەم شێوازە لە پیاوەتییدا و بەسەر ئەم تێگەیشتنەدا بۆ پیاوەتی نەهاتووە؟ پرسیارە جەوهەرییەکە ئەمەیە: ئایا بەڕاست "پیاوەتیی پێشمەرگانە" هێشتا پیاوەتیی بالادەستە لە دونیای دوای ١٩٩١دا؟ یان بە پێچەوانەوە ئەم شێوازە لە پیاوەتی تووشی قەیرانێکی هەمەلایەن و قووڵ و بەرفراوانی هەیمەنەکردن بۆتەوە؟ ئایا "شێوازی تری پیاوەتی" دروستبوون یان لە دروستبووندان کە تەحەدای "پیاوەتیی پێشمەرگانە" بکەن؟ ئایا ناکرێت بەشێک لەو

---

[1] _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨١، ٨٢.

توندوتیژییەی دژ بە ژنان لە کوردستاندا ڕوو دەدات، ڕەنگە بەشێکی گەورەشی، بدەینە پاڵ قەیرانەکانی "پیاوەتیی پێشمەرگانە" نەک باڵادەستبوونی "پیاوەتیی پاتریارکییانە"؟

بەر لەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە با وەکو هەنگاوی یەکەم کەمەکێک چەمکە سەرەکییەکان پێناسە بکەین و نیشانیان بدەین بە چ مانایەک لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەکار هاتوون، لە پێش هەموانیشەوە چەمکی پیاوەتی. چەمکی "پیاوەتی" Masculinity، هێما بۆ ماناکانی نێربوون و شوناسی نێربوون لە کۆمەڵگادا دەکات، زۆربەی جاریش وا دەبینرێت کە چەمکێکی پەیوەندیدار بێت و لە ڕووی ڕەگەزییەوە ڕووی لە ڕەگەزەکەی تر، واتە ڕەگەزی مێ بێت. بەم مانایە "پیاوەتی" هەمیشە لە پەیوەندیدا بە "ژنبوون"ەوە پێناسە دەکرێت و پێناسەی "نێربوون" هەمیشە دەچێتە پەیوەندییەکی تایبەتەوە بە پێناسەی "مێبوون"ەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە پیاوەتی دیاردەیەکی سروشتیی نییە، شتێک نییە پێشوەخت و بەر لە دروستبوونی پەیوەندییەکان ماناکانی دەستنیشان کرابێت، بەڵکو پیاوەتی دروستکراو و بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە و ئەوەشی شێوازەکان و ماناکانی پیاوەتی دەستنیشان دەکات، کردەی کۆمەڵایەتیی پیاوەکان خۆیان و ئەو پەیوەندییانەیە کە دروستی دەکەن، یان لەناو پەیوەندیی دیاریکراوی هێز و دابەشکردنێکی دیاریکراوی دەسەڵاتدا، دەیسەپێنن. پیاوەتی وەک چۆن دروستکراوێکی کۆمەڵایەتییە ئاواش دروستکراوێکی پارێزراوە، ماناکان و شێوازە باڵادەستەکانی دەپارێزرێن، ئەو ئامرازانەشی بۆ پاراستنی بەکار دێن فرەجۆرن، کە یەکێک لەوانە فۆرمە

جیاوازەکانی توندوتیژییە. ئەم توندوتیژییەش هەم ڕووی لە پیاوان خۆیەتی، واتە ئەو شێوازانەی پیاوبوون بێدەنگ، یان پەراوێز یان سەرکوت دەکەن کە بە "پیاوەتیی ناڕاست" دادەنرێن، هەم ڕووی لە ژنانیشە وەک جۆرێک لە بوونی ئینسانی و کۆمەڵایەتی، کە کەمترە لە بوونی پیاو. لە زیاد لە بوارێکی زانستیدا و زیاد لە زانایەکی کۆمەڵایەتییش ئەو ڕاستییەیان سەلماندوە کە فۆرمە جیاوازەکانی "پیاوەتی" هەڵگری بڕی تایبەت لە توندوتیژین دژ بە ژنان.[1] بەڵام پیاوەتی تەنها یەک شێوەی لە کۆمەڵگادا نییە، بەڵکو زیاد لە شێوەیەکی هەیە و شێوە هەرە باڵادەستەکەیان لە ئەدەبیاتی زانستیدا ناوی "پیاوەتیی باڵادەست" واتە Hegemonic masculinityی لێ نراوە. "پیاوەتیی باڵادەست" هێما بۆ ئەو شێوازە لە پیاوەتی دەکات کە بە گرنگترین و بەشەرەفترین شێوازی پیاوبوون لە کۆمەڵگادا دادەنرێت. واتە هێما بۆ ئەو جۆرانە لە پیاوبوون دەکات کە کۆمەڵگا وەک شێوازی بەرز

---

١ _بڕوانە:

Dobash, R. ( 1998). ‘Separate and intersecting realities: A comparison of men’s and women’s accounts of violence against women’. Violence against women: An International and Interdisciplinary Journal. pp. 382:414. Anderson, Kristin L. and Debra Umberson (2001). ‘Gendering violence: masculinity and power in men’s account of domestic violence’. Gender and Society 15:358- 80. Atkinson, Maxine P., Theodore N. Greenstein and Molly Monahan Lang (2005). ‘For women, breadwinning can be dangerous: Gendered resource theory and wife abuse’. Journal of Marriage and Family 67:1137-48.

و بەنرخ و پڕبەها وێنایان دەکات. "پیاوەتیی باڵادەست" هێما بۆ ئەو ئایدیالە کولتوورییانە دەکات کە هێز و بەهایەکی گەورەی پێوانەیی و توانایەکی گەورەی ئاساییکاریان هەیە. هێز و بەهای پێوانەیی بە مانای ئەوەی ئەو شێوازە لە پیاوەتی دەبێت بەو پێوەرەی کە پیاوبوون یان پیاونەبوون، واتە ناپیاویی پێ دەپێورێت. ئاساییکاریش بە مانای ئەوەی پێناسی ئەوە دەکات چ جۆرە پیاوەتییەک ئاساییە و چییش شاز و نائاساییە، کام جۆر لە پیاوەتی پێویستە لە ئامێز بگیرێت و نابێت لێی لا بدرێت، چییش هەڵە و نەشیاوە و پێویستە لەناو ببرێت یان بێدەنگ و پەراوێز بخرێت. بەکورتی، پیاوەتیی باڵادەست ئەو ئایدیالە کولتوورییانە نیشان ئەدات کە وەک پێوەری جیاکردنەوەی پیاوەتیی ڕاستەقینە لە پیاوەتیی ناڕاست و پیاوەتیی ئاسایی لە پیاوەتیی نائاسایی کار دەکەن.[1] نیشانی ئەدەن کێ پیاوە و کێ ناپیاوە، کێ وەک پیاو مامەڵە بکرێت و کێ وەک کەمتر لە پیاو ببینرێت. بێگومان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا شێواز و مۆدێلی جیاوازی کار و کردەوەی پیاوانەی بەرزنرخێندراو و پڕبەها بوونی هەیە، کە هەریەکەیان "مۆدێلێکی تایبەتی پەیوەندیکردن بە ئافرەتانەوە و مۆدێلی تایبەتی چارەسەرکردنی پەیوەندییەکانی نێوان نێر و مێ پێشکەش دەکات."[2] واتە پیاوەتی شتێکی

---

١ _بڕوانە:
Connell, R. W. (2005). Masculinities. Berkeley, Los Angeles, California. University of California Press. p. 849
2 _Connell, R. W. and James W. Messerschmidt (2005). 'Hegemonic Masculinity: Rethinking the Concept'. Gender and Society 19 (6): 838.

داخراو نییە بەسەر خۆیدا، بەڵکو هەمیشە لە پەیوەندیدایە بە ژنبوونەوە و شێوازە جیاوازەکانی پیاوەتییش شێوازی جیاوازی ژنبوون دروست و پێشنیار دەکەن.

وەک وتمان ڕۆژگارێکی درێژ "پیاوەتیی پێشمەرگانە" شێوازی باڵادەستی پیاوەتی و مۆدێلی ئایدیالی بێخەوشی پیاوەتیی ڕاستەقینە بوو لە هەرێمدا. "پیاوەتیی پێشمەرگانە" ئەو ئایدیالە کولتوورییە بوو کە وەک ژێرخانێکی فەرهەنگی ئامادە بوو و مانا و وێنە و دەلالەتەکانی پیابوونی ڕاستەقینەی دەستنیشان دەکرد. ئەم شێوازە لە پیاوەتی شێوازێکی شۆڕشگێڕانەی کاری پیاوانە و جۆرێکی شۆڕشگێڕانەی پیاوەتیی نمایش دەکرد. لە ناوەڕاستی ئەو وێنەیەدا بۆ پیاوەتی، وێنەی پێشمەرگە وەک جەنگاوەرێکی پتەو و بەهێز و لەخۆبردوو ئامادەیە، وەک بوونەوەرێکی نەترس و دڵسۆز و ئامادە بۆ قوربانیدان. ئەو ئاکارانەی بە پێشمەرگە و لە ڕێگەی پێشمەرگەشەوە بەم شێوازە لە پیاوەتیی باڵادەست داروە، بریتین لە ئازایەتی و نەترسیی و چاوقایمی، سڵنەکردنەوە لە بەکارهێنانی توندوتیژی، ئامادەگی بۆ خۆبەختکردن و قوربانیدان، چەپاندنی ئەنانیەت و خۆپەرستی، تەحەمولکردنی ژیانی پڕ لە زەحمەتی، بەخشینی خوێن و ژیان لەپێناوی پاراستنی شەرەفی نەتەوە و شەرەفی خێزان و شەرەفی نیشتیماندا. پیاوەتییەکی ناکۆک بە خۆپەرستی و نارسیسم، بە گرنگیدان بە دەسکەوتی مادی و کەڵەکەکردنی سەرمایە. هەموو ئەمانە ئەو بەها و نۆرمە سەرەکیی و بنەڕەتییانە بوون کە "پیاوەتیی پێشمەرگانە" لە کوردستاندا بەرجەستەی کردبوون، ڕۆژگارێکی درێژیش شێوازی

ئایدیالی و باڵادەستیی پیاوەتیی ڕاستەقینە بوو. ئەو مۆدێلە بوو لە پیاوەتی کە جۆرەکانی تری پیاوبوون و ژنبوونی پێ دەپێورا. هەردوو پارتە باڵادەستەکەی هەرێمیش، یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، نەک تەنها هەڵگری ئەم گوتارە بوون و تا ئێستاش هەڵگرین سەبارەت بە "پیاوەتیی پێشمەرگانە"، بەڵکو هەڵگری گوتاری شەهادەت و گۆڕستانی پڕ لە شەهیدی خۆشیان بوو، گۆڕستانی ئەو پیاوانەی کە ئایدیالی پیاوەتیی پێشمەرگەیان لە ژیانی تایبەتیی خۆیان و لە ژیانی سیاسیی میلەتەکەیاندا بۆ ناو واقیع دابەزاندبوو، تا ئەو شوێنەش لەپێناوی ئەو بەهایانەدا کە ئەم پیاوەتییە پێشنیاریان دەکات، گیانفیدایی بکەن و بمرن. ئەم گوتارە پێ لەسەر مەرگی پێشمەرگە وەک خەباتکەرێکی نیشتیمانیی نێر لەپێناوی نەتەوە و نیشتیماندا دادەگرێت.[1] لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئیعجاب و سەرسوڕمان بەم شێوازە لە پیاوەتی لە بنەڕەتدا دەربڕینی ئیعجاب و پەسەندی بوو بەرامبەر بەو خەبات و مەسەلەیەی کە پێشمەرگە بکەرە سەرەکییەکەی بووە، پارتە سیاسییەکانیش ئەم ئیعجاب و پەسەندکردنەیان بۆ ڕابوردووی پێشمەرگانەی خۆیان بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار هێناوە و بەکار دەهێنن بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە دەسەڵاتە سیاسییەکەیان لە قۆناغی دوای ڕاپەڕیندا. ئەم کارەش بەشێکە لە ستراتیژیەتی

١ _بڕوانە:
Kanie, Mariwan (2010). 'Martelaarschap tussen natie en religie. Politieke liefde, poëzie en zelfopoffering in Koerdisch nationalisme'. Unpublished Phd thesis. University of Amsterdam.

بەخشینی "ڕەوایەتییەکی شۆڕشگێڕانە" بەو دەسەڵاتەی لە قۆناغی دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشدا دروستیان کرد. لە ڕێگای هێماکردن بۆ ئازایەتی و ئەویتردۆستی و خۆنەویستیی پێشمەرگەوە، لە ڕێگای نمایشکردنی ڕۆحی قوربانیدان و ژیانبەخشین لەلای پێشمەرگە، لە ڕێگای بەڵێنی پێشمەرگانە بە خەباتکردن بۆ دروستکردن و پاراستنی ئاییندەیەکی پرشنگدار، لە ڕێگای نیشاندانی عەشقی پێشمەرگە بەرامبەر بە نیشتیمان و بەرپرسیاربوونی بەرامبەر بە ژیانی نەتەوە و نیشتیمان، ئەو پیاوانەی لە ڕابوردوودا پێشمەرگە بوون، توانییان مۆنۆپۆلی تەواوی ماناکانی پیاوەتی لە کوردستاندا بکەن و پیاوەتیی خۆیان وەک "پیاوەتییەکی پێشمەرگانە" نمایش بکەن و ئەم جۆرە پیاوەتییەش بکەن بەو مۆدێلە لە پیاوەتی کە لە دونیای ئێمەدا باڵادەست بێت. بەشێکی گرنگی پەیوەندییە تازەکانی دەسەڵات لە هەرێمدا خرایە خزمەتی بەهێزکردن و بڵاوکردنەوە و پاراستنی ئەم شێوازە لە پیاوەتی پێشمەرگانەوە، بەڵام لە دونیایەکدا کە نە شۆڕشی تیا مابوو، نە ئەو کۆدە ئەخلاقییانەی کە پیاوەتیی پێشمەرگانە داواکاریانە، نە پێشمەرگەکانی دوێنێش هەڵگری لانی هەرە کەمی ماناکانی ئەو پیاوەتییە پێشمەرگانەیە بوون کە کردبوویان بە بنەمای بەشێکی گرنگی ڕەوایەتیی دەسەڵاتە سیاسییەکەیان.

ئەو خاڵەی من لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەرگریی لێ دەکەم ئەوەیە، کە ئەم "پیاوەتیی پێشمەرگانە"یە، ئەم فۆرمە لە پیاوەتیی خۆبەخش و خۆنەویست و گیانفیدا و نائەنانیی و قوربانیبەخش، پیاوەتییەک کە خۆشویستنی نیشتیمان و

خۆشویستنی ژیانی گشتی ئاراستەی بکات، ئەمڕۆکە لە قەیرانێکی گەورە و کوشندەدایە و لە ڕاستییشدا ئەگەرچی وەک ئایدیال ماوە و باس دەکرێت، بەڵام لەناو واقیعدا سێبەر و شوێنپێکانیشی نەماون. ڕەگوڕیشەی ئەم قەیرانەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سالانی نەوەد. ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیەوێت بیلێت ئەوەیە "پیاوەتیی پێشمەرگانە" بەو مانایانەی لە سەرەوە باسمان کرد، بە هیچ مانایەک ئەمڕۆ شێوازی بالادەستیی پیاوەتیی نییە لە هەرێمدا و جێگەی چۆڵ کردوە بۆ شێوازی تری پیاوەتیی تەواو ناکۆک بە پیاوەتیی پێشمەرگانە، کە دواتر بەدرێژی باسی دەکەین. بەلام ئەم گۆڕانکارییە چۆن ڕووی دا؟

کاتێک هەردوو پارتە بالادەستەکەی هەرێم حوکمڕانیی تایبەتی خۆیان دەست پێ کرد و لە ماوەیەکی کەمدا جەنگێکی خوێناویی گەورەیان لە ناوخۆی کوردستاندا بەرپا کرد، دوای ئەوە هەرێمی کوردستانیان بە کردەوە کرد بە دوو زۆنی سیاسی و ئیداریی دابڕاو و دوژمن بە یەکتری، کاتێک هەموو دەرکەوتەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و فەرهەنگیان مۆنۆپۆڵ کرد، کاتێک فرۆمی تازەی ئینتیمای حیزبی و سنووردariyان بەسەر کۆمەڵگای ئێمەدا سەپاند، کاتێک پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و هەمەلایەنیان لەنێوان پێگە سیاسییەکان و پێگەی ئابووریدا دروست کرد و سیاسەتیان گۆڕی بۆ چالاکیی کەڵەکەکردنی سەرمایەی شەخسی و حیزبی، ئیتر ئەوەی ئەوان ئەنجامیان ئەدا نەک تەنها پتەوکردنی پەیوەندییەکانی دەسەلاتی خۆیان بوو لە قۆناغی دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشدا، بەڵکو لادانێکی تەواو بوو

لە ئایدیالە ئەخلاقی و کولتوورییەکانی "پیاوەتیی پێشمەرگانە" و دروستکردنی دونیای تازەی دوای شۆڕش و کەسایەتی و پیاوەتیی تازەی دونیای دوای شۆڕش. دروستکردنی ئەم دونیایەش تەواو ناکۆک بوو بە هەموو ئەو مژدە و بەڵێن و چاوەڕوانییانەی لە قۆناغی شۆڕشدا لەناو کۆمەڵگای کوردستانیدا دروستیان کردبوو، تەواو ناکۆکیش بوو بەو بەهایانەی کە "پیاوەتیی پێشمەرگانە" بەرگریی لێ دەکرد. لە ئاستە تیۆرییەکەدا ئەو گۆڕانکاری و گواستنەوانە لە هەرێمدا رێک بەو رێچکە تایبەتەدا رۆشتن کە فرانز فانۆن لە کتێبی *چەوساوەکانی سەرزەویدا* هێڵە گشتییەکانی شی دەکاتەوە.[1] بە بۆچوونی فانۆن ناسیۆنالیزم و خەباتی نەتەوەییانە زۆر جار لەوەدا سەر ناکەوێت ئەو ئازادییانە بۆ کۆمەڵگا دەستەبەر بکات کە لە قۆناغی شۆڕشدا مژدەی دەستەبەرکردنی ئەدەن. حوکمڕانەکانی قۆناغی دوای سەرکەوتنی شۆڕش، دەگۆڕدرێن بۆ چینێکی نوێی خاوەن مەسڵەحەت و قازانجی تایبەت و ئەو دەسەڵاتەشی کە بەدەستی دەهێنن دەخەنە خزمەتی ئەو قازانج و مەسڵەحەتە تایبەتەوە. بە باوەڕی فانۆن ئەم چینە تازەیە بە شێوەیەکی هەمەلایەن دەکەوێتە دەستخستنە ناو سەرجەمی سەرچاوەکانی دەوڵەمەندبوون لە وڵاتەکەدا و دەکەونە بەهێزکردن و دەوڵەمەندکردنی خۆیان و کەسە نزیکەکانیان.[2] فانۆن پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کە حوکمڕانە ناسیۆنالیستە تازەکان هەمان ئەو

١ _بڕوانە:
Fanon, Franz (2004).Wretched of the Earth. New York: Grove Press

٢ _بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣.

سیستمی توندتیژی و حوکمڕانییە کۆپی دەکەنەوە کە بەشێک بوون لەو سیستمی داگیرکردن و چەوساندنەوەیەی ئەمان وەک پێشمەرگە و خەباتگێڕ لە جەنگدا بوون لەگەڵیدا، ئەو پۆست و پایانەش کە جاران داگیرکەران پڕیان دەکردەوە، ئەمڕۆ بە کەسە نزیکەکان و بە کەسانی جێی متمانەی ناو پارتە سیاسییەکانی خۆیانی پڕ دەکەنەوە. ئەگەرچی فانون بە زمانی پیاوەتی قسە لەم گۆڕانکارییانە ناکات، بەڵام لە درێژکردنەوەی دیدەکانی ئەودا بۆ ناو ئەم بوارە، دەکرێت بڵێین ئەوەی ڕوو دەدات گۆڕانی "پیاوەتیی شۆڕشگێڕانە"ی قۆناغی خەباتی دژ بە کۆلۆنیالیزمە بۆ "پیاوەتییەکی کۆلۆنیالیانەی نوێ" کە مۆدێلە کۆلۆنیالییە توندوتیژەکە ژێرخانە ڕەمزی و ئەخلاقی و بەهاییەکەیەتی. بەمەش قۆناغی دوای سەرکەوتن لە زۆر ڕووەوە دەگۆڕێت بۆ درێژەدانێکی هەمەلایەنەی قۆناغی کۆلۆنیالیزم.

ئاشکرایە ئەو دەسەڵاتە کوردییەی لە دوای ساڵی ١٩٩٠ لە هەرێمدا دروست بوو، بەتایبەتی لە دوای ساڵی ٢٠٠٣وە، بەم چوارچێوە فانۆنییەدا تێپەڕی. ئیرادە و تەماح و حەزی مۆنۆپۆڵکردنی تەواوی سیاسەت و ئابووری لە یەک کاتدا، شۆڕشگێڕە خەباتکەرەکانی دوێنێی گۆڕی بۆ بازرگان و خاوەنئیشە گەندەڵ و کاپیتالیستە بێمۆراڵەکانی ئەمڕۆ، هەموو ئەمەش لەناو سیستمێکی ڕەیعی لە کاپیتالیزمی خزمچی و جەردەییی باڵادەستکراودا.[1] لە کوردستاندا پێشمەرگەکانی

---

١ _بڕوانە:
http://news.bbc.co.uk/2/hi/programmes/crossing_continents/7178820.stm

دوێنێ، بەتایبەتی نوخبە باڵادەست و خاوەن بڕیارەکە، شەڕی ناوخۆیان بەکار هێنا بۆ دەستبەسەراگرتن و کۆنترۆڵکردنی زیاتری سەرجەم ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و لەوێشەوە سەپاندنی تەواوی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕیندا. ئابووریی کوردستان بە شێوەیەکی زۆر فراوان و هەمەلایەن هێنرایە ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی نوخبە حوکمڕانەکەوە. کردنەوەی هەر پرۆژەیەکی ئابووری و ڕاپەڕاندنی کارەکانی بەوەوە پەیوەست بوو کێ کێ لەناو نوخبە دەسەڵاتدارەکەدا دەناسێت. خێزان و کەسە نزیکەکانی ئەم نوخبەیە پۆستە بیرۆکراتییە گرنگەکانی ناو سیستەمەکەیان پێ درا و کۆنتراکتە چەور و گەورەکانی حکومەتیشیان خرابووە بەردەست، ئەمانیش هەموو ئەو شتانەیان لەنێوان خۆیان و کەسە نزیک و متمانەپێکراوەکانیاندا دابەش دەکرد.[1] لەپاڵ ئەمانەدا دەزگا سیاسییە هەرە گرنگەکانی هەرێم، پارتە سیاسییەکان، پەرلەمان، دەزگاکانی دەوڵەت، لەشکر، هێزەکانی ئاساییش و هەواڵگری، پۆلیس و هێزی پێشمەرگە خۆشی، بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ هێنرانە ژێر دەسەڵات و ڕکێفی نوخبە دەسەڵاتدارەکەوە و زۆربەشیان لە ڕێگای کوڕ و کەس

---

١ _بڕوانە:
Clark, Kate (2014). Corruption in Iraqi Kurdistan, http://news.bbc.co.uk/2/hi/programmes/crossing_continents/7178820.stm, accessed on 3 July 2014. See also: Corruption in the Kurdish North, www.wikileaks.org/cable/2006/02/06KIRKUK37.html, accessed on 20 august 2014.

و خزمە نزیکەکانیانەوە بەڕێوە دەبران. وەک چۆن ئەم نوخبەیە دەسەڵاتە ئابووری وماڵییەکەی بەکار دەهێنا بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی سیاسی و دروستکردنی هەواداران لەناو کۆمەڵگادا، ئاواش دەسەڵاتە سیاسییەکەی بەکار دەهێنا بۆ دەوڵەمەندبوونی زیاتر لەناو ئابووریی هەرێمدا. ئەو هێڵانەی کە دەسەڵاتداران و دەزگاکانی حوکمڕانیی لەیەکتری جیا دەکاتەوە بەتەواوی شێوێنران و لەزۆر دۆخیشدا بەتەواوی سڕانەوە. هاوکات هەردوو پارتەکە بەشی زۆری میدیاکانی هەرێمیان یان کۆنترۆڵ کرد، یان بەتاڵ کردەوە لە هەر وزەیەکی ڕەخنەیی و خۆشیان دەستیان کرد بە دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی میدیایی تایبەت بە خۆیان. دەزگا گرنگەکانی وەک زانکۆکان و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگای مەدەنییشیان بە شێوەیەکی ترسناک کۆنترۆڵ کرد و هەوڵی تەواویان دا بۆ ئەوەی ئەو دەزگایانە لە هەر مەترسییەکی ڕەخنەگرتن و نارەزاییدەربڕین بەتاڵ بکەنەوە. هاوکات دەسەڵاتی داوەرییکردنیش بەتەواوی گرێ درا بە ویست و ئیرادەی دەسەڵاتدارانەوە و بەمەش ولاتەکە بەتاڵ کرایەوە لە هەر شتێک بتوانێت لە دەرەوەی ئەو نوخبە باڵادەستەدا بوونێکی سەربەخۆ و کاریگەری هەبێت. هەرێم بە کردەوە بوو بە ماڵی ئەو دوو پارتە سیاسییە و ئەوانیش بوون بە سەردار و خاوەنماڵی ئەو ماڵە.

بەکورتی "پێشمەرگە"کانی دوێنێ سەرجەمی دەسەڵاتە سیاسی و سەربازی و ئەمنییەکەی خۆیان بەکار هێنا بۆ کەڵەکەکردنی هەرچی زیاتری سەرمایەیەکی زۆر و بۆ کۆنترۆڵکردنی کەرتە ئابوورییە ستراتیژییەکان، لەوانەش

کەرتی نەوت و بیناسازی و بازرگانیکردنی هەمەجۆر لەگەڵ دونیای دەرەوەدا. ئەم تێکەڵبوونی پارە و دەسەڵاتە بەیەکتری بۆتە هۆکاری دروستبوونی گەندەڵی و فەسادێکی کەموێنە و گەورە لە هەرێمدا.[1] بووە هۆی دابڕانێکی تەواوی دونیای "پێشمەرگەکانی دوێنێ" و دونیای ئەو کۆمەڵگایەی ئەمڕۆکە ئەو پێشمەرگانە لە ڕێگای مۆنۆپۆلکردنی دەسەڵاتەکانەوە دروستیان دەکرد. خاڵێک کە دەهێنێت لێرەدا هێمایەکی خێرای بۆ بکەین ئەوەیە کە ئەم "کۆنە شۆڕشگێڕانە" کە هاوکات "پیاوە بەهێزەکان"ی ناو نوخبە دەسەڵاتدارەکەی هەرێمن، زیاد لە چارەکەسەدەیەکە لە لووتکەی هەرەمی دەسەڵاتدان، کاتێکیش پیر ئەبن و توانایان بۆ حوکمڕانیکردن کەم دەبێتەوە، بە شێوازی جیاواز منداڵەکانیان ئامادە دەکرێت بۆ ئەوەی جێگاکانیان بگرنەوە و ڕۆڵی ئەوان وەک دەسەڵاتداری گەنج ببینن. ئەو نووسەر و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسانەی بە شێوەیەکی ڕەخنەیی لەسەر ئەم دونیا گەندەڵە تازەدروستکراوەیان دەنووسن، تووشی جۆرەها

---

١ _بڕوانە:

In a report from late 2011, Transparency International (TI) indicates that the Republic of Iraq, including the Kurdish regional administration, is among the eight most corrupt countries and territories in the world. See: http://www.presstv.ir/detail/230670.html. See also: http://sbeiy.com/%28A%28TwJqy58EzQEkAAAANTQ1OW M2NWYtOWZmNi00Zjg2LWFiMzItOTk4OTY3ZDImZDk0LNLEEa5-wNVJosbHK6fZIIPvtg1%29S%28vycai4hbu2cj445b0la0zjbm%2 9%29/article_detail.aspx?ArticleID=6322&AuthorID=717.

شێوازی توندوتیژی دەبنەوە، لە گرتن و لێدان و ترساندنەوە تا بە کوشتن و لەناوبردن دەگات.[1] بەکورتی ئەوەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا ڕووی دا ئەوە بوو پێشمەرگەکانی دوێنی سیستمێکی سیاسیی دەسەڵاتگەریان لە هەرێمدا دروست کرد کە دەکرێت زۆر بەئاسانی بە سوڵتانیزمی نوێ، new sultanism ناوی ببەین.[2] سیستمێک پڕ لە "پیاوی گەندەڵ" و "خۆپەرست" و "بێمۆراڵ".

ئەگەرچی کۆنە پێشمەرگە سەرمایەدارە دەسەڵاتدارەکانی ناو هەردوو پارتەکە گروپێکی بچووکن، بەڵام بە ڕادەیەکی هێجگار گەورە دەوڵەمەندن و ژیانێکی پڕ ڕەفاهیەتی کەموێنە دەژین. ئەمەش بە شێوەیەکی نهێنی نا، بەڵکو بە شێوەیەکی بەرچاو و هەندێک جار لە فۆرمی نمایشکردنێکی شانۆییشدا. ئەم نوخبە دەسەڵاتدارە و خزم و کەس و هەوادارە نزیکەکانیان، ژیانێک دوور لە کۆمەڵگا، ژیانێکی تەواو دابڕاو لەناو گێتۆکانی خۆیاندا، دەژین. ژیانێک دابڕاو لەو شار و ژینگانەی تیایدا

١ _بڕوانە:
'Is Kurdistan the Next Autocracy? Petro-Dollars Lead to Corruption in Northern Iraq': http://www.alternet.org/world/autocracykurdistan? page=0%2C0. See also: Journalist who covered corruption killed in Iraqi Kurdistan after getting threats: https://www.ifex.org/iraq/2013/12/06/killed_in_kurdistan/.

٢ _سەبارەت بە سوڵتانیزمی نوێ بڕوانە:
H.E.Chehabi and Juan J.Linz (eds.) (1998). Sultanistic Regimes. The Johns Hopkins University Press.

سەبارەت بە سوڵتانیزم لە کوردستان بڕوانە: مەریوان وریا قانع (٢٠١٤). فاشیزم یان سوڵتانیزم؟ ڕۆژنامەی ئاوێنە. ١٤-١-٢٠١٤.
http://www.awene.com/opinion/2014/01/14/29082.

دەژین، لە دەرەوەی ئەو کۆمەڵگایەدا کە حوکمڕانیی دەکەن. لەم گیتۆیانەدا ئەوان نەخۆشخانەی تایبەت، بازاڕی تایبەت، ئاو و کارەبای تایبەتیان هەیە، منداڵەکانیان دەچنە قوتابخانەی تایبەت و زۆربەی جار بە زمانی ئینگلیزی و تورکی وانە دەخوێنن و زمانە کوردییەکەیان تەواو لاواز و هەژارە. ئەم "پێشمەرگانەی جاران" شارە کوردستانییەکانیان لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دابەش کرد بۆ گەڕەکە زۆر دەوڵەمەندەکان و گەڕەکە هەژارەکان و ئەمەنەشیان بە چەندان شێوازی جیاواز لەیەکتری جیا کردۆتەوە، بەمەش نەک هەر تەنها شێوازی تازەی هەژاری و دەوڵەمەندیی سەرسوڕهێنەریان دروست کردوە، بەڵکو سەرجەمی ئەو پەیوەندییانەیان وێران کرد کە بە درێژاییی چەندان سەدە لەنێوان دەوڵەمەندی و هەژاری لە کۆمەڵگای ئێمەدا دروست ببوو. پەیوەندییەک شتێک لە هاوسەنگیی کۆمەڵایەتیی تێدا بوو. شێوازی دابەشکردنی پارەی نەوت و شێوازی دابەشکردنی کۆنکراتە گەورەکانی بیناسازی لە کوردستاندا لە قازانجی گەڕەک و بەشە دەوڵەمەندەکانی شارەکاندا بوو. ئەمەش ئەو دابەشبوونە چینایەتییانەی کە هەبوون قووڵتر و فروانتر کردەوە و بەبەردەوامییش قووڵتریان دەکاتەوە. هەموو ئەمانە لە ڕەوتێکدا کە تیایدا ژمارەی دانیشتووان بە خێرایی زیاد دەکات و "پرۆسەی بەشاربوون" تا دێت فراوانتر دەبێتەوە. ساڵانە هەزاران خوێندکاری زانکۆکان خوێندن تەواو دەکەن و دەکەونە ناو بازاڕێکی ڕەیعیی کۆنترۆڵکراو و گەندەڵەوە، بازاڕێک بە شێوەیەک ڕێک خراوە کە نەک تەنها دەسەڵاتی

پێشمەرگەکانی دوێنێ و سەرمایەدارە گەورەکانی ئەمڕۆکە بپارێزێت، بەڵکو شانسێکی زۆر کەمیش بۆ بەشێکی گەورەی کۆمەڵگا دەهێڵێتەوە کە بتوانن کارێکی ماقووڵیان دەست بکەوێت و ژیانێکی نیمچەسەربەخۆ دەست پێ بکەن.

ئەم هەلومەرجە تازەیە کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا هاتە کایەوە، وای کرد "پیاوەتیی پێشمەرگانە" بە هەموو ئەو مانایانەوە کە باسمان کرد، ڕووبەڕووی قەیرانی باوەڕ و متمانەپێکردن ببێتەوە. شتێکی ئەوتۆ لە بەهاکانی ئەم مۆدێلە لە پیاوەتی لەناو واقیعدا بوونی نەما، ئەو دونیایەی دروست کرا کۆمەڵێک بەهای تازەی هێنایە پێشەوە کە تەواو ناکۆک بوون بە بەهاکانی پیاوەتیی پێشمەرگانە. کەچی نوخبە دەسەڵاتدارە بازرگانە سیاسییەکە دەیەوێت وێنەکانی ئەم "پیاوەتییە پێشمەرگانەیە" بپارێزێت و زیاتر و زیاتر مەحکەم و پتەوی بکات، بۆ ئەوەی بتوانن هەم وێنە کۆنەکانی خۆیان وەک خەباتکەرێکی سیاسی و جەنگاوەرێک بۆ ئازادیی بپارێزن، هەم لەم ڕێگایەشەوە وێنە ناشیرین و ترسناکەکانی پیاوەتیی ئێستایان بشارنەوە. ماشێنە ئایدیۆلۆژییە زەبەلاحەکەی هەردوو پارتەکە خرانە خزمەتی پاراستن و کۆنترۆڵکردنی وێنە و ماناکانی پیاوەتیی پێشمەرگانەوە، لەو دونیایەدا کە خاڵییە لە ئایدیالەکانی ئەو فۆرمە لە پیاوەتی. لەم ڕەوتە تازەیەدا "پیاوەتیی پێشمەرگانە" کراوە بە ئایدیۆلۆژیای بەرزنرخاندن و بەموقەدەسکردنی ڕابوردووی ئەو بازرگانە سیاسییە باڵادەستانە و ئەندامانی خێزانەکانیان. خراوەتە خزمەتی زیندووڕاگرتنی وێنەکانی مێژوویەکەوە کە کۆپییە

هەرە هەرە سادە و لاوازەکانیشی لە ئێستادا نەماوە. ڕێک لەو کاتەدا کە سیستمێکی سیاسی و ئابووریی تەواو گەندەڵ و داخراویان دروست کردوە، سیستمێک خراپبەکارهێنانێکی هەمەلایەنانەی دەسەڵات و فۆرمە هەرە داخراوەکانی خزمخواهیی لە ئاکارە هەرە سەرەکییەکانیەتی، "پیاوەتیی پێشمەرگانە" وەک پیاوەتیی باڵادەست نمایش دەکرێت و هەوڵی چەسپاندنی دەدرێت. ئەم ناکۆکییە گەورەیە لەنێوان واقیع و وێنەکاندا، لەنێوان پیاوەتییەکی نوێ لە واقیعدا دروست دەبێت و پیاوەتییەک کە دونیاکەی و زەمینە سیاسی و بەهایی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکەی ئاوا بووە، ئەو ناکۆکییە سەرەکییە کە ئەمڕۆکە لە هەرێمدا هەیە، ئەمەش بنەمای ئەو قەیرانە قووڵەیە کە "پیاوەتیی پێشمەرگانە"ی لەو دونیا تازەیەدا تێ کەوتوە، پیاوەتییەک هیچ شتێک نایهێنێتەوە ناو دونیای دروستکراوی دوای ڕاپەڕین و ناتوانێت وەک مۆدێلی سەرەکیی پیاوبوون لە کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕیندا دەستبەکار بێت.

## ناڕەزایەتیی کۆمەڵایەتی و مەسەلەی پیاوەتی

لە ساڵانی ڕابردوودا دۆخی ناڕەزایی و تووڕەبوونی کۆمەڵایەتی لە هەرێمی کوردستاندا بەرامبەر بەوەی لە دونیای دوای ڕاپەڕینەدا دروست کراوە بە ئاستێکی بەرز گەیشت، بە جۆرێک لە ساڵی ٢٠١١ ئەم ناڕەزاییانە گەیشتنە لووتکە و بەشێکی گرنگی دانیشتووانی هەرێم ڕژانە سەر شەقامەکان بۆ دەربڕینی ناڕەزاییەکانیان. ئەم ناڕەزاییانە دژ بە دوژمنی دەرەکیی نەبوون، بەڵکو دژ بە شێوازی

حوکمڕانیکردنی پێشمەگە شۆڕشگێڕەکانی جاران بوو.[1] خەڵک، بەتایبەتی گەنجان، داوای ڕیفۆرمی سیاسیی مانادار و بنبڕکردنی گەندەڵی و شەفافیەت و دەستگۆڕکێکردنی دەسەڵاتیان دەکرد. بەڵام دەزگاکانی پۆلیس و دەزگا نیمچە میلیشیاکانی دەسەڵاتداران کەوتنە گیانی خۆپیشاندەران، هێزەکانی ئاسایش چەندان کەسی مەدەنی و بێچەکیان کوشت و بریندار کرد، یەکێک لەوانە منداڵێکی تەمەن دوازدە ساڵ بوو، سەدان خۆپیشاندەر گیران و چەندانیش ئازاری جەستەیی دران، ژمارەیەکی زۆریش بە شێوازی جیاواز تۆقێندران.[2] بەم جۆرەش "پێشمەرگەکانی دوێنێ" کەوتنە گیانی ئەو نەوەیە لە گەنجان کە لەناو دونیای حوکمڕانیکردنی ئەواندا گەورە بووبوون و جگە لەو دونیایەش هیچ دونیایەکی تریان نەدەناسی.

لەم دونیایەدا و لە پەیوەندیدا بەو گۆڕانکارییانەوە کە باس کران، پەنابردنی بەردەوام بۆ توندوتیژی بوو بە ئامرازێکی

---

١ _بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە نارەزاییەکان و خۆپیشاندانەکانی ساڵی ٢٠١١ بڕوانە:

'Failing Oversight: Iraq's Unchecked Government' International Crisis Group Middle East Report N°113, 26 September 2011. See also: 'In Iraqi Kurdistan, Satisfaction with Infrastructure Crumbles': http://www.gallup.com/poll/157298/iraqi-kurdistansatisfaction- infrastructure-crumbles.aspx.

٢ _بڕوانە:

**'Failing Oversight: Iraq's Unchecked Government'**. International Crisis Group Middle East Report N°113, 26 September 2011.

هێجگار گرنگ و سەرەکیی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگا و نوخبە دەسەڵاتدارەکە لە هەرێمدا. توندوتیژیی ڕێزمانی ڕێکخستن و پاراستنی ئەو دونیا تازەیەیە کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا لە ڕێگای خراپبەکارهێنانێکی بەرفراوانی دەسەڵاتەوە دروست کراوە. دەسەڵاتدرانی هەرێم دونیایەکیان دروست کردوە کە نایانەوێت بگۆڕدرێت، دەیانەوێت بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە لە قازانج و مەسڵەحەتی خۆیاندایە، بەمەش "پیاوەتی پێشمەرگانە"، کە پیاوەتییەکی شۆڕشگێڕ و گۆڕانخوازە، لە کردەوەدا گۆڕاوە بۆ پیاوەتییەکی دژەگۆڕان و دژەشۆڕش. پیاوەتیی پێشمەرگانە پیاوەتیی خۆنەویستی و بەتەنگەوەهاتن و خەمخۆرییە لە ژیانی گشتی و لە دابینکردنی دادپەروەری و پاراستنی ئازادی، بەڵام ئەوەی لەسەر ئەرزی واقیع لە هەرێمدا ڕوو دەدات ڕێک پێچەوانەی ئەم بەهایانەیە. نەک هەر ئەمە، بەڵکو دەسەڵاتی کوردی بە شێوەیەکی بەردەوام لە گەشەکردندایە بۆ دەسەڵاتدارییەتییەکی دەسەڵاتگەر، ئەو سیستمەی کە خەریکە بەتەواوی دروست دەبێت و دەچەسپێت، لەو چەمکە نزیک دەبێتەوە کە هەندێک زانای سیاسیی ناوی "جەملەکە"ی لێ دەنێن، "جەملەکە" تێکەڵکردنی وشەی جمهووریەت و مەملەکەتە بەیەکتری. لەم سیستمەدا دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕ، یان لەنێو ئەندامانی هەمان خێزان یان بنەماڵەی دەسەڵاتداردا، دەهێڵدرێتەوە.[1] بەم جۆرە توندوتیژی نەک تەنها بووە بە بەشێک لە

[1] ـ بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی "جەملەکە" بڕوانە:
Filiu, Jean-Pierre (2011). The Arab Revolution: Ten Lessons from the Democratic Uprising. Oxford University Press, p. 8.

پێکهاتـی ناوەکیـی سیسـتمە سیاسـییە دەسـەڵاتدارەکە، بەڵکـو بەشێکیشـە لـە ئامـرازی بەرگریکـردن و سـەپاندنی بـەزۆری "پیاوەتی پێشـمەرگانە"ی نامۆ بـەو دونیایـەی دروست کراوە، سـەپاندنی بـەزۆری بەسـەر دونیایەکـدا کـە هیـچ ڕەگەزێـک لـە ڕەگەزەکانـی ئـەو پیاوەتییـەی تێدا نەمـاوە. ئـەم سـەپاندنە هەوڵی بەرزڕاگرتنـی درۆزنانـەی هەندێک بەهایـە کە لـە واقیعدا پێچەوانەکانیـان ئامادەیـە و پێچەوانەکانیـان پیـادە دەکرێـن.

قەیرانـی نوخبـە دەسـەڵاتدارەکە و توندوتیژبوونـی بەردەوامـی ئـەم نوخبەیـە بـۆ پاراسـتنی دونیایەکـی تـەواو گەندەڵ، بـووە بـە بەشـێک لـە قەیرانی "پیاوەتیی پێشـمەرگانە" و سـەرجەمی ئـەو بەهایانـەی ئـەم جـۆرە لـە پیاوەتـی کاری بۆ کـردوە و بەرهەمـی هێنـاوە. ئـەم گۆڕانکارییانـە وایـان کـرد پێوەرە پێوانییەکانی "پیاوەتیی پێشـمەرگانە" بۆ جیاکردنـەوەی دز و جـەردە و پیاوکـوژ و ناپـاک لـە پیـاوی ئاسـایی و پـاک و بـاش و نرخـدار، جیاکردنـەوەی خۆپەرسـت لـە گیانفیـدا، پیاوەتیی ڕاسـت لـە پیاوەتیی هەڵـە، تەنانـەت بۆ جیاکردنـەوەی ترسـنۆک لـە پاڵـەوان و خائیـن لـە نیشـتیمانپەروەر، تـەواو تووشـی تێکچـوون و شـڵەژانی ناوەکـی ببێـت و ئـەو پێوەرانـەی ئـەم شـێوازە لـە پیاوەتـی هەڵگریەتـی، هیـچ پەیوەندییەکیـان بـەو دونیایـەوە نەمێنێـت کـە دروسـت کـراوە. بـەم جـۆرە قەیرانـی "پیاوەتیـی پێشـمەرگانە" بەنـاو وێرانبوونـی سـەرجەمی ئـەو بەهایانـەدا تێدەپەڕێـت کـە کۆمەڵـگای ئێمـە بـۆ جیاکردنـەوەی پیاوەتیـی بـاش لـە خـراپ و پیـاوی ئاسـایی لـە پیـاوی نەفرەتلێکـراو دروسـتی کردبـوو. بـەڵام کێشـەکە تەنهـا لێـرەدا کۆتاییـی پـێ نایـەت، چونکـە ئـەم قەیرانـە لـە پیاوەتیـدا بـووە

بە بەشێک لە قەیرانێکی قووڵتر و بنەڕەتیتر لە هەرێمدا، کە بریتییە لە قەیرانی گواستنەوە لە "هەژموونی سیاسیی"ەوە بۆ "خۆسەپاندنی سیاسیی". با ئەم خاڵە کەمەکێک وردتر شی بکەینەوە.

**لە هەژموونەوە بۆ بەزۆرخۆسەپاندن**

وەک وتمان هەڵگرانی "پیاوەتیی پێشمەرگانە" لە نەوەدەکان و ساڵانی دووهەزاردا گۆڕان بۆ چینێک لە سەرمایەدار و بازرگانی گەندەڵ، کە نەک تەنها ئەو دەسەڵاتە زۆرانەی لەژێر دەستیاندا بوو زۆر بەخراپی بەکاریان هێنا و زۆر خۆپەرستانە و ئەنانییانە خۆیان و هەوادارە نزیکەکانیان دەوڵەمەند کرد، بەڵکو سڵیشیان لەوە نەکردەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو توندوتیژی بەرامبەر بە کۆمەڵگا بەکار بهێنن، کاتێک خەڵک کەوتنە ڕەخنەکردنی شێواز و مۆدێلی حوکمڕانییەکەیان. ئەم دۆخە نیشانی دا کە دەسەڵاتداران لە هەرێمدا نەیاندەتوانی چیتر لە ڕێگای "هەژموون"ەوە، hegemony, حوکمڕانی بکەن، بەڵکو پەنایان بۆ ستراتیژیەتی "بەزۆرخۆسەپاندن"، domination، برد. جیاکردنەوەی ستراتیژیەتی "هەژموون" لە ستراتیژیەتی "خۆسەپاندن" دەگەڕێتەوە بۆ کارە تیۆرییەکانی فەیلەسوفی سیاسیی ئیتالی: ئەنتۆنیۆ گرامشی. گرامشی لە نووسینەکانیدا ئەم دوو شێوازە لە تەکنیک و ستراتیژیەتی حوکمڕانیی لەیەکتری جیا دەکاتەوە. لای گرامشی هەژموون ئەو شێواز و ستراتیژەی حوکمڕانییە کە خەڵک تیایدا لە ڕێگای ڕازیبوون و ڕێکەوتن لەگەڵ دەسەڵاتدارانەوە حوکمڕانی دەکرێن. هەژموون ئەزموونی

قبوولکردنی خۆبەخۆی کۆمەڵگایە بۆ حوکمڕانەکانی، قبوولکردنی سەرکردایەتیکردنی حوکمڕانانە بۆ کۆمەڵگا، لە هەژموونندا مەسەلەی ڕێکەوتن و ڕازیبوون سەرەکییە، کۆمەڵگا سەرکردایەتیکردنی ئەخلاقی و ڕەمزیی دەسەلاتدارانی قبووڵە، بەها سیاسی و کردە سیاسی و ئەخلاقە سیاسییەکانی ئەوانی قبووڵە. بەلام لە خۆسەپاندندا هیچ یەکێک لەمانە ئامادە نییە، ستراتیژیەت و شێوازی حوکمڕانیی لە ڕێگای ئیجبارکردن و پەنابردن بۆ توندوتیژی و فشاری بەردەوامەوە، کار دەکات. بەکورتی، ستراتیژیەتی "بەزۆرخۆسەپاندن" ڕێک پێچەوانەی ستراتیژیەتی هەژموونگەراییە، لە خۆسەپاندندا دەسەلات خۆبەخۆ قبووڵ ناکرێت، حیکایەتەکانی شوێنی باوە و متمانە نین، بەڵکو بە شێوازی جیاواز خۆی دەسەپێنێت، کۆمەڵگا ئیجبار دەکات قبووڵی بکات، ڕێکەوتن و متمانە لەئارادا نییە، پەنابردن بۆ توندوتیژی و بەکارهێنانی هەمەجۆری بەشێکی دانەبڕاوی ستراتیژکانی حوکمڕانییە، حوکمڕانییەک پشتی کردبێتە هەژموون و پەنای بۆ خۆسەپاندن بردبێت.[1] لە کۆتاییشدا ئاکاری دەسەلاتێک لە ڕێگای هەژموونەوە حوکمڕانیی بکات ئەوەیە کە تووشی قەیران نابێت، جێگیرە، چونکە کۆمەڵگا بەڵێ بۆ بڕیار و کارەکانی دەکات و خەڵک متمانەی پێیان هەیە و لە دەسەلاتداریێتیشیان ڕازییە.

لەژێر سایەی ئەو جیاکارییە میتۆدییەی سەرەوەدا دەکرێت بڵێین دەسەلاتدارانی هەرێم و مۆدێلی حوکمڕانییە

١ _بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر چەمکی "هەژموون" و "خۆسەپاندن" بڕوانە:
Gramsci A (1971). Selections from the Prison Notebooks. Ed. and transl. by Q. Hoare and G. Nowell Smith. New York: International.

باڵادەستەکەیان، دسەلاتدار و مۆدێلێک نین لە ڕێگای هەژموونەوە حوکمڕانی بکەن، بەڵکو لە دۆخی پەنابردنێکی بەرفراوان و بەردەوامدان بۆ ستراتیژیەت و تەکتیکەکانی "بەزۆرخۆسەپاندن". ئەمەش پەنابردن بۆ توندوتیژی و بەکارهێنانی بەرفراوانی دەکاتە بەشێکی هێجگار سەرەکی و بنەڕەتیی حکومڕانیکردن لە هەرێمدا. ئەم گۆڕانە، کە وەک وتم لە ئاستە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکەیدا، مانای گۆڕانی پێشمەرگەکانی جارانە بۆ سەرمایەدارە گەندەڵەکانی ئەمڕۆ، بونیادی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای کوردستانی دونیای دوای ڕاپەڕینی گۆڕیوە. نوخبەیەکی دەسەلاتداری بچووک و ئەو هەڵقانەی لەو دەسەلاتدارانەوە نزیکن، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا و لە ڕێگا پارەی نەوت و بازرگانییەکی مۆنۆپۆلکراوەوە، بە خێراییەکی زۆر هێجگار دەوڵەمەند بوون، بوون بە هێزێکی کۆمەڵایەتیی بەهێز و دەوڵەمەند و کاریگەرییەکانیان بۆ ناو سەرجەمی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دابەزاند. ڕاستە ئاستی ژیان لە هەرێمدا بە شێویەکی گشتیی بەرز بووەتەوە، بە بەراورد بە ساڵانی هەشتا و ساڵانی نەوەد، بەلام سەرجەمی ئەو پەیوەندییانەی لە کۆمەڵگای کوردستاندا لەنێوان هەژاری و دەوڵەمەندیدا لەئارادا بوو، پەیوەندیی نێوان کەرتە هەژارەکان و کەرتە دەوڵەمەندەکان، گۆڕانێکی گەورە و ڕیشەییان بەسەردا هات. کۆمەڵگا ڕۆژانە دەبینێت چۆن کەسان و گروپی دیارکراو، خەڵکی سەر بەم یان بەو خێزان و بنەماڵەی دیاریکراو، ئەندامانی سەرەوەی حیزبەکان هتد... لەناو تاریکی و ناشەفافیەتێکی قووڵ و هەمەلایەندا، بەبێ هیچ هۆیەکەی ماقووڵ بە خێراییەکی سەرسەرهێنەر دەوڵەمەند دەبن و ئاستی ژیانیان بە شێوەیەکی

هێجگار خێرا بەرز دەبێتەوە، لە کاتێکدا زۆرینەی کۆمەڵگا، بە بەراورد بەو مۆدێلە لە دەوڵەمەندبوونی خێرا و لەپڕ، تووشی شێوازی نوێی هەژارکەوتن دەبن. مەسەلەکە لە بنەڕەتەوە کەمتر مەسەلەی هەژارییە، بەڵکو مەسەلەی تێکچوونی ئەو پەیوەندی و هاوکێشانەیە کە هەژاری و دەوڵەمەندی لە کۆمەڵگادا بەیەکەوە گرێ دەدات. خەڵک ڕەنگە بە شێوەیەکی گشتی هەژار نەبێت، بەڵام ئەوەی تێک چووە ئەو پەیوەندییەیە کە هەژاری و دەوڵەمەندی بەیەکەوە گرێ ئەدات. ئەم دۆخە سەرچاوەی دروستبوونی چەندان قەیرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی گەورەیە، لەوانەش قەیران لە "پیاوتیی پێشمەرگانە"دا. ئەمەش وای کردوە پەنابردن بۆ توندوتیژی بووە تاقە ئامرازێکی سەرەکیی ڕاگرتن و هێشتنەوەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و ئەو پەیوەندییە تازانەی لە هەرێمدا لەنێوان هەژاری و دەوڵەمەندیدا دروست بوون. بۆیە ئەوەی پێویستە ڕوو بدات، جا تێکچوونی بەهاکان و چ توندوتیژیی دژ بە ژنانە لە کوردستاندا، نیشتەجێکردنیانە لەم ژینگە و ڕەوت و پەیوەندییە تازانەی دونیای دوای ڕاپەڕیندا. لە ڕاستیدا توندوتیژی بەرامبەر بە ژنان بەشێکە لەم دیمەنە گەورەیەی توندوتیژی لە وڵاتەکەدا، کە پرۆسە جیاوازەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروستیان کردوە. توندوتیژی بەرامبەر بە ژنان دابڕاو نییە لە پەنابردن بۆ ستراتیژیەتی بەزۆرخۆسەپاندن و پێداویستیی بەردەوامی ئەم ستراتیژە بە توندوتیژی لە هەموو فۆرمەکانیدا.

تێکەڵبوونی سیاسەت بە ئابووری و گۆڕانی پێشمەرگەکان

بۆ بازرگان و کاپیتالیستی گەندەڵ، شێوازی تری پیاوەتیی لە کوردستاندا هێنایە کایەوە، تەواو جیاواز و ناکۆک بە "پیاوەتیی پێشمەرگانە" و وێنە و بەها و مەرجەکانی. شێوازێکی نوێ لە پیاوەتی لە کوردستاندا دروست بوو، کە دەکرێت بە "پیاواتیی بزنسکار" ناوی ببەین، business masculinity.[1] ئەم پیاوەتییە تازەیە ئاکار و بەها و نرخی تایبەتی خۆی هەیە، کە دواتر بەدرێژیی باسی دەکەین، بەڵام هاوکات هێما بۆ ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتییە دەکات کە کۆنەپێشمەرگە دەسەڵاتدارەکانی ئەمڕۆ بوون بە چینێک لە بازرگان و خاوەن ئیش و بزنسیی گەورە، کە درێژکراوەی ئیقلیمی و جیهانییان هەیە و ئاکارێکی ترانسناسیۆنالی و نیولیبرالیان لەخۆ گرتوە. ئەم دۆخە تازەیە جۆرێک لە "پیاوەتیی نیولیبرال"یی بازرگانانەی هێناوەتە کایەوە، تەواو ناکۆک بە پیاوەتیی پێشمەرگانە، بەڵام نوخبە کوردییە باڵادەستەکە هەوڵ ئەدات ئەم "پیاوەتییە نیولیبراڵە" بازرگانە لەناو "پیاوەتیی پێشمەرگانە"دا جێ بکاتەوە و لەناو دونیایەکی تەواو تازەدا لەیەکتریان مارە بکات. لە ڕاستیدا ئەم تێکەڵکردن و گونجاندن و مارەکردنە زۆر زەحمەتە، ئەگەر تەواو مەحاڵ نەبێت، چونکە، وەک وتمان، ئەم دوو شێوازە لە پیاوەتی دوو شێوازی تەواو ناکۆک و دژبەیەکن. کۆنێل، کۆمەڵناسی بواری پەیوەندییە ڕەگەزییەکان، ئاکاری پیاوەتیی بازرگانانە و بزنسمانانە بەم شێوەیە نیشان ئەدات:

---

١ _بڕوانە:
Connell, R. W. (1998). 'Masculinities and Globalization'. Men and Masculinities 1 (1): 3-23

ئەوەی مارکەی ئەم پیاوەتییە تایبەتییەیە "ئەنانیەتێکی گەورە و بەسێنتەرکردنی منێکی خۆپەرستە، ئینتیمای کاتیی و کورت و مەرجدارە، لاوازبوون و بچوکبوونەوەی هەستکردنە بە بەرپرسیاریەت بەرامبەر بە ئەوانی تر، سەردەرنەکردنە لە عەقلانیەتی تەکنیکی، هەروەها پەیوەندیی سێکسیی کورت و کراوەیە". بەکورتی پیاوەتیی بازرگانی و بزنس پیاوەتییەکی خۆپەرستانە و نارسیستییە.[1] وەک دەبینین هەموو ئەم ئاکارە تایبەتانەی پیاوەتیی بزنسمان و پیاوەتیی بازرگانی نیولیبرال، تەواو ناکۆکە بە ئاکار و بەهاکانی پیاوەتیی پێشمەرگانە. وەک پێشتر باسمان کرد پیاوەتیی پێشمەرگانە پیاوەتیی لەخۆبوردن و قوربانیدان و خۆشویستنی ئەوانی تر و بەرگریکردن لە قازانجی گشتی و نەفیکردنی خۆپەرستی و بینینی خەونی یەکسانی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی ئازادییە. وە ئەم دوو جۆرە لە پیاوەتی لە هەموو شتێکدا لەیەکدی جیاواز و ناکۆکن. تێکەڵبوونی سەرمایە و دەسەلات، خۆدەوڵەمەندکردنێکی خێرا و نایاسایی، گەندەڵییەکی بەرفراوان و هەمەلایەنە، بەکورتی بالادەستیی کاپیتالیزمێکی چەتەگەرانە، وێنەی پێشمەرگەکانی دوێنێی بەتەواوی شێواندوە، ئەگەر تەواو سەرلەبەر وێرانیشی نەکردبێت. ئهوەی ئەمڕۆ ئامادەیە پیاوتیی بزنسمان و بزنسکارە لە فۆرمە نیولیبرالییە چەتەگەرانەکەیدا.وێنەی ئەم

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر هەمان بابەت بڕوانە:

R. W. Connell and Julian Wood (2005). 'Globalization and Business Masculinities'. *Men and Masculinities* 2005; 7; 347.

بزسنسمانە نیولیبرالەش تەواو ناکۆکە بە وێنەی پێشمەرگە و پاڵەوانەکانی خەباتی ڕزگاریخوازی و بەرگرییکردنی چەکداری. بەکورتی قەیرانی پیاوەتیی باڵادەست لە هەرێمدا قەیرانی هەوڵدانە بۆ تێکەڵکردن و پێکەوەگونجاندنی پیاوەتیی بزسنسمان و پیاوەتیی پێشمەرگانە و هەوڵدانی تێکەڵکردنی وێنە و بەهاکانی دووهەمیانە بە یەکەمیان. پەیوەندیی ئەم شێوازە لە پیاوەتیی بزنسمانانە بە سێکسەوە بابەتێکی گرنگە و لە لاپەڕەکانی داهاتوو دەگەڕێینەوە سەری.

ئەم قەیرانە سیاسی و ئەخلاقییانە، کە تەحەدای گەورەن بۆ پیاوەتیی پێشمەرگانە و ئەخلاقیاتە خۆنەویست و شۆڕشگێڕانەکەی، وای لە دانیشتووانی هەرێم کردوە، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ تەفسیری هەلومەرج و دۆخی ژیانی خۆیان و ئەوانەی دەسەڵاتدارەکانیان بکەنەوە، سەرلەنوێ تەفسیری سەرجەمی دۆخەکە بکەنەوە. لەم هەلومەرجەدا خەڵک تا دێت تووڕەتر و بێزارتر و بێباوەڕتر دەبن بەرامبەر بە دەسەڵاتداران، متمانەیان بەو دۆخە نامێنێت کە دروست کراوە و تێدەگەن زۆربەی هەرەزۆری ئەوەی کە دەگوترێت درۆ و خورافەتە و ئەو زمانەشی کە دەسەڵاتداران قسەی پێ دەکەن بە زمانی خۆیان نازانن. هەوڵدان بۆ دابینکردنی لانی کەمی یەکسانی و ڕێزگرتن، ڕەفزکردنی گەندەڵی و ڕەخنەکردنی پەیوەندییە ناهاوسەنگەکانی دەسەڵات، هێزی پشتی چەندەها نارەزاییدەربڕین و خۆپیشاندان بوون لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا. ئەم پرۆتێست و نارەزاییدەربڕینانە کەلێنی تریان کردۆتە دیواری پیاوەتی لە هەرێمدا. وەک

چۆن پیاوەتیی بزنسکار و بازرگانان لەپاڵ سیاسەتی نیولیبرالدا بەتەنیشت پیاوەتیی پێشمەرگانەوە هاتۆتە کایەوە، هاوکات جۆرێکی تر لە پیاوەتیی لەناو کۆمەڵگادا دروست بووە کە دەشێت بە "پیاوەتیی پرۆتێست" و "نارەزاییدەبڕین" ناوی ببەین، protest masculinity. پیاوەتیی پرۆتێست، وەک ئەدەبیاتی بواری لێکۆڵینەوەی جێدەریی پێمان دەڵێت، هەڵگری ئاکاری "شوناسێکی رەگەزییە کە پێداگری لەسەر نارەزاییدەربڕین دەکات بەرامبەر بە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و مۆدێلی بالادەستیی پیاوەتی."[1] پیاوەتییەکە دژ بە مۆدێلی ئابووریی بالادەست و دژ بە بەهاکانی مۆدێلی پیاوەتی بزنسکارە. ئەم پیاوەتییە نارازییە بە شێوەیەکی راستەوخۆ گرێ دراوە بە وێنەی ئەو گەنجە تووڕە و نائومێدانەوە کە لە هەرێمدا دروست بوون. نەوەیەکی گەنج کە وێنەی خۆیان نە لە پیاوەتیی پێشمەرگانە و نە لە پیاوەتیی بزنسن و بازرگاناندا نادۆزنەوە. ئاکاری دژە دەسەلاتی ئەم شێوازە گەنجانەیەی پیاوەتیی پرۆتێست، کە نارەزاییدەربڕین و بەرگریکردن بەیەکتری تێکەڵ دەکەن، جارێکی تر پەنابردن بۆ توندوتیژی و بەکارهێنانی فراوانتر دەکاتەوە، وەک ئامرازێک بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوان شێوازە جیاوازەکانی پیاوەتیی خۆی و بۆ چارەسەرکردنی کێشە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان خۆشیان.

بەکورتی، سیستمی پیاوەتیی پێشمەرگانە لە هەرێمدا

---

١ دەربارەی "پیاوەتی پرۆتیست" یان "پیاوەتیی نارەزاییدەربڕین" بڕوانە:
Walker, Gregory Wayne (2006). ‘Disciplining Protest Masculinity’. Men and Masculinities. July 2006 9: 5-22

درز و شـەبقیی زۆر گـەورەی تیا دروسـت بـووە و تـەواو لـەرزۆک و ناجێگیـر بـووە، شـێوازی نـوێ و دژی پیاوەتیـی تازە دروست بووە، توندوتیژییش بووە بە بەشێكی ناوەكیی چارەسـەركردنی ناكۆكییەكانـی نێـوان ئـەم جـۆرە جیاوازانـە لە پیاوەتی. دروسـتبوونی ئـەم شێوازانە لە پیاوەتیی جیاواز و ناكـۆک بەیەكتـری یەكێكـە لـە هۆكارەكانـی دروسـتبوونی ئـەو "شـڵەژانە پێوانەیی"ەیـەی باسـمان كـرد. بـۆ ئـەوەی لـە پەیوەندییـە ڕەگەزییەكانـی نێـوان نێـر و مـێ، نێـر و نێـر، مـێ و مـێ لـە هەرێمـدا بـە شـێوەیەكی گشـتی و بەتایبەتیـش لـە دیاردەی توندوتژیی ڕەگەزییدا تێبگەیـن، پێویسـتە ئـەم ژینگـە تازەیـەی دروسـتبوونی درز و شـەبقی گـەورە لـە شـێوازە باڵادەستەكەی پیاوەتیدا بـەوردی شـی بكەینـەوە. چونكـە، وەک وتمـان، یەكێـک لـە سـەرچاوە سـەرەكییەكانی دروسـتبوونی سەرلێشـێوان و "شـڵەژانی پێوانەیـی" لـە هەرێمـدا، پەیوەندیـی بـەم قەیرانـەوە لـە پیاوەتیـی باڵادەسـتدا هەیـە.

### مەسرەفگەرایی و شڵەژانی پێوانەیی

لـە سـەرەوە بـاس لـەوە كـرا كـە یەكێـک لـە سـەرچاوە سـەرەكییەكانی دروسـتبوونی "شـڵەژانی پێوانەیـی" بریتییـە لـە درسـتبوونی ئەو قەیرانە گەورەیـەی كە لە پیاوەتیی باڵادەستدا دروست بووە، تەریب بە دروسـتبوونی شێوازی تری ناكۆک و دژبەیەكـی پیاوەتـی، كـە بەسـەریەكەوەدۆخێكیان دروسـت كـردوە ئاسـان نەبێـت پیاوەتیـی بـاش لـە پیاوەتیـی خـراپ و پیـاوی بەنـرخ لـە پیـاوی بێنـرخ جیـا بكرێتـەوە، بـەڵام ئەمـە هەمـوو سـەرچاوەكانی دروسـتبوونی "شـڵەژانی پێوانەیـی"

نییە، یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی تری دروستبوونی ئەم شڵەژانە پێوانەییە ئەو شێوازەیە لە مەسرەفکەرایی کە لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا بەگشتی و لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ەوە بەتایبەتی، دروست بووە.

لە دەساڵی ڕابردوودا کۆمەڵگای کوردستانی لە هەرێمدا گۆڕاوە بۆ کۆمەڵگایەکی مەسرەفەگەری جەماوەری، بە شێوەیەک مەسرەفکەری لە هەموو شوێنێک و لای هەموو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بەسەختی ئامادەیە، تا ئەو ڕادەیەی بکرێت بڵێین ئایدیۆلۆژیای باڵادەستی ئەمڕۆکەی هەرێمی کوردستان "مەسرەفکەرایی"ە.[1] شارە گەورەکانی هەرێم، وەک هەولێر و سلێمانی، وردە وردە خەریکن دەبن بە شوێنی ئوتێلی گرانبەها و مۆڵی گەورە لەسەر شێوازی مۆڵەکانی خۆرئاوا و بازاڕ و شوێنی حەوانەوەی هێجگار گران و تازە. ئەم شارانە نەک تەنها گۆڕاون بۆ شوێنی پارەخەرجکردن و بازاڕکردنی دەوڵەمەندە تازەکانی ناو کوردستان، بۆ نموونە نوخبە ئابووری و سەربازی و سیاسییە باڵادەستەکە و هەڵقە نزیەکەکانیان، بەڵکو بوون بە بازاڕی مەسرەفکردن و پارەخەرجکردنی دەوڵەمەندەکانی ناو عێراق خۆشی. لە سەرێکی دیکەوە بەنیسبەت بەشێکی زۆری خەڵک، ئەگەرچی نەشتوانن بەشێک بن لەو مەسرەفگەراییە تایبەتە، سەردان لەم بازاڕە تازانە و سووڕانەوە بەناویاندا بەشێکی گرنگی ژیانی ڕۆژانەیان لە

---

١ ـبۆ زانیاریی زیاتر لەسەر دیاردەی مەسرەفگەرایی بڕوانە: مەریوان وریا قانع (٢٠١٣). لە چ ئیستایەکدا دەژین؟ دەربارەی بەرخۆریی و دین و دراوسێکانمان. سلێمانی. ئەندێشە بۆ چاپ و بلاوکردنەوە.

هەرێمدا پێک دەهێنێت. ژمارەیەکی زۆر لە چێشتخانە، لەبار و یانە، لە شوێنی یاری و حەسانەوە، لە چەندان شوێنی تازەی خواردنی خێرا کراونەتەوە و خەڵک ڕۆژانە سەردانیان دەکات. چێشتخانە و ئوتێل و بازاڕە کۆن و سونەتییەکان تا ڕادەیەکی بەرچاو چۆڵ بوون، یان ناچار بوون خۆیان تازە بکەنەوە، یان داخراون، چونکە شێوازی پارەخەرجکردن و مەسرەفکردن لە کوردستاندا گۆڕانی گەورەیان بەسەردا هاتوە. خواردنی بیانی، لە پیتزای ئیتالییەوە بیگرە بۆ سوپی چینی و لەوانیشەوە بۆ خواردنی فەرەنسیی تێکەڵ بە شیرقاوەی هۆڵەندی و کاپاچینۆ و ئسپریسۆی ئیتالی لە چەندەها شوێنی جیاوازدا دەفرۆشرێن. ئەمانە ئەو ژێرخانەن کە مەسرەفگەراییان لە هەرێمدا لەسەر وەستاوە. جگە لەمە بڵاوبوونەوەی خێرا و بەرفراوانی مەسرەفگەرایی بەگلۆباڵبوو پاڵپشتێکی بەهێزی ئایدیۆلۆژیای مەسروفگەراییە لە هەرێمدا. ئەمەش لە سەرێکەوە پەیوەستە بە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای پەیوەندیکردنەوە بە بەشە جیاوازەکانی دونیاوە، لە سەرێکی تریشەوە پەیوەستە بە فراوانبوونی پەیوەندیی کوردەکانی هەرێم بە کوردەکانی دەرەوەی کوردستانەوە.

لە پەیوەدنیدا بە دابەشکردنێکی نایەکسان و نادادپەروەرانەی داهاتی نەوتەوە بەسەر دانیشتووانی هەرێمدا، کۆمەڵێک مۆدێل و شێواز و ئاستی جیاوازی مەسرەفگەرایی لە هەرێمدا دروست بووە. دەکرێت سێ گروپی مەسرەفگەر و سێ شێوازی جیاوازی مەسروفگەرایی لەیەکتری جیا بکەینەوە.[1] یەکەمیان ئەو گروپەیە کە ئاستی مەسرەفگەراییان وەک

١ ــــهەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦-٣٨

شێخە دەوڵەمەندەکانی خەلیج و بازرگانە گەورەکانی تورکیا وایە، ئەمانە نوخبەیەکن، زۆر جار نوخبەی حوکمڕانی هەرێم و خێزان و خزم و هاوڕێ و دۆستەکانیانن، خەڵک لە کوردستاندا پێیان دەڵێن "فیرعەونەکان" یان "ملیۆنێرە تازەکانی دوای ڕاپەڕین". گروپی دووهەمیان ئەوانەن کە لە ئاست و تواناکانی چینی ناوەڕاستدا مەسرەفگەرن و زۆر جار ئەو کەرەستە و شتومەکانە دەکڕن و بەکار دەهێنن کە لە تورکیادا دروست دەکرێن، کە زۆر هەرزانترن لەو شتومەکانەی لە ئەوروپاوە بۆ هەرێم دەهێندرێن. گروپی سێهەمیش زۆرینەی دانیشتووانی هەرێمە، کە داهاتی مانگانەی هەریەکێکیان وەک تاک، کەمترە لە ١٠٠ دۆلار. ئەمانە ئەو شتومەک و کەرەستە خراپ و هەرزانانە دەکڕن و بەکار دەهێنن کە لە چینەوە دەهێنرێن.[١]

مەسرەفگەرایی لە هەرێمدا تەنها خوویەکی کۆمەڵایەتیی نوێ نییە، بەڵکو ئامرازێکی سەرەکی و بنەڕەتیی خۆجیاکردنەوەی کۆمەڵایەتی و کێشانی سنوورە لەنێوان چینەکاندا، لەنێوان ئەوانەدا کە هەیانە و ئەوانەدا کە نیانە. واتە ئامرازێکی گرنگ و سەرەکیی بەرهەمهێنانی شوناسە. هاوکات ئامرازی سەرلەنوێ سەپاندنەوەی ئەو هیرارکیەتە کۆمەڵایەتییە تازەدروستکراوەشە کە پشتی تەواوی بە دەسەڵاتی سیاسی و دیاردەی خزمچێتی و میکانیزمی بنەماڵەپەرستی بەستوە. مەسرەفگەرایی هاوکات ئامرازێکی سەرەکیی و گرنگی بەخشین و پاراستنی ڕەوایەتیی ئەو دۆخەیە کە لە هەرێمدا دروست کراوە، واتە مەسرەفگەرایی

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٩

بووە بە بەشێک لە مەسەلەی ڕەوایەتیی سیاسی. دەسەڵاتداران لە هەرێمدا دەڵێن بڕوانن هەمووکەس توانای پارەخەرجکردنی هەیە و ئەم توانایەش وەک "دەسکەوت"ێک بۆ خۆیان وێنا و بڵاو دەکەنەوە. بەکورتیی مەسرەفگەرایی لە هەرێمدا بووە بە شێوازێکی تایبەتی پیادەکردنی دەسەڵات، شێوازێک بە هۆیەوە بتوانرێت ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە پڕ قەیرانە ڕام و ئاراستە بکرێت. ئەمەش وای کردووە مەسرەفگەرایی بەشێکی گرنگی ئەجندای سیاسی نوخبە باڵادەستەکەی هەرێم بێت، نەک تەنها لەبەر ئەوەی پێگە سەرەکییەکانی ئابووریی مەسرفگەرایی لەژێر دەستی خۆیان و کەسە نزیکەکانیاندایە، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە دەیانەوێت و هیوادارن بۆیان بکرێت لە ڕێگای مەسرەفگەراییەوە ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵایەتیی بەرقەرار بکەن. بێگومان ئەم ستراتیژیەتە بێ دەرەنجامی ترسناک نییە، مەسرەفگەرایی بەو شێوەیەی لە کوردستاندا هەیە ناتوانێت بنەمای دروستکردنی سیستمێکی سیاسیی پتەو و هێمن و جێگیر بێت. لەبەر ئەوەی نایەکسانییەکی هێجگار گەورە لە توانا و ئاستی مەسرەفگەراییدا هەیە، کە دەتوانن ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان توندتر و ترسناکتر بکەنەوە و لە دۆخی ئامادەگیی گەندەڵییەکی زۆر و بینراویش لە هەرێمدا، مەسرەفگەرایی ئەگەری ئەوەی هەیە تەقینەوەی کۆمەڵایەتیی گەورە دروست بکات.[1] هۆکارێکی گرنگی

---

١ _بۆ پەیوەندیی نێوان مەسروفگەرایی و تەقینەوەی کۆمەڵایەتی بڕوانە:
Hall, S., Winlow, S and Ancrum, C. (2008). Criminal Identities and Consumer Culture. Cullompton: Willan. See also: Haywad, K., (2004). Consumer culture and crime in late modernity. In: Summer, C. (ed.). The Blackwell

سنوورداربوونی مەسرەفگەرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییە سۆسیۆلۆژییە سادەیەکە لە خاڵێکدا خەڵک چیتر بەوە ڕازی نابێت تەنها بەرخۆر و مەسرەفگەریی کاڵا چینییە خراپ و هەرزان و بێکەڵکەکان بن. خەڵک دەیانەوێت کاڵا باش و گرانەکانیان هەبێت، ئەمەش تەواو ناکۆکە بە سیاسەت و شێوازی باڵادەستی دابەشکردنی سەروەت و سامانی نیشتیمانی لە هەرێمدا. لەدوای زەمەنێک لە پیادەکردنی مەسرفەگەراییەوەچیتر ئەوە بەس نییە خەڵک سەلاجەیەکی دیکە، یان سپلیتێکی تر، یان تەلەفیزۆنێکی تر بکڕن، لە خاڵێکدا ئەمانیش دەیانەوێت شوقەیەک، ئۆتومبێلێکی تازە و باش، ئای پاد و ئای پۆت و کامێرا و کۆمپیوتەری باش و گرانبەها بکڕن. مەسرەفگەرایی لە شوێنانی تر، کە هەرێم لەمە بەدەر نابێت، بۆتە هۆکاری "دروستبوونی ڕووبەری کۆمەڵایەتیی نوێ کە ئارەزووی تاکەکەسی، ستایەڵی ژیان، هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی ئامرازەکانی گەیشتن بە ئاسودەگیی مادی، بەئاشکرا و لەبەردەمی کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی بەرچاو و ئاهەنگئامێزانە نمایش بکرێت".[1] مەسرەفگەرایی تەنها وەک کردەیەکی شەخسی نامێنێتەوە، بەڵکو دەبێتە کردەیەک کە کۆمەڵگا پێویستە بیبینێت و تاکەکەس لە ڕێگایەوە خۆی نمایش بکات. ئەمەش وا دەکات پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان مەسرەفکردن و شوناسدا دروست ببێت، تاکەکەس بوون و شوناسی خۆی بەو شتانەوە گری بدات کە

Companion to Criminology. Oxford, Blackwell.

١ _بڕوانە:
Yan Unxiang (2009). The Individualization of Chinese Society. Oxford and New York: Berg. p. xxxvi

دەتوانێت بیانکڕێت و مەسرەفیان بکات. کاتێکیش کەسەکان نەیانتوانی مەسرەف بکەن بۆ ئەوەی شوناسە تازەکەیان وەک مەسرەفکەرێک لەبەردەمی کۆمەڵگادا نمایش بکەن، لەبەر ئەوەی توانای مادیی مەسرەفکردنیان نییە، ئیدی ئەگەر و مەترسیی نائارامی و تەقینەوەی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات. بەتایبەتی لە ژینگەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا کە خەڵک بەبەردەوامی هەست بەوە بکەن کە نایەکسانیی و خراپ دابەشکردنی دەسەڵات و سەروەت و سامانی نیشتیمانی باڵادەستە. بەکورتی، مەسرەفگەرایی وەک چۆن دەشێت هۆکارێک بێت بۆ سەرقاڵکردنی کۆمەڵگا و بەناسیاسیکردن و بەتاڵکردنەوەی کەسەکان لە هەر دید و کردەیەکی ڕەخنەیی، دەشێت سەرچاوەیەکی گرنگ بێت بۆ دروستبوونی شێوازی نوێی نارەزایەتیی کۆمەڵایەتی، تا بە ئاستی یاخیبوون و تەقینەوەی کۆمەڵایەتی، دەگات.

لە کوردستاندا شێوازێکی زۆر تایبەتی مەسرەفگەرایی لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی "شلەژانی پێوانەیی"ەوە شایانی گرنگیپێدانی زیاترە، ئەو دیاردەیەش گۆڕانی سێکسە بۆ کالایەکی قابیلی کڕین و فرۆشتن، دروستبوونی بازاڕ بۆ "سێکسفرۆشی" و "سێکسکڕین". مەسرەفگەراییی سێکس وەک دیاردەیەکی نوێ، بوونی سێکس بە بەشێک لە دروستبوونی بازاڕێکی تایبەت بۆ کڕین و فرۆشتنی چێژ لە هەرێمدا؛ دیاردەیەکی نوێیە و شایانی لەسەروەستانە. بەشداریکردنی ئەم گۆڕانکارییە تازەیە لە مەسروفگەرایی سێکسدا بەشدارییەکی گەورەیە لە مەسەلەی "شلەژانی پێوانەیی"دا.

## سێکس وەک کاڵایەک بۆ مەسرەف

سێکس بەشێکە لە بازرگانییەکی تازە و گەشەکردوو لە هەرێمدا، ئەم بازرگانییەش بەشێکی گرنگە لە بازرگانییەکی گەورەتر کە بازرگانیی چێژە. بازرگانیی سێکس لە هەرێمدا هەم دیاردەیەکە پەیوەندیی بە دەسەڵاتەوە هەیە، هەم بە چێژەوە بە گشتی، هەم پەیوەندییەکی پتەو و فراوانیشیان بەو دونیا نوێیەوە هەیە کە نوخبە دەسەڵاتدارەکەی هەرێم لە دونیای دوای نەمانی ڕژێمەکەی سەدام حوسەیندا دروستیان کردوە. بوونی سێکس بە بازرگانییەکی بەرچاو لە زۆر سەرەوەدا پەیوەندیی بەو شێوازە لە پیاوەتییەوە هەیە کە بە "پیاوەتیی بزنسنمان" یان "پیاوەتیی بازرگانی" ناومان برد. ئەم شێوازە لە پیاوەتی ئامادەیە بازرگانی بە هەموو شتێکەوە بکات، لەوانەش بە سێکسەوە. هەروەها پەیوەستە بە شێوازێک لە دەسەڵاتەوە کە دروستکردن و دارشتەنەوەی دونیا لە یەک کاتدا هەم قازانجی گەورە ببەخشێت، هەم بکرێت بەئاسانی بەڕێوە ببرێت و حوکم بکرێت. کردنی بازرگانیی سێکس بە بەشێک لە هەردووکیان. هاوکات سێکس ئامرازێکی گرنگی پراکتیکیی دەسەڵات و تواناکانی بەڕێوەبردنیەتی. لەم ڕووەوە دەسەڵات دەتوانێت میکانیزمەکانی وروژاندن و ئیغراکردن بەکار بهێنێت وەک ئامرازی کۆنترۆڵ و ئاراستەکردن، یان ئامرازی دروستکردنی وەلائەت. بە مانایەکی دیکە دەسەڵات لەباتیی ئەوەی بەبەردەوامی پەنا بۆ میکانیزمەکانی فشار و سەپاندن و بەکارهێنانی هێز ببات، پەنا بۆ کردنی سێکس بە ئامرازێکی سیاسی دەبات، یاخود پەنا بۆ گەمەکردن بە چێژەوە دەبات وەک ستراتیژیەتی خۆسەپاندن.

هەر لە ساڵی ٢٠٠٧دا هەواڵی بوون و دروستکردنی چەندان تۆڕی قاچاخی بازرگانیکردن بە سێکسەوە، بوونی ماڵی پڕ سۆزانی و کڕین و فرۆشتنی سێکس لە هەندێک هۆتێل و سێنەتری خۆڕازاندنەوە و خۆجوانکردن لە هەرێمدا، گەیشتە ناو میدیاکانی کوردستان. یەکەمین لێکۆڵینەوەی جیددی لەسەر ئەم مەسەلەیە: کتێبەکەی خەندان موحەمەد بوو بە ناونیشانی: *ئۆقیانووسێک لە تاوان.*[١] لەدوای بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەوە بابەتی بازرگانیکردن بە سێکسەوە بوو بە یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی ناو میدیای کوردی و زیاد لە گفتوگۆ و موناقەشەیەکی ئاشکرای، لە ڕێگای ڕێکخستنی چەندان کۆڕ و سیمینارەوە، لەسەر دروست بوو. کتێبەکە پەردەی لەسەر دیاردەی دروستبوونی چەندان تۆڕی بازرگانیکردنی قاچاغ بە سێکسەوە لە کوردستان و لەسەر دروستبوونی چەندان ماڵ و سێنەتری فرۆشتنی سێکسی لە شارەکانی کوردستاندا لا برد. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەی ئاشکرا کرد کە چەندان کەسایەتی و بازنەی گرنگی دەسەڵات بەشێکن لەم دیاردەی پیشەسازی و بازرگانیکردنە قاچاغە بە سێکسەوە. ئەم کتێبە پشتی بە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ٢٩٦ سۆزانی و ٩٣ کڕیاری سێکس و ٧٢ شەقاوە و بەڵتەجی بەستوە، کە بەشێکن لە تۆڕی فراوان و ڕێکخراوی ئەم بازرگانییە لە هەرێمدا.[٢] کتێبکە پڕە لە حیکایەتی دڵتەزێنی چەندان

---

١ بڕوانە: خەندان حەمەجەزا (٢٠٠٧). ئۆقیانووسێک لە تاوان. سێنتەری کۆمەڵایەتی و کولتووریی خانزاد. هەروەها بڕوانە: UNAMI Human Rights Reports in Iraq on: http://www.uniraq.org/index.php?option=com_k2&view=ite mlist&layout=category&task=category&id=164&Itemid=650&lang=en. pp. 35-36.

٢ _خەندان حەمەجەزا، ل ٢٣

کچی گەنج لە کوردستاندا کە خێزانەکانیان ناچاریان کردوون کاری سێکسفرۆشی بکەن. بڵاوبوونەوەی *ئۆقیانووسێک لە تاوان* شۆکێکی گەورە بوو، چونکە هێمای بۆ کۆمەڵێک بەهای ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی نوێ دەکرد کە گوتارە سونەتییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی بە بەهای نامۆ و خراپ و ترسناک ناویان دەبەن. لەوانەش بەشداربوونی باوکان و براکان و مێردەکان لە پاڵنان بە کچەکانیان و خوشکەکانیان و ژنەکانیانەوە بۆ فرۆشتنی سێکس. کتێبەکە وێنەیەکی خێزانی کوردی نیشان ئەدات، تەواو جیاواز لەو وێنە تەقلیدییە، ڕۆمانسی و ئایدیالی و پاتریارکییە سونەتییەی لە کۆمەڵگادا سەروەرە. وێنەی خێزانی کوردی وەک مێرگێکی بچووک و ئارام کە مرۆڤەکانی ناوی لە پەیوەندییەکی خۆشەویستیی قووڵدان و هەمووشیان لە دۆخی مشوورخواردنێکی گەورەی یەکتردان.

سێ ڕەهەندی ئەم کتێبە بۆ ئەم باسەی ئێمە گرنگە. یەکەم، زۆرینەی ئەوانەی سێکس دەکڕن خەڵکانێکی خوێندەواری گەنجن و دانیشتووی شارەکانی کوردستانن. دووهەم، فرۆشتنی سێکس و بوون بە سۆزانی هەمیشە پەیوەندیی بە بوونی هەژارییەوە نییە، بەڵکو بە پلەی یەکەم، دەرەنجامی ئەو فشارە گەورەیەیە کە ئایدیۆلۆژیای مەسرەفگەرایی و بەرخۆریزم لەسەر تاکەکەسەکان دروستی دەکات، فشاری ئەوەی مرۆڤ خۆی وەک مەسرەفگەرێک ببینێت و وێنا بکات و تا دێت زیاتر و زیاتر سەرف بکات و بەرخۆر بێت. لەم پێناوەشدا ئەنجامدانی هەموو کارێک کە دەسکەوتێکی مادیی بخاتەوە و بتوانێت ببێتە هۆکاری کۆکردنەوەی هێز و سامان، لەوانەش لەشفرۆشتن. هەموو ئەمەش بە مەبەستی کڕینی کاڵا تازەکان و بەشداربوون

لەو پیشەسازییە پڕ ڕەواجەی خۆجوانکردن و خۆگەنجکردندا کە لە هەرێمدا دروست بووە. کە ئەمە دەڵێم نامەوێت بەرگری لەو بۆچوونە بکەم کە هەژاری هیچ پەیوەندییەکی بەم دیاردەیەوە نییە، ئەوەی من دەمەوێت نیشانی بدەم ئەوەیە مەرج نییە هەژاری هۆکاری لەشفرۆشی بێت، بەڵکو وێناکردنی خود وەک بوونەوەرێکی بەرخۆر و مەسرەفگەر هۆکارێکی گرنگ و بەهێزە. سێهەم، ئەگەرچی کتێبەکە ناوی هیچ تاکەکەس و کۆمەڵەکەسێک نابات، کە ئەم بازرگانی و پیشەسازیی سێکسە بەڕێوە دەبەن و قازانجی لێ دەکەن، بەڵام هێما بۆ بەشداربوونی کەسانی بەرپرس و خاوەن دەسەڵات لەم پیشەسازییەی ناو هەرێمدا دەکات. خەندان حەمەجەزا دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی ناچار بوو کوردستان بەجێ بهێڵێت و وەک پەناهەندە ڕوو بکاتە ئەوروپا.[1]

لە هەمان ماوەدا میدیای کوردی لە هەرێمدا دەستی کرد بە گرنگیدان بەم دیاردەیە و بە شێوەیەکی بەرفراوان کەوتە نووسین لەسەر مەسەلەی بازرگانی و تۆڕەکانی پیشەسازیی سێکس لە هەرێمدا. بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەگەریی لە ساڵی ٢٠١٠دا نیزکەی ٤٥ باندی بازرگانیکردن بە سێکسەوە لە کوردستاندا هەبوون و چالاک بوون، لەوانە ١٩ لە شاری

---

١ _لە کۆڕێکدا لە شاری ئەمستردام کە لە ڕۆژی ٢٢-٦-٢٠٠٨ بۆ خەندان حەمەجەزا گیرا، ئەم خانمە بە منی وت کە ئەو زانیاریی زۆر زیاتری لایە لەوەی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە، بەڵام ئەو نایەوێت ناوی هیچ کەسێک بهێنێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:
http://www.chaknews.com/kurdish/news.php?readmore=1893.

هەولێر و ١٧ لە سلێمانی و ٩ لە دهۆک.[١] لە هەندێک کافێ و باڕ و سێنتەری شێلان و مەساجکردنیشدا، تەنانەت لە هەندێک چێشتخانەشدا، سێکس دەکڕدرێت و دەفرۆشرێت.[٢] بەپێی هەندێک ئامار و زانیاریی دەزگای ئاسایش خۆشی ژمارەی ئەو ماڵانەی لە شاری سلێمانیدا سێکس دەفرۆشن لە ساڵی ٢٠١٢ بەرز بوونەتەوە بۆ ٤٠٠ ماڵ. ئەو ماڵانە لەپاڵ فرۆشتنی سێکسدا مادە هۆشبەرەکانیش تیایاندا هەم بەکار دەهێنرێن و هەم دەشفرۆشرێن.[٣] هەندێک لایەنی ڕەسمییش دروستبوونی بازرگانی و پیشەسازیی سێکس لە کوردستاندا بەو ئابووری گەشتوگوزارییەوە گرێ ئەدەن، کە لە ساڵانی ڕابردوودا لە کوردستاندا گەشەی کردوە.[٤]

هەموو ئەم بازرگانی و پیشەسازییە تایبەتەی سێکس لە کۆمەڵگایەکدا ڕوو دەدات کە تا ئێستاش سێکس بەر لە ژنهێنان و شووکردن وەک تاوان تەماشا دەکات و کوشتنیش لەسەر شەرەف یەکێکە لە دیاردە بەرچاوەکانی ناوی. لێرەدا ناکۆکییەکی گەورە و هەمەلایەن لەنێوان ئەو گوتارە ئەخلاقی و دینییانەدا هەیە کە لە دەوروبەری سێکس و ژیانی سێکسی دروست کراون،

---

١ _بڕوانە:
http://chnaran.com/vb/archive/index.php/t-9867.html.

٢ _بۆ نموونەیەک لەسەر ئەم شێوازە لە فرۆشتنی سێکس بڕوانە بەسەرهاتی ئەو سێ خوشکە لەم ژمارەیەی ڕۆژنامەی ئاوێنەدا:
http://www.awene.com/article/2014/08/30/35293. Accessed on 31 August 2014.

٣ _بڕوانە:
http://werash.wordpress.com/2011/07/14/188-3/.

٤ _بڕوانە: "هەرێمی کوردستان دەبێت بە بەهەشتی لەشفرۆشی بۆ هەموو عێراق": http://qadirzada.com/lash.froshi.html.

لەگەڵ ئەو واقیعە کۆمەڵایەتی و سیاسییەدا کە سێکسفرۆشی بووە بە کاڵا و بازرگانییەکی گەورە و گرنگ لەناویدا. ئەوەی لە دەرەنجامی ئەم ناکۆکییەوە لەدایک دەبێت ئەو دۆخەیە کە من بە "شڵەژانی پێوانەیی" ناوی دەبەم. ئەم شڵەژانە بەشێکە لەم دۆخە تایبەت و ئاڵۆزە کە لە دونیای بەر لە ڕاپەڕین و بەتایبەتی بەر لە کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەیندا بەم شێواز و فراوانییەی ئەمڕۆ بوونی نەبووە. شڵەژانی پێوانەیی دۆخی دەرونی و بەهایی و ئەخلاقیی قۆناغی دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام و بەهێزبوونی گوتاری بەرخۆری و دروستبوونی نوخبەیەکی سیاسی و بازرگانییە کە هەمووشتێک دەگۆڕن بۆ کاڵا. کاڵایەک بکرێت بکڕدرێت و بفرۆشرێت، بە مەرجێک قازانج و دەسکەوتی ئەو نوخبەیەی تێدا بێت.

بەڵام ئەمە هەموو مەسەلەکە نییە، چونکە هاوشان بەم پیشەسازیی سێکسە لە کوردستاندا گۆڕانێکی گەورە لە "ڕۆشنبیریی سێکسی"شدا ڕووی داوە و گوتارێک لەسەر سێکس لەئارادایە کە پێشتر لە کۆمەڵگای کوردیدا لەئارادا نەبووە، ئەم گۆڕانەش لەلایەن خۆیەوە بەردێکی تر دەخاتە سەر دیواری دیاردەی "شڵەژانی پێوانەیی" و خودی سەرلێشێوان و شڵەژانەکە قووڵتر و فراوانتر دەکاتەوە. با سەرنجێک لەم گۆڕانە تازەیەی تریش بدەین.

### سێکس وەک گوتارێکی گشتی و ئاشکرا

هاوشان بە بازرگانی و پیشەسازیی سێکس لە کوردستاندا، گوتارێکی تازەش لەسەر سێکس و ژیانی سێکسی دروست بووە کە لە هەموو ڕوویەکەوە تازەیە و بەشێکە لەو ژینگە

سیاسی و کۆمەڵایەتییە کە سێکسی گۆڕیوە بۆ کاڵایەکی گەورەی بازرگانی. یەکێک لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی ئەم گوتارە، نیشاندان و وێناکردنی پیاو و ژنە وەک بوونەوەری سێکسی و وێناکردنی سێکسیشە وەک ڕەهەندێکی هێجگار گرنگ و سەرەکیی ژیانی تاکەکەسی. وێنەی پیاو وەک "نێرێکی سێکسی"ی و وێنەی ژن وەک "مێیەکی سێکسی" لە سێنتەری ئەم گوتارەدایە. ئەم گوتارە خەریکی خۆشەویستکردن و ئیعجابدەربڕینە بەرامبەر بە لەشە سێکسییەکان و ئەم لەشانەش وەک بەشێکی گرنگی شوناسی تاکەکەسی و وەک بەشێکی سەرەکیی ژیانی گشتییش نمایش دەکات.[1] لەشی سێکسی لەم گوتارەدا لەشێکی بەرزنرخێندراو و خوازراوە، سێکس خۆشی بەشێکی گرنگ و سەرەکیی شوناسی ئەو لەشانەیە. خەڵکی کوردستان بە هۆی ئامادەگیی چەندان یاسا و بەها و نرخی کۆمەڵایەتییەوە کە لە ڕووی سونەتییەوە مەسەلەی سێکسی لە کۆمەڵگای کوردستانیدا ڕێک خستوە، هەمیشە جۆرێک لە بێدەنگیی ڕێژەیی و داپۆشینی سەرەتاییی بەدەوری سێکسدا دروست کردوە، کەچی ئەمڕۆ ئەم کۆمەڵگایە چەندەها کەناڵی جیاوازی لەبەردەمدایە بۆ بینین و بیستن و باسکردن و هەستکردن بە بوونی بەرفراوانیی سێکس لە ژیانی تاکەکەسی و لە ژیانی دەستەجەمعیدا. کە ئەمە دەڵێم نامەوێت بەرگری لەو دیدە بکەم کە سێکس لە

---

١ ـ ڕۆڵی مۆسیقای جەماوەریی نوێ لە کوردستاندا لە مەسەلەی بەسێکسیکردن و بە ئیرۆتیکیکردنی جەستەدا ڕۆڵێکی گرنگە، بەتایبەتی ڕۆڵی ئەو مۆسیقایەی کە کوردە کۆچبەرەکانی ئەورووپا بەرهەمی دەهێنن. وردبوونەوە لەم دیاردەیە ئەگەرچی گرنگە، بەڵام دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینە.

دونیای ئێمەدا بابەتێکی یاساغ و حەرامکراو بووە، سێکس لەم کۆمەڵگایەدا هەم لەناو مۆسیقا و گۆرانیی کۆندا ئامادەیە، هەم لەناو شیعری فۆلکلۆریدا، هەم لەنێوان ئەفسانە و چیرۆکە میللییەکاندا، هەم لەناو نەسیحەت و ئامۆژگارییکردنە دینی و ئەخلاقییەکاندا. بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ جیاوازە ئەوەیە کە سێکس تەنها لەناو زماندا ئامادە نییە، بەڵکو لەناو فەزای بینین و کڕین و فرۆشتنیشدا ئامادەیە. ئەمڕۆ جگە لە وێنە و فیلم و نمایشکردنی سێکس، بازاڕێکی گەورە بۆ کڕینی سێکس لە هەرێمدا هەیە و ئامادەیە. بێگومان چەندان جۆری جیاوازی نەفرەتکردن و ناڕەزایی دینی و نادینی بەرامبەر بەم گۆڕانکارییانە لەئارادان، هەروەها کۆمەڵێک میکانیزمیش هەن بۆ سزادانی ئەم شێوازە تازەیە لە مەسرەفکەرایی سێکسی، بەڵام هاوکات تا دێت ڕووبەرێکی گەورەتر بۆ بازرگانی چێژ و بۆ بازاڕی ڕابواردن دروست دەبێت کە باز بەسەر ئەو نەفرەت و یاسا و بەهایانەدا ئەدات کە بۆ ڕێکخستنی ئامادەگیی سێکس لەناو ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا دروست کراون. هەروەها "ڕۆشنبیرییەکی نوێ" سەبارەت بە سێکس و بە نمایشکردنی لەشی سێکسی لە ژیانی گشتیشدا هاتۆتە کایەوە کە لە زیاد لە کەناڵێکەوە تەعبیر لە خۆی دەکات، لە تەلەفیزۆن و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە بیگرە بۆ سایتەکانی سەر ئینتەرنێت و میدیای دیگیتاڵ. چێژەکانیش لە ڕێگای شەپۆلێکی گەورە لە وێنە و فیلم و ڕیکلامەوە، لەوانەش بۆ نموونە نمایشکردنی لەشە سێکسییەکان لەناو تەلەفیزیۆن و سایت و مۆڵە گەورەکان و بازاڕەکانی دیکەدا دروست و ئاراستە دەکرێن. لێرەدا، وەک نووسەرێک

لەدوای جان فرانسوا لیوتارەوە دەڵێت، دوو پرۆسەی سەرەکی دەستبەکارن: "لە سەرێکەوە بەشێک لە ئابووریی ئیرۆساوی دەکرێت، بەلام لە سەرێکی دیکەوە بەشێکیش لە لیبیدۆ، واتە وزەی سێکسی، بە کالایی و بازرگانی دەکرێت."[1]بەکارهێنان و خستنەگەڕی ئابوورییانەی ئیرۆتیک، هاوکات بە ئیرۆتیکیکردنی هەندێک ڕەهەندی ئابووری، ئەو ژێرخانە دروست دەکات کە ئەم گوتارە نوێیە سەبارەت بە سێکس و جەستە و سەبارەت بە نمایشکردنی سێکس و باسکردنی لە ژیانی گشتیدا دەستنیشان دەکات. بۆ نیشاندانی ئەم گۆڕانکارییانە با سەرنج لەم چەند نموونەیەی خوارەوە بدەین.

ڕێکخستنی کێبەرکێی شاجوانی کوردستان، ڕێکخستنی نمایشی جلوبەرگی مۆدە،fashion shows، کردنەوەی ژمارەیەکی زۆری سەنتەری وەرزشی بۆ گرنگیدان بە لەش و مەساجکردن، لە هەمووشی ئاشکراتر ڕووماڵکردنێکی بەرفراوانی میدیایی ئەو شتانە و ڕیکلامبۆکردنیان، نموونەیەکی بەرچاوی ئەو بەبازرگانیکردن و بەسێسکسیکردنەی جەستە و جوانین لە هەرێمدا کە پازدە ساڵێک لەمەوبەر بوونیان نەبوو. سیستمێکی گەورەی تەرفیە و سەرگەرمکردنیش بەدەوری سێکس و لەشە سێکسییەکاندا دروست کراوە، لەوانەش بۆ نموونە داوەتکرنی بەردەوامی برێک لە ژنە گۆرانیبێژە جەماوەرییە تورک و ئێرانی و عەرەبەکان، کە

---

١ _بڕوانە:
Rutherford, Paul (2007). A World Made Sexy, Freud to Madonna. University of Toronto Press. p.6

زۆربەیان ئاستی مۆسیقا و گۆرانیوتنیان هێجگار نزمە، بەڵام خاوەنی لەشولارێکی سێکسیی سەرنجڕاکێشن و وەک سیمبۆلی لەشێکی سێکسی دەخرێنە ناو فەزای ڕیکلام و تەلەفیزیۆن و نمایشی ناو هۆتێلە گرانبەهاکان و ناو سایتەکانی ئینتەرنێتەوە. پەیدابوونی جۆری تازەی گۆرانی و مۆسیقای کوردیی خۆشی لە فۆرمی ڤیدیۆکلیپدا، کە نمایشکردنی لەشی جنسی و وورووژاندنی ئارەزوی سێکسی و گەشەدان بە خەیاڵی سێکسی ئاراستەیان دەکات، تەنانەت جۆرێک لە شیعریش پەیدا بووە کە تیایدا لەشی ئافرەت وەک لەشێکی تەواو سێکسی و چێژبەخش نماییش دەکرێت.[1] ڕۆڵی فۆتۆگراف، فیلمی کورت، فەیسبوک، تەلەفیزیۆنی بازرگانی لەم گۆڕانکارییانەدا زۆر گرنگن. ئەم تۆڕە ئاڵۆز و خۆسەپێنەی پەیوەندیی ئەلەکترۆنی لە ئاستێکی هێجگار بەربڵاودا لەشی سێکسی و وێنەی ئیرۆتیکی دروست و بڵاو دەکاتەوە.[2]

ئەم گۆڕانانە بە ڕادەیەک هەمەلایەن و بەربڵاون، دەکرێت قسە لە لەدایکبوونی "ئایدیۆلۆژیا"ی ئیرۆتیزم بکەین، یان قسە لە ئیرۆتیزم بکەین وەک ئایدیۆلۆژیا، ئیرۆتیزم وەک سیستمێکی ڕەمزی بۆ جووڵاندن و ورژاندنی هەست و حەزی سێکسی. کە ئەمەش دیسانەوە پەیوەستە بە لەدایکبوونی "پیاوەتیی بزسنس"ەوە یان "پیاوەتیی بازرگانیی"ەوە، کە ئاڵوگۆڕکردن بە

---

١ _یەکێک لەو شاعیرانە ئەم شێوازە لە شیعر بەبەردەوامی دەنووسێت قوبادی جەلی زادەیە.

٢ _لە هەندێک دۆخی تایبەتدا خراپبەکارهێنانی میدیای کۆمەڵایەتی و تەلەفۆنی مۆبایل بوونەتە هۆی ئەوەی هەندێک ئافرەت یان کچی گەنج خۆیان بکوژن یان لەلایەن خێزانەکانیانەوە بکوژرێن.

سێکسەوە وەک کاڵایەکی بازرگانی لە دەرەوەی هەموو تابوە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و دینییەکانەوە دەبینێت. پیاوەتییەک دڵخۆشە بە "سێکسێک کە دابڕاوە لە مەسەلەی سکپڕبوون و منداڵ و خێزاندروستکردن."[1] لەم دۆخە تازەیەدا سێکس وەک چێژ و لەش وەک ڕووبەرێکی سێکسیی لیبیدی تەماشا و نمایش دەکرێت. دەبێت لێرەدا ئەو خاڵە ئاشکرا بێت کە ئەم پیشەسازییە تازەیەی چێژ و ئەم وەرچەرخانە لە وێناکردنی لەشدا لەبەردەستی هەموو یەکە و توێژە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە، ئەم فۆرمە لە لیبیدۆی بەبازرگانیکراو تەنها لەبەردەمی ئەو کەس و توێژانەدایە کە توانای کڕین و چێژلێوەرگرتنیان هەیە، واتە بە پێگە ئابوورییەکانەوە گرێ دراون کە ئەوانیش ڕاستەوخۆ پێگە سەرەکییەکانی سیاسەت و دەسەڵاتن لە کۆمەڵگادا.

میدیای کوردی ئامرازی دابەشکردن و بڵاوکردنەوە و دروستکردنی ئەم گوتارە تازەیەیە. ئەم میدیایە پڕە لە وێنەی سێکسی و لە وتار و نووسین و سەرنج لەسەر سێکس، پڕە لە نووسین لەسەر ڕووکارە جیاوازەکانی ژیانی سێکسی. ناونیشانی لە بابەتی: *سێکسی باش کامەیە؟ زۆرترین چێژ لەکوێوە دێت؟ پێش سێکس و دوای سێکس چی بکرێت؟ چی بکەیت بۆ ئەوەی سێکسی باش و چێژدار هەبێت؟* لەو ناونیشانانەن کە ڕۆژانە لەم میدیایەوە بۆ ناو کۆمەڵگا دەچێت. ئەم جۆرە بابەتانە لە بەشی هەرەزۆری میدیاکاندا ئامادەیە و بە شێوەیەکی ڕۆژانەش لە جووڵە و بڵاوبوونەوەدایە.

---

١ _بڕوانە:
Rutherford, Paul (2007). A World Made Sexy, Freud to Madonna. University of Toronto Press.. p. 7.

شتێکی نائاسایی و سەرسوڕهێنەر نییە ناونیشانی وتاری لەم شێوەیە بخوێنیتەوە: *"ئەو جۆرە میوانەی ئارەزووی سێکسی لای ژنان بەرز دەکەنەوە"*. لەم جۆرە نووسینەدا، بۆ نموونە، باس لە خواردنی شۆکۆلاتە، ئەڤۆگادۆ، بیبەری توون، هەنگوین دەکرێت بەر لەوەی ژن و پیاو بڕۆنە ناو جێگا.[1] ناونیشانی تری لەم بابەتە دەکرێت لە هەریەکێک لە ڕۆژنامە یان گۆڤارە کوردییەکاندا بدۆزرێتەوە، کە ئەمڕۆ ژمارەیان لە کوردستاندا بە سەدانن. بۆ نموونە با سەیری ئەم ناونیشانە بکەین کە ڕۆژنامەی *خەڵک* بڵاوی کردۆتەوە: *"باشترین کات بۆ سێکسکردن کەیە؟"*(وەڵامەکەشی سبەینان زوو).[2] ڕۆژنامەی *باس*، کە لە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە نزیکە، وتارێکی بڵاو کردۆتەوە تیایدا باس لەو گۆڕگیایانە دەکات کە هاریکاریی پیاو دەکەن بۆ ئەوەی ژیانێکی سێکسیی چالاکتر و بەگوڕتری هەبێت.[3] هەمان ڕۆژنامە چەندان وتاری تری بڵاو کردۆتەوە لەسەر بابەتی سێکسی لەم جۆرە: "پێویستە *چی نەکەیت دوای بەئۆرگازمگەیشتن؟*"، (وەڵامەکەشی ئەمەیە: یەکسەر جێگاکە جێ مەهێڵە بۆ ئەوەی دوش بکەیت، یەکسەر خۆت مەگۆڕە، پێمەکەنە و مەگری، مەخەوە، یاری

---

١ _بڕوانە نوچە نێت:
http://www.nuche.net/?p=16440. Accessed on 31 July 2014.

٢ _بڕوانە ڕۆژنامەی خەڵک.
http://www.xelk.org/drejax.aspx?Jmare=2751&Jor=51.

٣ _بڕوانە ڕۆژنامەی باس:
http://basnews.com/so/News/Details/mod/21996. Accessed on 31 July 2014.

بە مۆبایلەکەت مەکە).[1]ڕۆژنامەیەکی دیکە ئەم جارەیان ناوی ئەو خواردنانە دەنووسێت کە وزەی سێکسی پەک دەخەن و وا لە مرۆڤ دەکەن ئارەزووی لە سێکس نەبێت، لەوانەش "شەکر، جبس، چەوری و پەنیر".[2] ڕۆژنامەی *هاوولاتیش* کە یەکێکە لە ڕۆژنامە سەربەخۆ و ڕەخنەییەکانی هەرێم، بەشدارە لە بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەم فەرهەنگە سێکسییە نوێیەدا. وتارێکی ناو ئەم ڕۆژنامەیە باس لە دوو جۆر خۆراک دەکات کە کاریگەریی خراپ و نێگەتیڤ لەسەر ئارەزوو و وزەی سێکسی لای ئافرەتان جێ دەهێڵن، جۆری یەکەمیان ئەو خواردنەیە کە ڤیتامین بی ٩، B9، لە لەشدا کەم دەکاتەوە. لەگەڵ ئەو خواردنانەدا کە ڕێژەی ئاسن لە لەشدا دادەبەزێنن.[3] گۆڤاری *ئاسوودە* باس لە بابەتێک دەکات کە لە زۆر ڕوووە دەشێت وەک شکاندنی تابو وێنا بکرێت. ئەم گۆڤارە باس لە کێشەی "ڕەحەتەبوونی خێرا" دەکات و ئەو ڕێگا و تەکنیکانەش باس دەکات کە ڕێگرە لەوەی ڕەحەتبوون زوو ڕوو بدات.[4] ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکانی تریش بەشدارن

١ _بڕوانە ڕۆژنامەی باس:
http://basnews.com/so/News/Details/mod/15980.

٢ _بڕوانە:
http://www.hawzhin.com/index.php/lovesex/item/196-1. Accessed on 31 July 2014.

٣_بڕوانە:
http://hawlati.co/%D8%A6%DB%95%D8%B1%D8%B4%DB%8C%DA%A4%DB%95%DA%A9%D8%A7%D9%86/43651

٤ _بڕوانە:
http://aswda.net/ku/index.php?option=com_content&view=article&id=106:2013-02-16-16-35-

لە دروستبوونی ئەم فەرهەنگە نوێیەدا، بەڵام باسكردنی یەكە بە یەكەیان دەكەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم باسە.

جگە لەم گۆڤار و ڕۆژنامانە چەندان سایتی ئەلەكترۆنییش هەن كە بەشێكن لەم دۆخە تازەیەی بەرهەمهێنانی "ڕۆشنبیرییەكی سێكسی"ی تازە لە فۆرمێكی جەماوەری و ئاشكرادا لە كوردستان. ئەم سایتانە بەتایبەتی باس لەوە دەكەن چۆن مرۆڤ ژیانێكی سێكسیی باشتری هەبێت و بۆ ئەم مەبەستەش باس لە چەندەها بابەتی جیاواز دەكەن، لەوانەش بۆ نموونە وەڵامدانەوەی پرسیاری خوێنەران سەبارەت بە ژیانی سێكسی و چۆنیەتیی چارەسەركردنی كێشە و گرفتە سێكسییەكان. یەكێك لەو سایتە ئەلكترۆنییانە، بۆ نموونە، سایتی "سێكسزانی"یە. لەم سایتەدا پرسیاری لەم بابەتە دەكرێت و وەڵام ئەدرێتەوە: ئایا گرنگە پیاو ئەندامی نێرینەی درێژ بێت؟ چ درێژی و ئەستوورییەكی ئەندامی نێرینە لەلایەن ئافرەتانەوە پەسەندە؟[1] بەربڵاویی ئەم گوتارە تازەیە بە ڕادەیەكە تەنانەت چەندان كەسایەتیی دینییش بوونەتە بەشێك لەم گوتارە ئاشكرا و گشتییە لەسەر سێكس

---

43&catid=14:2013-02-16-12-52-03&Itemid=27.

١ _بڕوانە:

http://sexzane.wordpress.com/2013/10/07/%D8%A6%D8%A7%DB%8C%D8%A7%D8%AF%D8%B1%DB%8E%DA%98%DB%8C-%D8%A6%DB%95%D9%86%D8%AF%D8%A7%D9%85%DB%8C-%D8%B3%DB%8E%DA%A9%D8%B3%DB%8C-%D9%BE%DB%8C%D8%A7%D9%88%D8%A7%D9%86-%DA%AF%D8%B1%D9%86%DA%AF%DB%95/.

و ژیانـی سێکسـی لـە هەرێمـدا. سـایتی پەیـک، کـە سـایتێکی ئیسـلامییە، چاوپێکەوتنێکـی لەگـەڵ ئیمامـی مزگەوتـی گۆیـژە لـە سـلێمانی، شـێخ بەهادیـن نەقشـبەندی، بـڵاو کردۆتـەوە، کـە تیایـدا بـاس لـە هەڵوێسـتی ئیسـلام سـەبارەت بـە سـێکس و ژیانـی سێکسـی دەکات. ئـەم شـێخە بـاس لـەوە دەکات ئیسـلام هەمـوو شـێوازەکانی سێکسـکردنی حـەڵاڵ کـردوە، تەنهـا سێکسـکردن لـە دواوە نەبێـت. هەروەهـا بـاس لـەوەش دەکات ئیسـلام مژینی لێو، مژینی مەمک و زمـان، تەنانەت لێسـینەوەی ئەندامـی زاوزێـی ئافـرەت و مژینـی ئەندامـی نێرینـەی پیـاوی حـەڵاڵ کـردوە. تاقـە مەرجێـک کـە پێویسـتە پەیـڕەو بکرێـت ئەوەیـە سـەرجەمی ئـەو شـوێنانە پاک بن.[1] هەمـوو ئـەم قسـانە لـە سـایتێکی ئینتەرنێتـدا کـراون و دەکرێـن کـە هەمـوو کەسـێک خوێندنـی قۆناغـی سـەرەتایی هەبێـت، دەتوانێـت بیانبینێـت و بیانخوێنێتـەوە.

بەکورتی، کولتوورێکی جەماوەریی نوێ لەسەر سێکس و ژیانی سێکسی لە هەرێمدا دروست بووە و لەدروستبووندایە، کە پێشتر بوونی نەبووە، لەم کولتوورەدا چێژی جەستەیی ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. لە زۆر ڕووەوە ئەم فەرهەنگە تازەیە ناکۆکە بەو فەرهەنگە پاتریارکییەی کە هەڵگری ئەخلاقی دەسپلینکردنی

---

١ بڕوانە:
http://www.wtarikurd.info/%D9%85%D8%A7%D9%85%D8%B3%D8%AA%D8%A7-%D8%B4%DB%8E%D8%AE-%D8%A8%D9%87%D8%A7%E2%80%8C%E2%80%8C%D8%A1%D8%A7%D9%84%D8%AF%DB%8C%D9%86-%D9%84%D9%87%E2%80%8C-%D8%AC%D9%88%D9%88%D8%AA%D8%A8%D9%88/

جەستە و سنووردانانە بۆ ئابووریی چێژ، هەروەها ناکۆکە بەو فەرهەنگە دینی و نیمچەدینییە کە سێکس تەنها وەک ئامرازێک بۆ منداڵبوون دەبینێت. ئەم ڕوانینە تازەیە بۆ سێکس نەک تەنها ناکۆکە بە بەها و نرخ و کەلەپوورە تەقلیدییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی، بەڵکو لە زۆر ڕووەوە لاوازکردن و خۆدوورخستنەوەیەکی بەرچاویشە لە سەرجەمی ئەو بەهایانە. ئەگەرچی زەحمەتە باس لەوە بکەین کە ئەوەی دەیبینین و ڕوو دەدات سەرکەوتنی چێژ و ئارەزووە بەسەر بڕێک لە تابوەکاندا، بەڵام دەکرێت بەئاسانی باس لەوە بکەین کە پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان ئارەزوو و تابوە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و کولتووری و سیاسییەکاندا درست بووە، شتێک بە ناوی تێپەڕاندنی ئەم تابوانەوە لە گەڵاڵەبوون و دروستبووندایە. بێگومان تا ئێستاش کۆمەڵگای کوردی چەندەها تابوی دینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی تێدایە و چەندەها شێوازی حەڵاڵ و حەرامی دینی و نادینیی تێدایە، بەتایبەتی لە پەیوەندییاندا بە سێکس و ژیانی سێکسییەوە، کە سنوور بۆ ئەم گوتارە دادەنێن و بەگژیشیا دەچنەوە. بەتایبەتی چەندان هێزی ئیسلامیی سیاسی و چەندان گرووپی کۆنزەرڤاتیڤی ڕێکخراو هەن، لەوانەش بەتایبەتیی گرووپە سەلەفییەکان، کە هەم ئیدانەی ئەم گۆڕانکارییانە دەکەن و هەم بەگژیشیا دەچنەوە. لە ڕاستیدا دەکرێت لەپاڵ باسکردن لە بوونی "مەجالێکی گشتی" بۆ ئەو فەرهەنگ و بەها تازانەدا، باس لە دروستبوونی "مەجالێکی گشتیی سەلەفییانە"ش بکەین کە لە دونیای دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین لە هەرێمدا دروست بووە. ئەم دوو مەجالەش تەواو ناکۆک و دژبەیەکن و دوو وێنەی جیاواز و ناکۆکی سێکس و جەستە و ژیانی سێکسی

پەخش دەکەن. دەبێت ئەو خاڵە لای خوێنەر ئاشکرا بێت کە تا ئێستاش کۆنترۆڵی پاتریارکییانەی ژیانی سێکسیی ئافرەتان لە هەرێمدا بەهێزە و هەموو ئەو بەها تەقلیدییانە کە ئەم کۆنترۆڵە دەسەپێنن، ئامادەن. بەڵام وەک وتمان هاوکات گوتارێکی تازە و کۆمەڵێک بەهای نوێ و نماییشکردنێکی میدیاییی بەرفراوانی پیاوەتی و ژنبوون لەئارادایە کە سێکسیبوون و پەروەردەکردنی جەستەیەکی ئیرۆتیکی، لە پێکهاتە سەرەکییەکانیەتی. لەم گوتارە تازەیەدا چەمکەکانی جوانی، شووکردن و ژنهێنان، لەش، سێکس، ژیانی سێکسی ڕووبەڕووی گۆڕانکاریی گەورە بوونەتەوە، بەشێک لە ئابووریی هەرێمیش بووە بە ئابوورییەکی ئیرۆتیکی و بەشێکیش لە لیبیدۆ و وزەی سێکسی بووە بە کاڵا و پیشەیەکی ئابووری. هاوکات چەندان تاکتیکی حوکمڕانیکردن و چەندان پەیوەندیی دەسەڵات دروست بووە کە ئەم گۆڕانکارییانەی پێویستە و ئەم پێداویستییەشە وا دەکات لە هەندێک لە شێوازەکانی کۆنترۆڵکردنی تەقلیدی و سونەتی هەڵبێت. ئەوەی لێرەدا ڕووی داوە و ڕوو ئەدات، دیسانەوە "شڵەژانی پێوانەیی"ە لە فۆرمی تێکچوونی تەواوەتیی پەیوەندییەکانی نێوان تابوە دینی و کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسییە سونەتییەکان لەگەڵ ئەو واقیعە تازەیەدا کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست بووە. "لەشێکی سێکسی" و "لەشێکی سەلەفی" بەریەک دەکەون و جۆرێک لە ناکۆکیی بێچارەسەر پێشنیار دەکەن. ئەم تێکچوونەش یەکێکی ترە لە سەرچاوە سەرەکی و گرنگەکانی ئەو سەرلێشێوان و "شڵەژانە پێوانەیی"یەی کە باسمان کرد.

**مەسرەفگەرایی و درستبوونی شێوازێکی نوێ لە تاکەکەس**

ئەگەرچی مەسرەفگەرایی چەندین دەرەنجامی خراپ و وێرانکەری هەیە و بەشێکی زۆری ئەو ئەدەبیاتە ڕەخنەییەش کە باس لە مەسرەفگەرایی دەکات، لە نووسەرە فەرەنسییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا قوتابخانەی فرانکفۆرت و دوای فرانکفۆرتیش، پێ لەسەر ڕەهەندە نێگەتیڤەکانی مەسرەفگەرایی دادەگرن، بەڵام دەمەوێت لێرەدا پێ لەسەر خاڵێک دابگرم ناکۆک بەو ڕوانینانە. بە بۆچوونی من وێناکردنی شەیتانییانە و قیامەتهێنانە، واتە ئەپۆکالیپتی، مەسرەفگەرایی وا دەکات هەندێک لەو ئەگەر و دەرەنجامە پۆزەتیڤانە نەبینین کە دەشێت مەسرەفگەرایی لەناو خۆیدا هەڵی گرتبێت.[1]بە پێچەوانەوەی ڕوانینە نێگەتیڤ و قیامەتهێنەکانەوە بۆ مەسرەفگەرایی، هەندێک نووسین و لێکۆڵینەوە نیشانیان داوین کە مەسرەفگەرایی دەشێت هۆکاری کۆمەڵێک گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و کولتووریی پۆزەتیڤی قووڵ و هەمەلایەن بێت. بۆ نموونە، مەسرەفگەرایی دەتوانێت هاریکاریی تاکەکەس و گرووپەکان بکات بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان لە هەندێک لە "شێوازە خنکێنەرەکانی ئەخلاقی دەستەجەمعی" ڕزگار بکەن و هاریکارییان بکات بۆ هێنانەکایەی شێوازێکی کراوەتری "ئەخلاقی تاکەکەسانە". کۆمەڵناسی

---

١ _بۆ نموونەی ڕەخنەی توندی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەرامبەر بە مەسرەفگەرایی، بڕوانە کتێبە بەناوبانگەکەی هێربەرت مارکوز بەناوی "مرۆڤی تاکڕەهەند".

Marcuse, Herbert (1964). One Dimensional Man: Studies in the Ideology of Advanced Industrial Society. Boston: Beacon

چینی: یوخیانگ یان، لە کتێبێکی گرنگدا لەسەر مەسرەفگەرایی لە وڵاتی چیندا نیشانی داوین چۆن دیاردەی مەسرەفگەراییی جەماوەریی بەربڵاو، چۆن ئایدیۆلۆژیای مەسرەفگەرایی بوونەتە هۆکاری دروستبوونی "تاکەکەسی مۆدێرن" و هۆکاری "بەتاکەکەسیبوونی کۆمەڵگای چینی."[1]مەسرەفگەرایی لە چیندا کاریگەرییەکی هێجگار گەورەی هەبووە لەسەر گۆڕانی ئەخلاقیاتی سونەتی بۆ ئەخلاقیاتێکی نوێ، لەسەر بەجێهێشتنی "ئەخلاقیاتی دەستەجەمعیی ماویزم" بەرەو "ئەخلاقیاتی تاکەکەسی." لەم ڕووەوە یوخیانگ یان دەربارەی گۆڕانەکانی ناو وڵاتی چین دەنووسێت: "ئەخلاقیاتی ژیانی ڕۆژانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لەباتیی پێداگرتن لەسەر قوربانیدان بە خود و کارکردن لەپێناوی باشەی گشتیدا، وەک کارکردن بۆ بونیادنانی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستیی نوێ، پێداگرتن لەسەر وەدیهێنانی خود و بەدەستهێنانی بەختەوەریی شەخسی، هاتۆتە کایەوە، بەختەوەرییەک گرێدراو بە دەسکەوتی مادیی کۆنکریتەوە."[2] ئەم شێوازە لە ئەخلاقیاتی شەخسیی نوێ کۆتایی هێناوە بە ئەخلاقیاتی دەستەجەمعی و خودئینکارکردنی سەردەمی ماو تسی تونگ.

فەیلەسوفی هۆڵەندی: هاری کونەمان، لە پەیوەندیدا بە مەسروفگەراییەوە ئەو ڕەشبینییە کولتوورییە دووبارە ناکاتەوە کە بڕێکی زۆر لە نووسەران و زانا کۆمەڵایەتییەکان و فەیلەسوفانی هاوچەرخ باسی دەکەن. ئەو پێ لەسەر ئەو

---

١ _بڕوانە:
Yan Unxiang (2009). The Individualization of Chinese Society. Oxford and New York: Berg

٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل XXXV

ئەگەرە ڕزگاریخوازانە دادەگرێت کە دەشێت مەسرەفگەرایی دەستەبەریان بکات. لە دیدی ئەم فەیلەسوفە هۆڵەندییەدا تاکەکەس لە ڕێگای مەسرەفگەراییەوە دەتوانێت خۆی لەو شێوازە خنکێنەرانەی کولتوور و بەها و ئەخلاق و نرخاندنی دەستەجەمعی و کۆیی ڕزگار بکات. کە ئەو لەژێر ناوی "کولتووری کڵاو"دا کۆیان دەکاتەوە، واتە وێناکردنی کولتوور وەک کڵاوێک کە بتوانێت سەری هەموو کەسێک بەو شێوەیە داپۆشێت کە کڵاوی بەها و نرخە باڵادەستەکان دەیانەوێت. "کولتوور وەک کڵاو" ئەو شێوازەیە لە کولتوور کە داخراوە و تیایدا شوناسی تاکەکەسی بە شێوەیەکی پڕ فشار و زۆربۆهێنان داپۆشراوە و بەو شێوەیەش دروست کراوە کە کۆ لە تاکەکەسی دەخوازێت. ئەمەش لە ڕێگای بەناوەکیکردنی بەها و نرخەکانی ئەو جیهانبینی یان ئایدیۆلۆژیا دیاریکراوەوە کە لە شێوەی کڵاودا ئامادایە و خوازیاری ئەوەشە هەموو کۆمەڵگا ئەو کڵاوە لەسەر بکات. لە دیدی ئەم فەیلەسوفە هۆڵەندیەدا مەسرەفگەرایی هەلی ئەوە بە تاکەکەسەکان دەبەخشێت بتوانن خۆیان لەم کڵاوە کولتوورییە ڕزگار بکەن و خۆیان شوناسی خۆیان دابهێنن.[1]

لەسەر هەمان هێڵی بیرکردنەوە، هەندێک لێکۆڵەرەوەی فیمینیستی مەسەلەی مەسرەفگەرایی بە دروستبوونی "شێوازێکی نوێ لە ژنبوون"ەوە دەبەستنەوە، کە تیایدا ژنان

---

١ _ بڕوانە:
Kunneman, Harry (996). Van Theemutscultuur Naar Walkman-Ego, Contouren van Postmoderne Individualiteit. Amsterdam: Boom. See also: Kunneman, Harry (1998). Postmoderne Moraliteit. Amsterdam: Boom.

وەک بکەرێکی سەربەخۆ کار دەکەن. لەو فێمینیستانەش، بۆ نموونە، ڕیتا فێلسکی،[1] بە بۆچوونی ئەم خانمە ئەو ئەدەبیاتەی لەسەر مەسرەفگەرایی نووسراوە نیشانی ئەدات کە "گەشەکردن و بەهێزبوونی دیاردەی خۆشیپەرستی و چێژپەرستی، hedonism، کۆمەڵێک قازانج و دەسکەوتی ئابووریی گەورە بە پیاوە کاپیتالیستەکان دەبەخشێت. بەڵام کاریگەرییەکەشی لەسەر پەیوەندییە عاتیفییەکانی نێوان نێر و مێ و لەسەر بونیادی پاتریارکییانەی خێزان، کاریگەرییەکی لەقکەر و تێکدەرانە دەبێت، کە دەشێت تا ئاستی وێرانکردنی ئەو بونیادە پاتریارکییە بڕوات."[2] بە مانایەکی دیکە مەسرەفگەرایی دەتوانێت تەحەدای پاتریارکیەت بکات و لە دەسەڵات و تواناکانی کەم بکاتەوە. ئەدەبیاتی تیوری لەسەر مەسەلەی مەسرفگەرایی ئافرەتان ئەوە نیشان ئەدەن کە: "پەیوەستبوونی ئافرەت بە مەسرەفگەراییەوە دەشێت بتوانێت هەندێک شێوازی تایبەتی دەسەڵاتی پیاوانە کەم و لاواز بکاتەوە."[3] واتە مەرج نییە مەسرەفگەرایی هەمیشە لە قازانجی پاتریارکیەت و شێوازە سونەتییەکانی باڵادەستیی پیاو بەسەر ئافرەتاندا بێت، چ لەناو خێزان و چ لە دەرەوەی خێزاندا. بە بۆچوونی من ئەم شێوازە ڕوانینە بۆ مەسروفگەرایی و بینینی هەندێک ڕەهەندی گۆڕانخواز لەناویدا بۆ پەیوەندییە جێندەرییەکان، لە دۆخی ئەمڕۆکەی

---

١ _بڕوانە:
Felski, Rita (1995). *The gender of modernity*. Harvard University Press

٢ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤

٣ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤

کوردستاندا، هەندێک لە ڕاستیی هەڵگرتوە و دەشێت هاریکارمان بێت بۆ ئەوەی هەندێک دەرکەوتی پەیوەندیی نێوان مەسرەفگەرایی و ئافرەتانی لە هەرێمدا، پێ بخوێنینەوە.

با لە مۆڵە گەورەکان و بازاڕە مۆدێرنەکانی ناو هەرێمەوە دەست پێ بکەین، ئەم شوێنانە ڕووبەری شاریی نوێ و مۆدێرنن، کە نێر و مێ لە ئاستێکی زۆر فراوان و بە ژمارەی گەورە بەیەکەوە کۆ دەکەنەوە. مرۆڤ دەتوانێت ڕۆژانە لە هەریەکێکیاندا سەدان، ئەگەر نەڵێم هەزاران ژن و ئافرەتی گەنج و بەتەمەن ببینێت بەو ڕووبەرە تازانەدا دێن و دەچن، لەپاڵ سەدان و هەزاران کوڕ و پیاوی گەنج و بەتەمەندا. زۆر جاریش ئافرەتان دەتوانن ڕۆژانە بەتەنها و بەبێ ئەوەی کەسێکی دیکەیان لەگەڵدا بێت بچنە ئەم شوێنانەوە. لەم شوێنانەدا چەندەها کافێ و شوێنی حەسانەوە هەیە، کە دەتوانن تیایدا دابنیشن و پشوو بدەن و یەکتر ببینن و لەگەڵ یەکدا بدوێن. لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بەپێی بەها و نرخە تەقلیدی و سونەتییەکان، زۆر جار ئافرەت سەردانی بازاڕی کردوە و شتومەکە ڕۆژانەییە پێوستەکانی ناو ماڵی کڕیوە، بەڵام تەنانەت ئەم دابەشکردنە سونەتییە لە گۆڕاندایە و ڕۆژانە ژمارەیەکی گەورەی کوڕ و پیاوی گەنج دەبینین، بە مەبەستی بازاڕکردن دەچنە ناو بازاڕەکانەوە. ئەمڕۆ لە هەرێمدا ژن و پیاو هەردووکیان لەناو کردەی بەرخۆریدا ئامادەن و لەم ڕووبەرە شارییە تازانەدا بەیەک دەگەن و یەکتری دەبینن. میکانیزمە تازەکانی مەسرەفگەرایی لە ڕێگای ئەم دەرکەوتنە بەردەوامەی ئافرەت و پیاوەوە لەناو ئەو ڕووبەرە شارییە تازانەدا، ئەو دابەشبوون و جیاکردنەوە سوونەتییە تووشی شڵەژان دەکات کە لەنێوان "مەجالی شەخسی" و "مەجالی گشتی" لە کۆمەڵگای

ئێمەدا ئامادەیە، ئەو جیاکردنەوەیەی بە ئینگلیزی private/ publicی پێ دەڵێن. ئەو جیاکردنەوەیە زۆر جار بەکار هاتووە بۆ ئەوەی ژنان لە "مەجالی شەخسی"دا بهێڵێتەوە و نەهێڵێت تێکەڵ بە "مەجالی گشتی" ببن. بە بۆچوونی ڕیتا فێلسکی "فەرهەنگی مەسرەفگەرایی دەچێتە ناو مەجالی شەخسییەوە و حورمەتی ئەو مەجالە تێک ئەدات، پاڵ بە ئافرەتانەوە دەنێت بێدڵیی خۆیان نەکەن و بەدەم ئارەزووەکانی خۆیانەوە بچن و تەحەدای دەسەڵاتە ئەخلاقی و دینییە سونەتییەکان و تەحەدای مێردەکانیشیان بکەن."[1] ڕەنگە ئەمەی ئەم فێمینیستە باسی دەکات بۆ دۆخی ئافرەتان لە هەرێمدا ڕاست نەبێت، یان هەنگاوێکی ڕادیکاڵ بێت لەمڕۆکەی کۆمەڵگای کوردستانیدا، بەڵام لەسەر هەمان هێڵی بیرکردنەوەی ئەم خانمە دەکرێت بڵێین، مەسرەفگەرایی دەکرێت هەڵگری ئەم وزە و توانا تایبەتە بێت، دەشێت توانای هێنانەدەرەوەی ئافرەتی لە "مەجالی شەخسیی"ەوە بۆ ناو "مەجالی گشتی" هەبێت و دەشێت دەسکاریی پەیوەندییەکانی ناو مەجالی شەخسییش بکات.

لەپاڵ ئەو ئەگەری تێکدان و شڵەژاندنەی جیاکردنەوەی "مەجالی تایبەت" لە "مەجالی گشتی"خودی ئامادەبوون لەناو ئەو مۆڵ و بازاڕ و سێنتەرە بازرگانییە تازانەدا هەستی ئەوە بەوانە دەبەخشێت کە سەردانیان دەکەن کە بوونەوەری مۆدێرن و شارین، یان بەشێکن لەو "مەجالە گشتیی"ە تازەیە کە لە شارەکاندا دروست دەبێت، تێکەڵن بە پرۆسەی بەشاربوون و شتێکی نوێ لە ژیانیاندا ئەزموون دەکەن.

---

١ _هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤

دەرکەوتنی ئافرەت لەم مەجالە گشتییە بازرگانییە نوێیەدا دەتوانێت کاریگەرییەکی پۆزەتیڤ لەسەر بەشداربوونی ژنان لە ژیانی گشتی لە هەرێمدا جێ بهێڵێت. لە هەمان کاتدا وەک دەرنجامی فراوانبوونی سیستمی خوێندن و پەروەردە لە هەرێمدا و وەک دەرنجامی دەرچوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانی گەنج لە قوتابخانەکاندا، دەکرێت ئافرەت لە زۆربەی هەرەزۆری، ئەگەر نەڵێم هەموو، دەرکەوتەکانی ژیانی گشتییدا بدۆزرێتەوە. لە دادگاکانەوە بۆ پەرلەمان و لە وەرزشەوە بۆ میدیا، لە سیستمی پەروەردەوە و بۆ ناو خەستەخانە و سێنتەرە پزیشکییەکان و تەنانەت لەناو دەزگاکانی پۆلیس و سوپاشدا. ئەم دەرکەوتنە جەماوەرییە فراوانەی ئافرەتان لە مەجالی گشتیدا و بەشداربوونیان لە ژیانی گشتییدا، وێناکردنێکی تازە بۆ خود و بۆ ئافرەتبوون لای ژمارەیەکی زۆری ئافرەتان دروست دەکات، وێناکردنێک تیایدا ئەو ئافرەتانە خۆیان وەک بکەرێکی کۆمەڵایەتی و ئینسانی دەبینن کە هەڵگری توانایەکی تایبەت و دەگمەنن و ئەم توانایەش شایستەی ئەوەیە دانی پێدا بنرێت و ڕێزی بگیرێت.

ئەم گۆڕانکارییە تازانە تەحەدای شێوازی "ئافرەتبوونی باڵادەست" لە هەرێمدا دەکات، ئەو شێوازە باڵادەستە لە ئافرەتبوون کە پێگەیەکی نزم و ژێردەست و کەمنرخ بە ئافرەتان دەبەخشێت. دەکرێت لێرەدا تەنانەت باس لە هاتنەکایەی شێوازی نوێی ئافرەتبوون بکەین، بەتایبەتی ئەو شێوازە لە ئافرەتبوون کە هەندێک لێکۆڵەرەوە وەک "ئافرەتبوونی ناڕازی و بەرگریکار" ناوی دەبەن، oppositional femininity. ئەم

شێوازە لە ئافرەتبوونی ناڕازی و بەرگریکار ئەو شێوازەیە لە ئافرەتبوون کە هەم "پیاوبوونی باڵادەست" و هەم "ژنبوونی باڵادەست" تێدەپەڕێنێت و ڕخنەیان دەکات و قبوڵیان ناکات و بەشدار دەبێت لە هێنانەکایەی پەیوەندیی ڕەگەزیی تازە و یەکسانـدا لەنێوان پیاو و ژن لە کۆمەڵگادا.[1] بێگومان نابێت موبالەغە بە بوون و ڕادەی بەرفراوانیی ئەم جۆرە لە ئافرەتبوونی ئەلتەرناتیڤەوە بکەین، بەڵام نکوڵیلێکردنیشی نکوڵیکردنە لە گۆڕانکارییەکی گرنگ لە بواری پەیوەندییە ڕەگەزییەکاندا کە لە هەرێمدا هاتۆتە کایەوە. هەموو ئەمانە هێما بۆ ئەوە دەکەن کە پەیوەندییە ڕەگەزییەکان لە هەرێمدا، وەک لە هەر شوێنێکی تری دونیادا، پەیوەندیی شل و ناجێگیر و کراوەن و لەگەڵ گۆڕانکاریی ژینگە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکاندا گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئافرەتان هەندێک لە ڕەهەندەکانی ئەم گۆڕانکارییانە وەر دەگرن، لەگەڵ هەندێکیاندا دەکەونە گفتوگۆ و دانووسانەوە و دژ بە هەندێکیشیان دەوەستنەوە، لەم ڕێگایانەشەوە ڕووبەری تایبەت بە خۆیان بۆ کردەی کۆمەڵایەتیی تایبەت بە خۆیان دروست دەکەن. ئافرەتان لێرەدا بە شوناسە ڕەگەزییە سەپێنراوەکانی خۆیاندا دەچنەوە و تەحەدای چەمکە پیوانەییە باڵادەستەکانی پێناسەکردنی ڕەگەز دەکەن و بە چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندییە ڕەگەزییەکانیشدا دەچنەوە. بێگومان ئەم پرۆسەیە هەرگیز پرۆسەیەکی سادە و ئاسان و دابڕاو

١ سەبارەت بە چەمکی "ئافرەتبوونی ناڕازی و بەرگریکار" بڕوانە:
Charlebois, Justin (2010). *Gender and the construction of dominant, hegemonic and oppositional femininities.* Plymouth: Lexington Publishers

لـە مەترسـی نییـە، هەرگیـز پرۆسـەیەکی هێمـن و بێکێشـەش نییـە، پرۆسەیەکیشـە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیکی سـەرکەوتنی مسۆگەر نییە، بە پێچەوانـەوە پرۆسـەیەکی ئاڵـۆز و ئازاراوی و زۆر جـار تـەواو توندوتیژیشــە. ئـەم پرۆسـەیە لـە هەندێـک دۆخـی تایبەتـدا لەباتیـی ئـەوەی دۆخـی گشـتیی ئافرەتـان باشـتر بـکات و ڕووبـەری گەورەتـر و کراوەتـر لەبەردەمیانـدا بکاتـەوە، دەشـێت دۆخـی ئافرەتـان زەحمەتتـر بـکات و دۆخـی هەندێـک توێـژی تایبەتـی ئافرەتـان تـەواو لاواز و زەحمەتتـر بـکات، تـا ئـەو شـوێنەی دەشـێت هەندێـک جـار ژیانـی بڕێـک لـە ئافرەتـان بخاتـە مەترسـییەوە. دەڵێـم ڕاسـتە ئـەم پرۆسـەی بەرگریکردن و ناڕازیبوون و تەحەدایـە پرۆسـەیەکی زەحمەتـە و دەشــێت بـڕ و ڕادەی توندوتیـژی لەســەر ئافرەتـان زیادتـر بـکات، بـەڵام ناکرێـت نکوڵـی لـە بوونـی خـودی پرۆسـەکە لـە هەرێمـی کوردسـتاندا بکرێـت. ئـەم پرۆسـەیە بوونـی هەیـە و واشـی کـردووە کـە کایـەی پەیوەندییە ڕەگەزییـەکان کایەیەکی تـەواو ئاڵـۆز و دینامیکـی بێـت. لێـرەوە ئەمـڕۆ ئـەوە تەنهـا پاتریارکیـەت نییـە کـە ژیـان و هەڵسـوکەوتی گەنجانـی کـچ و کـوڕ لـە کوردسـتاندا دەخاتـە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوە، بەڵکـو شـێوازی نوێ بـە خودبوون و بـە تاکەکەسبوونیش لەئارادایـە، کە پێ لەسـەر ئۆتۆنۆمبوون و ئازادیی هەڵبژاردن و ڕێزگرتـن و بەهێزکردنـی تواناسـازیی ناوەکـی دادەگـرن. فەرهەنگـی بەرخۆری و مەسرەفگەرایی نوێ لـە هەرێمدا یارمەتیدەرە لـە دروسـتبوونی ئـەم شـێوازە تازانـەی تاکەکەسـدا، کـە بوونیـان وەک تاکەکـەس بەنـاو خۆنماییشـکردنێکی مەسـرەفگەرانەدا تێدەپەڕێـت.

بەلام مەسرەفگەرایی تەنها کاریگەریی لەسەر ئافرەتان جێ ناهێڵێت، بەڵکو لەسەر پیاوان و مەسەلەی پیاوەتییش جێی دەهێڵێت. وەک هێمامان پێ کرد ئەمڕۆ چەندەها پیاو لەناو مۆڵە گەورەکاندا دەبینین کە عەتر و کرێم و بۆیەی قژ و جلوبەرگ و پێڵاو و چەندان کالای دیکە بەئاشکرایی و بە بەرچاوی پیاوانی تر و ئافرەتانەوە دەکڕن. پیاوانیش بەئاشکرایی، وەک ژنان، چالاکانە بەشدارن لە کردەی بەرخۆیی و مەسرەفگەراییدا و لەم ڕێگایەشەوە وێنەی دیکە بۆ پیاوەتی و پیاوبوون دروست دەکەن، کە نەک جیاوازن لە وێنە تەقلیدییەکان، بەڵکو ئەو وێنە تەقلیدییانە تووشی شڵەژان دەکەن. "پیاوەتیی سونەتی" زۆر جار ئەم جۆرە تازانەی پیاوەتیی مەسرەفگەر، وەک پیاوەتیی نوقسان و پیاوەتیی ژنانە و وەک "ناپیاو" وێنا دەکات. پیاوەتیی سونەتی، ئەو جۆرە پیاوانە کە سەرقاڵی لەشی خۆیان و خەریکی سووڕانەوەن بەناو مۆڵەکاندا و ئەو شتانە دەکڕن کە تایبەتن بە مەسەلەی جوانکردن و بەسێکسیکردنی لەش، وەک پیاوی لاواز و قابیلی تێکشکان دەبینێت، چونکە پێیان وایە ئەو جۆرە پیاوبوونە جۆرێکە لە پیاوەتی کە ناتوانێت خۆی لە فریودانە نوێکانی کەلوپەلساغکردنەوەیان لە ڕێگای ڕیکلام و وێنە و ئاماژەکانەوە بپارێزێت. پیاوەتیی ئەمانە وەک "پیاوەتییەکی یارییپێکراو" manipulated، دەبینرێت کە وەک تێکەڵێکی ئاڵۆز لە پاسیڤبوون و نەرمی، لە نێرەموکبوون و چێژپەرستی وێنا دەکرێت.[1]

---

١ بڕوانە: بۆ شیکاریی لەم جۆرە بۆ مەسەلەی پیاوەتی بڕوانە
Felski, Rita (1995)

**نیشتەجێکردنی دیاردەی خۆکوشتن لە ژینگەیەکی شاریی نوێدا**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لە لێکۆڵینەوەکەی مینۆ ئالینیا کرد کە بەشێکی تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان لە کوردستاندا. لای ئەم خانمەدا دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان دیاردەیەکە لەناو ئەو ئافرەتانەدا ڕوو ئەدات کە ڕەگوڕیشەیەکی لادێیی و خێڵەکییان هەیە، ئەگەرچی دەشێت ئەو ئافرەتانە لە شارە گەورەکاندا بژین یان لە لادێکان خۆیاندا. هەروەها دیاردەی خۆکوشتن وەک دەرنجامی وێرانکردنی لادێکان و ڕاگواستنی بەزۆریان لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا بۆ شوێنەکانی تر وێنا دەکات، کە بە بۆچوونی ئەو بوونەتە هۆکاری لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی بونیادە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان. هاوکات دیاردەی خۆکوشتنەکان دەداتە پاڵ هەژاری و پەراوێزکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری. لە سەرێکی دیکەوە خۆکوشتنی ئافرەتان وەک دەرەنجامی تواندنەوە و ئامێزانبوونی تەواوی ئافرەتان لەناو سیستمی بەها و ئەخلاقیاتی پاتریارکی باڵادەست و فشاری گەورەی ئەو بەهایانە لە کۆمەڵگای کوردیدا دەبینێت، کۆمەڵگایەک، بە بۆچوونی ئەو، هێشتا بونیادەکانی خێڵ و خزمخواهیی تیایدا تەواو بەهێزن.[1] ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو پۆلینکردنەی دۆرکهایم بۆ شێوازە جیاوازەکانی خۆکوشتن دەیکات، ئەم شێوازەی خۆکوشتن کە ئەم خانمە باسی دەکات دەچێتە خانەی ئەو شێوازە لە خۆکوشتنەوە کە دۆرکهایم بە

---

١ بڕوانە:

Alinia (2013). p. 143

"خۆکوشتنی جەبری" یان "قەدەری" ناوی دەبات، fatalistic suicide. خۆکوشتنێک دەرنجامی هێز و فشار و جەبری بەها و نۆرم و بونیادە باڵادەستەکانی ناو کۆمەڵگایە. بێگومان ئەم شێوازە لە خۆکوشتن لە هەرێمدا هەیە و ئامادەیە، کاری ئەم خانمەش لەسەر خۆکوشتنی ئافرەتان کارێکە شوێنی دەستخۆشییە، بەڵام ئەوەی لەم لێکدانەوەیەدا کێشەیە، ئەوەیە کە خۆکوشتنی ئافرەتان لە هەرێمدا کورت دەکاتەوە تەنها بۆ ئەو شێوە جەبری و قەدەرییەی خۆکوشتن، تەنها وەک دەرەنجامی فشاری بەها پاتریارکییە سوونەتییەکان دەبینێت. بە بۆچوونی من ئەم کورتکردنەوەیەی هەڵەیە و خۆکوشتنی ژنان لە هەرێمدا تەنها لەو فۆرمە تایبەتەی خۆکوشتندا بەرجەستە نییە. وەک ئامارەکان نیشانی ئەدەن دیاردەی خۆکوشتنی ئافرەتان یەک ناگرنەوە لەگەڵ ئەو ڕەگورِیشانەدا کە ئەم خانمە لە لێکۆڵینەوەکەیدا باسی دەکات. وەک لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەدا نیشانمان دا، ئامارەکان پێمان دەڵێن کە دیاردەی خۆکوشتن لە هەرێمدا، هەم دیاردەی ژمارە یەکی توندوتیژییە ڕەگەزییە لە کوردستاندا و هەم دیاردەی ناو شار و ژینگە شارییەکانی ناو کوردستانە. ئەوەشمان نیشان دا کە زۆرینەی ئەوانەی خۆیان دەکوژن ئافرەتی خوێندەوارن و مەسەلەی خۆکوشتنەکەشیان پەیوەندیی بە مەسەلەی هەژارییەوە نییە. هەروەها ناکرێت دیاردەی خۆکوشتنیان بەتەنها بدەینە پاڵ بەها تەقلیدییە باڵادەستەکانی خێڵ و دین لە کوردستاندا. کێشەکە لە زۆر سەرەوە ڕێک پێچەوانەی ئەم دیدە و ئەم شێوازی لێکدانەوەیەیە. سەرجەمی ئەو بەها خێڵەکی و خێزانی و دینی

و فەرهەنگییانەی ئەو خانمە باسی دەکات ناتوانن چیتر ژنانی گەنجی ئەم وڵاتە لە خۆکوشتن بپارێزن و بەهانایەوە بچن. ئەگەر تاکەکەسەکان لەناو ئەو بونیادە تەقلیدییانەدا دەمج بووبن و لەگەڵ فشارەکانیدا ڕاهاتبن، ئەوا ئەودەم بەهاکانی ناو ئەو بونایادانە بوون بە جۆرێک لە قەناعەتی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی لەناویاندا و دونیا و ژیانیش بەو شێوەیە وەر دەگرن و قبووڵ دەکەن، کە ئەو بەهایانە پێیان دەڵێن. ئەوەی ئەو ژمارە زۆرە لە ئافرەتی گەنج لە هەرێمدا خۆیان دەکوژن یەک مانای هەیە: ئەو بەها تەقلیدی و پاتریارکییانە لای ئەم ئافرتانە نرخیان نەماوە و ناتوانن ژیانیان بپارێزن. مانای ئەوەیە ئەو بەهایانە لە قەیراندان، تووشی کێشە و تەحەدای گەورە و فرەلایەن بوون، ناتوانن قەناعەت بەو نەوە تازەیە بهێنن دونیا بەو شێوەیە ببینن و قبووڵ بکەن کە ئەو بەها خێڵەکی و پاتریارکییانە چوارچێوەی هەڵسوکەوت و ئازادییەکانیان دەکێشن. بۆیە ئەم تاکەکەسانە لە دۆخی نامۆبوونێکی تەواودان بەو بەهایانە و ناتوانن ژیانی خۆیان لەپاڵ ئەو بەهایانەدا ڕێک بخەن. هاوکات ئەو دونیا نوێیەی کە دروست بووە و لەدروستبووندایە، ئەو سیستمە نوێیانەی بەها کە لەدایک بوون، بۆ نموونە سێکسفرۆشی و خواستەکانی دروستکردنی لەشێکی سێکسی، ناتوانێت کۆتایی بەم نامۆبوونە بێنێت، یان لانی کەم ئەگەری دەربازبوون لەم نامۆبوونە نیشان بدات. نەک هەر ئەمە، بەڵکو ئەو دونیا تازەیە ئەم نامۆبوونە چەندقات دەکات و لە چەندان سەرەوە بەهێزتر و فراوانتری دەکات. چونکە وەک وتم ئەو دونیایە دونیایەکە لە دۆخی "شڵەژانی پێوانەیی"دا دەژی.

لە بیست ساڵی ڕابردوودا کوردستان بووە بە وڵاتێک سەرجەمی چەمک و بەها سەرەکییەکانی ناوی لە دۆخی شڵەژانێکی پێوانەییی تەواودایە، هەم ماناکانی پیاوەتی لە قەیران و شڵەژانێکی گەورەدایە، هەم مەسەلەی ژیانی سێکسی و بەها سێکسییەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتوو، هەم خێزان لەناوەوە گۆڕاوە و نەوەیەکی خوێندەواری نوێی تیادا دروست بووە کە ڕوانینێکی تری بۆ خۆی و بۆ دونیا هەیە، هەم ماناکانی ژنبوون و وێناکردنی ڕۆڵەکانی لە ژیاندا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە. هاوکات توندوتیژیی بووە بە بەشێک لە سیاسەتی خۆسەپاندنی سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی. شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ بوون بە بازرگانە گەندەڵەکانی ئەمڕۆ، کۆمەڵگایەکی بەرخۆر و مەسرەفکەر دروست بووە هەموو شتێک لەناویدا قابیلی فرۆشتنە، لە فرۆشتنی ئینتیمای سیاسی و دینی و فەرهەنگییەوە بیگرە، بۆ فرۆشتنی لەش. جگە لەمانە لەم بیست ساڵەدا کۆمەڵگای کوردستانی لەناو خۆیدا بە جۆرێکی گەورە دابەش بووە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بووە بە "کۆمەڵگای گیتۆی لێکدابڕاو" دەوڵەمەندبوونی خێرا لە دەرەوەی هەموو یاسا و بەها و توانایەکی چاودێریکردنی کۆمەڵایەتیدا، لەپاڵ درستبوونی جیاوازییەکی هێجگار گەورە لە داهات و توانای مادیدا. هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە دۆخێکیان دروست کردوە کە سیستمە کۆمەڵایەتییەکەی خستۆتە قەیرانێکی هەمەلایەنەوە. شێوازە جیاوازەکانی مەسرەفکەرایی چەندان ناکۆکیی نوێیان دروست کردوە، پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان مەسرەف و شوناسی تاکەکەسی و مەسرەف و شوناسی دەستەجەمعیدا

دروست بووە. وێنە تەقلیدی و سونەتییەکانی هاریکاریی کۆمەڵایەتی و بەدەمەوەچوونی یەکتری لەم دونیا تازەیەدا تەواو لاواز بووە، شێوازە سونەتییەکانی هاریکاری تەنانەت لەناو بەشێکی بەرچاو لە خێزانەکانیشدا نەماوە یان تەواو لاواز بووە. ئەو ژینگە تەقلیدی و سونەتییە نەماوە کە تیایدا پێکەوەبوونی بێمەرج و ئۆتۆماتیکی تا ڕادەیەکی زۆر ئامادە بوو. هەموو ئەمانە مەسەلەی ئینسیجام و گونجاندنی کۆمەڵایەتیی لە کوردستاندا تەواو لاواز کردوە. پەیوەندیی نێوان زۆرێک لە تاکەکەسەکان و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوی لاواز بووە، بە جۆرێک نە خێزان، نە دین، نە سیاسەت هیچیان شوێنی ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینە نین. فرۆشتنی سێکس و گۆڕانی سێکس بۆ کاڵایەکی قابیلی مەسرەفکردن و تێوەگلانی خێزانەکان لەم مەسەلەیەوە، وێنە پاتریارکییە تەقلیدییەکانی خێزانی تەواو بریندار کردوە. چیرۆکی چەندەها خێزان کە کچەکان و ژنەکانیان دەخەنە بازاڕی سێکسەوە، بە هەموو تەفاسیلە برینداركەرەکانیەوە، بەبەردەوامی لەلایەن میدیای کوردییەوە باس دەکرێت و باس کراوە. سۆزانیبوون و سێکسفرۆشی وەک بازرگانییەک کە چەندان خێزان پێی هەڵدەستن، یان گەیشتنی ململانێ و ناکۆکی و شەڕە ڕۆژانەییەکانی ناو خێزان بە ڕادەی پەلاماردانی توندوتیژ و کوشتن، حیکایەتی دەستدرێژیکردنی خزمە نزیکەکان بۆ سەر مێینەکانی ناو ئەو خێزانانە، ئەوەی پێی دەگوترێت زینای مەحرەم، incest، ئەوانیش لەناو لاپەڕە و هەواڵی میدیاکاندان و بەشێکن لە دەرکەوتەکانی ژیانی گشتی لە هەرێمدا. هەموو ئەمانە وێنەیەکی خێزانیان

دروست کردوە تەواو ناکۆک و نەگونجاو لەگەڵ وێنە پاتریارکییە سونەتییەکەیدا. وەک وتم نە ناسیۆنالیزمی کوردی، نە نیشتمانپەروەریتیی سیاسی، نە دین کە بەقووڵی بە سیاسی و بە شکڵی کراوە، ناتوانن هیچیان ئەو لانی کەمە لە هاودەردی و هاریکاریی کۆمەڵایەتی مەیسەر بکەن، کە هەموو کۆمەڵگایەک بۆ پاراستنی تاکەکەسەکانی پێویستی پێیەتی. هەموو ئەمانە مەسەلەی "شڵەژانی پێوانەیی"یان لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەهێز کردوە و گەیاندویانە بە هەموو کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری لە کوردستاندا.

وەک نیشانمان دا، لە رووی کولتوورییەوە، ئەو گوتارە ئاشکرا و گشتییە تازەیەی لەسەر سێکس و ژیانی سێکسی لە کوردستاندا ئامادەیە، تەکنیکە دیسلپینکەرەکانی پاتریارکیەتیان تێپەڕاندوە. مەبەستم ئەو تەکنیکانەیە کە لە رێگای داپۆشین و بێدەنگ و بێرەنگکردنی سێکسەکەوە کار دەکەن. یان خەریکی ئەوەن سێکس زمانێکی ئازادی نەبێت بۆ باسکردنی خۆی. ئەم گوتارە تازەیە کێشەی گەورەی بۆ ئەو گوتارە پاتریارکییە تەقلیدییە کۆنزەرڤاتیڤە دروست کردوە. وەک وتمان سێکسفرۆشی خۆشی بووە بە بەشێکی تایبەتی ناو ئەو ئابوورییەی دروست بووە، بە ئابوورییکردنی سێکس و بە سێکسکردنی ئابووری. هەموو ئەمانە قەیرانێکی بەردەوامیان لە سیستمی بەهاکانی پاتریارکیەتی تەقلیدیدا دروست کردوە و هاوکات ئەلتەرناتیڤێکی قبووڵکراو و گشتی بوونی نییە کە هاریکاری ئەو تاکەکەسانە بێت کە وردەکارییەکانی ئەو قەیرانانە

دەژین. لە هەرێمدا، چیتر ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیی ڕوون و ئاشکرا بوونی نییە کە بە تاکەکەسەکان بەهای پێوانەیی ببەخشن بۆ جیاکردنەوەی ئەشێ و ناشێکان، باش یان خراپ، ماقووڵ و ناماقووڵ لەیەکتری، بۆ دابینکردنی ئەوەش کە پێی دەڵێن "عیززەتی نەفس" و بۆ مەیسەرکردنی هاریکاری و بەدەمەوەچوونی کۆمەڵایەتییش. سەرلێشێوان و تەمومژێکی پێوانەیی گەورە لەئارادایە کە وا لە تاکەکەسە گەنجەکان دەکات نەزانن چاوەڕوانی چی بن لە خۆیان و لە کۆمەڵگاکەیان، چی لەبیر بکەن و باوەڕیان بە چی بێت، چی لاوەکییە و چی سەرەکی، چی دەشێت و چی ناشێت، تەنانەت چی باشە و چی خراپ. وێرانبوونی "ئیجماعی ئەخلاقی" لە کۆمەڵگای ئێمەدا ڕاستییەکی کۆمەڵایەتیی قابیلی نکوڵیلێکردن نییە و کۆمەڵگایەک لە دروستبووندایە بەبێ قیبلەنومایەکی ئەخلاقی و بەهایی. بۆ کەسێک لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا گەورە بووبێت زەحمەتە بتوانێت بەئاسانی باش و خراپ و دەشێت لە ناشێی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و دینی لەیەکتری جیا بکاتەوە. هەموو ئەو کایانە لە قەیرانێکی بەهایی گەورە و قووڵدا دەژین.

بێگومان هەندێک تاکەکەس توانا و ویستی ئەوەیان تێدایە خۆیان لەگەڵ ئەم دونیا شڵەژاوە و ئەو دۆخی ئامادەگیی بەهای ناکۆک و دۆخی بێبەهاییيە تازەدا بگونجێنن، بۆ نموونە بتوانن خۆیان دەوڵەمەند بکەن بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە ئەو ڕێگایانەی بۆ دەوڵەمەندبوون دەیگرنە بەر ئەخلاقییە یان نا، ڕەوایە یان هەموو ڕەوایەتییەک دەخاتە ژێر پێوە. کەسانێک هەن دەتوانن لەم پارتی سیاسییەوە بۆ ئەوی تر

و لەم هەڵویستی ئەخلاقییەوە بۆ ئەوی تر بڕۆن، بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن هەڵەیەکی سیاسی یان ئەخلاقییان کردوە. دەڵێم ئەم جۆرە کەسانە هەن و ئامادەن، بەلام کەسانێکی دیکەش هەن کە ناتوانن و نایانەوێت ئەم گەمە تازانە بکەن و بەبەردەوامی هەست بەوە دەکەن کە بەشێک نین لەو دونیا تازەیەی دروست بووە. ئەمانە هەست بە نامۆبوونێکی تەواو لە گشتێتی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەن، نامۆبوون لەوەی دۆرکهایم ناوی سێ گرنگترین دەرەوتەکانی کۆمەڵگای لێ دەنێت: کۆمەڵگای دینی و خێزانی و سیاسی.[1] ئەوانەی خۆیان دەکوژن لە هیچ یەکێک لەو سێ دەزگا سەرەکییەدا هەستکردن بە ئینتیما و بە دۆزینەوەی مانا و بە گەرمییەکی عاتیفی و کۆمەڵایەتی و ئینسانی نادۆزنەوە. ئەم دەزگایانە ناتوانن چیتر لانی هەرەکەمی شوناس بەم تاکەکەسە نامۆبووانە ببەخشن، ناتوانن لانی کەمی هەستکردن بە بەختەوەرییان بۆ دابین بکەن، بۆیە هەست بە تەنهاکەوتن و نامۆبوونێکی قووڵ دەکەن. ئەگەر یەکێک لە ئەرکەکانی دین ئەوە بێت کە تاکەکەس بەو ژینگە و کۆمەڵانەوە گرێ بدات کە لەناویاندا دەژی و ئامێزانیان بکات لەناو گروپە ئیماندارەکاندا، ئەوا پەنابردن بۆ خۆکوشتن هێمای ئەوەیە کە دین ناتوانێت چیتر ئەو ڕۆڵە ئامێزانکەرە ببینێت. خاڵێک گرنگە لێرەدا هێمایەکی خێرای پێ بکەین، ئەوەیە هەرسێ دەرکەوتە گرنگەکەی ژیانی کۆمەڵایەتی، مەبەستم خێزان و دین و سیاسەتە، ناتوانن ئاسۆیەکی ڕاستەقینە بۆ چاوەڕوانی بە تاکەکەسەکان

---

١ _بڕوانە:

Durkheim (1951). p. 208

ببەخشن، ناتوانن هێما بۆ دونیایەک بکەن کە بکرێت قابیلی لانی کەمی قبووڵکردن بێت، هیچ یەکێکیشیان کۆمەڵێک بەهای ڕوون بەو تاکەکەسانە نابەخشێت کە بتوانن پەیڕەویان بکەن و ئەم پەیڕەویکردنەش هاوسەنگی و لەنگەرێک لە ژیانیاندا دروست بکات. هاوکات هیچ یەکێکیشیان ناتوانن وەڵامی پرسیارەکان و دڵەڕاوکێکان و گومانەکانیان بدەنەوە.

بەکورتی، ئەوەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا ڕووی داوە شڵەژانێکی بەهایی و ئەخلاقی و پێوانەیی قووڵ و بەرفراوانە کە سەرجەمی ڕووبەرە جیاوازەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتیی گرتۆتەوە، دونیایەک دروست بووە چیتر هەڵگری پێناسەیەک نییە بۆ هەڵسوکەوت و کار و کردەوەی باش و ئەخلاقی، بڕێک لە مرۆڤەکان ناتوانن بەرچاوڕوونی و ڕێپێشاندەرێکی ئەخلاقییان هەبێت بۆ ئەوەی بزانن چۆن ئەتوانن ژیانێکی گونجاو و ئەخلاقی بژین. بەستنەوەی ئەم قەیرانە ئەخلاقی و فەرهەنگی و کولتوورییە بەو قەیرانە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی هێمامان پێ کردن، مەبەستم قەیران لە پیاوەتیی باڵادەست و ژنبوونی باڵادەستدا، لە سەرووی هەمووانیشەوە پەنابردن بۆ توندوتیژیی یان هەڕەشەکردنی بەردەوام بە بەکارهێنانی توندوتیژی، بەسەریەکەوە ئەو دۆخەیان دروست کردووە کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ناوی دۆخی "شڵەژانی پێوانەیی"مان لێ نا. ئەوەی ئێمە ئەمڕۆکە دەیبینین وێرانبوونی ئەو نەزمە کۆمەڵایەتییەیە، social order، کە لەئارادایە و دروستبوونی تاکەکەسی تەنها و بێپەنا و دابڕاون، کە نازانن ڕوو لە چی و کێ بکەن. ئەمانە بەسەریەکەوە ئەو دۆخە دروست دەکەن کە دۆرکهایم ناوی "ئانۆمی" لێ دەنێت. "ئانۆمی" بە

مانای دروستبوونی کۆمەڵگایەک تاکەکەسەکانی نەزانن بەها ڕاستەقینەکان کامانەن، کۆمەڵگایەک گۆڕانکاریی گەورە و هەمەلایەنی تێدا بێت، بەلام لە غیابی کۆمەڵێک بەها و یاسا و نرخی تایبەتدا، کە مانا و ئاراستەیەک بەو گۆڕانکارییانە بدەن و هاریکاریی تاکەکەسەکان بکەن بتوانن لەو گۆڕانکارییانە تێبگەن و شوێنی خۆیان لەناویاندا وەک بوونەوەرێکی مانادار بدۆزنەوە. ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدات گۆڕانی کۆمەڵگا، گۆڕانی دەزگاکانی حوکمڕانی، دروستبوونی دەزگای بیرۆکراکسیی گەورە و قەبەیە، گۆڕانی بازاڕەکان و شێوازی ئیشکردنی ئابووری و بازرگانییە، گۆڕانە لەناو خێزان خۆیدا، گۆڕانی ماناکانی دین و سیاسەتە، گۆڕانی ماناکانی پیاوبوون و ژنبوونە، بەلام هەموویان لە دەرەوەی ڕستێک لە بەها و نۆرمی ئەخلاقی و کۆمەلایەتیی ئاشکرادا کە بتوانن دەشێ و ناشێ ئاخلاقی و کۆمەلایەتی و سیاسییەکان لەیەکتری جیا بکەنەوە. نە بەها و ئەخلاق و نۆرمی دینی، نە بەها و ئەخلاق و نۆرمی مەدەنی، نە بەها و ئەخلاق و نۆرمی سیاسی، نە یاسا، هیچ یەکێک لەمانە ئەو پرۆسەی گۆڕانکارییانە ئاراستە ناکەن کە دونیای ئێمەی تێکەوتوە. لە کوردستاندا نە ژیانی سیاسی، نە ژیانی ئابووری، نە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی، نە ململانێی نێوان هێزەکان، نە دین، نە ژیانی ئەخلاقی، هیچیان خاوەنی بەها و نۆرم و ئەخلاقی تایبەتیی شوێنی متمانەپێکردن نین، کە جۆرێک لە بەرچاوڕوونی دروست بکەن، هیچیان یاسایەک نییە بەڕێوەیان ببات و ئاراستەیان بکات، شتێک نییە سنووری ئەشێ و ناشێکان دەستنیشان بکات و ئەگەرەکان لە نائەگەرەکان جیا بکاتەوە. ئەمەش

ئەو دۆخی ئانۆمییەیە کە کۆمەڵگایەکی لە شێوەی کۆمەڵگای ئێمەی تێدەکەوێت، کاتێک ئەو کۆمەڵگایە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گۆڕانکاریی خێرا و لەپڕ و هەمەلایەن دەبێتەوە، بەڵام بەبێ ڕوونییەک لە ئاراستەکانیدا و بەبێ ئامادەگیی کۆمەڵێک و یاسا و بەها لە پرۆسەی گۆڕانەکاندا.

**دەرئەنجام**

هەرێمی کوردستان بڕێکی زۆر توندوتیژیی ڕەگەزیی دژ بە ئافرەتانی تێدایە. ئەم توندوتیژییە لەمڕۆدا بە پلەی یەکەم ڕووی لەو ئافرەتە گەنجانەیە کە تەمەنیان لەنێوان ١٣ بۆ ٣٥ ساڵە. ئەرگەرچی ئەم نەوەیە لە ئافرەتان ڕووبەڕووی زۆبەی هەرەزۆری شێوازە جیاوازەکانی توندوتیژی دەبنەوە، بەڵام ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا گرنگیی پێ دراوە، سێ شێوازە لە توندوتیژی، کە بریتین لە کوشتن، خۆکوشتن، سووتان و خۆسووتاندن. بە پێچەوانەی بیرکردنەوە و شیکردنەوەی باڵادەستەوە شێوازی هەرە سەرەکی و باڵادەستی توندوتیژی لە هەرێمدا کوشتن لەسەر شەرەف نییە، بەڵکو مەسەلەی خۆکوشتن و خۆسووتاندنە. ئەگەر خۆسووتاندنیش وەک هەوڵێک بۆ خۆکوشتن ببینین، ئەوا کێشەی هەرەسەرەکیی ئەمڕۆکەی کۆمەڵگای ئێمە دەبێت بە کێشەی خۆکوشتنی ئافرەتان. ئەو ئافرەتانەش کە خۆیان دەکوژن ئەوانەن کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا لەدایک بوون و ژیاون و گەورە بوون، ئەو منداڵانەن کە یان لەدایکبوونیان یان قۆناغی منداڵییان دەکەوێتە ڕۆژگاری دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١. ئەم ئافرەتانە ئەزموونی تاڵ و تۆقێنەری جەنگ و کوشتن

و چەوساندنەوەکانی قۆناغی حوکمڕانیی سەدام حوسەین و قۆناغی خەباتی چەکداریی باوکەکانیان نییە و ناناسن. ئەو ژینگە ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ئەخلاقی و دینییەی ئەم مندالانەی تێدا گەورە بووە ئەو ژینگەیەیە کە لە سایەی حوکمڕانیی کوردیی خۆیەوە دروست بووە. بۆیە بۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتیی هەلسوکەوتی ئەم نەوەیە، بەتایبەتی بۆ تێگەیشتن لە دیاردەی خۆکوشتنیان، پێویستە وردەکارییەکانی ئەو ژینگەیە بخوێنینەوە و ڕاڤە بکەین.

خالێکی گرنگی دیکە ئەوەیە، زۆرینەی ئەوانەی کە خۆیان دەکوژن و دەبنە قوربانیی توندوتیژیی ڕەگەزی لەو شێوەیە خەلکی گوند و لادێ چەپەر و دوورەدەستەکانی کوردستان نین، بەلکو خەلکی شارە گەورەکان و شارە مامناوەندییەکانی کوردستانن. ئەوەشی ئەمانە ئەزموونی دەکەن ئەو گۆڕانە خێرا و هەمەلایەنانەیە کە ئەم شارانە لە دوو دەیەی دواییدا بەخۆیانەوە بینیوە، لە پێش هەموونیشەوە پرۆسەی بەشاربوون و گەورەبوون و تازەبوونەوە. لە هەندێک ئاستدا ئەم گۆڕانکارییانە بە جۆرێکە شتێک لەو دونیا کۆن و سونەتەییە لەم شارانەدا نەماوەتەوە کە تا کۆتایی هەشتاکان هەبوون و لەئارادا بوون. جگە لەمانە بەشی زۆری ئەو ئافرەتە گەنجانەی کە ڕووبەڕووی ئەم سێ شێوازە لە تودنوتیژیی ڕەگەزی دەبنەوە، بەتایبەتی خۆکوشتن و خۆسووتاندن، ئافرەتانێکی خوێندەوارن و لانی کەم خوێندنی ناوەندی یان دواناوەندییان هەیە. ئەمەش لە زۆر دۆخدا مانای ئەوەیە ئەم ئافرەتە گەنجانە هەلگریی جۆرێک لە تاکەکەسبوونی

مۆدێرنن، کە دونیاکەیان بەرینتر و فراوانتر و ئاڵۆزتر دەکات لە دونیای دایک و باوکانیان. زۆربەشیان دۆخی ئابووری و بژێویی ژیانیان یان باشە یان مامناوەندییە، واتە مەسەلەی توندوتیژی، بەتایبەتی خۆکوشتن، کەمتر پەیوەندیی بە هەژارییەوە هەیە. ئەوەی ئەم نەوەیە ئەزموونی دەکات، بە پلەی یەکەم، کێشە و گرفت و نائاسودەییە لەناو خێزندا. خێزان ئەو ژینەگە سەرەتاییەیە کە ئەم ئافرەتە گەنجانە بەرەو خۆکوشتن و خۆسووتاندن دەبات.

ئەم ئافرەتە گەنجانە ناتوانن لەناو نرخ و بەها پاترپارکییە سونتەییەکان و لەناو مەجالی شەخسی و داخراوی خێزاندا دەمج ببن، ناتوانن ئەو دونیا تەقلیدییەی لە هەموو ئاراستەیەکەوە ڕووی بە چەندان گۆڕانکاریدا تەقیوەتەوە، قبووڵ بکەن. ئەم نەوەیە زیاتر لەوەوە نزیکن کە شوناسی خۆیان لەپاڵ ئەگەر و مژدە و چێژ و ئارەزوەکانی ناو ئەو کولتووورە جەماوەرییە نوێیەدا دروست بکەن کە مەسرەفگەرایی لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. شوناسی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی شوناسی سێکسی، ئەم نەوەیە لەپاڵ وێنە ئیرۆتیکییە جیاوازەکانی مەسرەفگەرایی و لەپاڵ ئەو ئارەزووانەدا دروست دەبێت کە مەسرەفگەرایی و پرۆسەی بەشاربوون لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن. جگە لەمەش ئەمڕۆ دیدێکی نوێ بۆ جەستە و سێکس و ژیانی سێکسی لەدروستبووندایە کە لەگەڵ بەها سونەتییەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەدا یەک ناگرێتەوە، پیشەسازی و بازرگانییەکی ئاشکرا و نائاشکرای سێکس هەیە کە کۆمەڵگا لێی بەئاگایە و دەزانێت هەیە. هاوکات فەزایەکی سەلەفیی دینی لە دروستبووندایە و

دروست بووه کە ترس لە سێکس و دژایەتیکردنی سێکس، لە ڕێگای داپۆشینی جەستەی ئافرەت و ناشیرینکردنی لەشی پیاوەوە، لە دەرکەوتە هەرە سەرەکییەکانیەتی. بوونی ئەم هەموو قەیران و ناکۆکییانە دۆخی شڵەژانێکی پێوانیی و سەرلێشێوانی ئەخلاقییان دروست کردوە، کە بەشێک لە نەوە گەنجەکە لێیان تێناگەن و ناتوانن خۆیانی لەگەڵدا بگونجێنن. بۆ تێگەیشتن لە توندوتیژیی ڕەگەزی لە هەرێمدا پێویستە ئەم توندوتیژییە لەناو ئەم ژینگە و ڕەوتە نوێ و پڕ گۆڕانکارییەدا نیشتەجێ بکرێت.

لە ئاستێکی دیکەدا توندوتیژیی دژ بە ئافرەتان پەیوەندییەکی بەهێزی بە گۆڕانکارییەکانی دەسەڵاتی سیاسییەوە لە کوردستاندا هەیە، بە پلەی یەکەمیش گۆڕان لە دەسەڵاتێکی خاوەن هەژموونەوە بۆ دەسەڵاتێکی خۆسەپێنەر. ئەم گۆڕانە سیاسییە لە ساڵی ١٩٩١ەوە هاوشانە بە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی گرنگ کە تیایدا پێشمەرگەکانی جاران دەگۆڕێن بۆ نوخبەیەکی سەرمایەداری و سیاسیی گەندەڵ و توندوتیژ کە هەموو دەرکەوتەکانی کۆمەڵگای کوردییان هێناوەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. قەیرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیی ئەم نوخبە خۆسەپێنە بۆتە هۆی دروستبوونی قەیرانێکی گەورە لە شێوازی ئایدیالی و نموونەیی "پیاوەتیی باڵادەست" لە کوردستاندا، کە پیاوەتیی پێشمەرگانەیە. ئەم قەیرانە ڕووبەری کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی نوێی دروست کردوە بۆ دروستبوونی شێوازی تری پیاوەتی، کە ناکۆکن بە پیاوەتیی پێشمەرگانە و بەشدار بوون لە تێکشکان و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوە و بێبایەخبکردنی بەهاکانی

"پیاوەتیی پێشمەرگانە". هاوکات شێوازی نوێی ژنبوون لە کوردستاندا لەدایک بووە، کە نایەوێت و ناتوانێت شێوازە تەقلدییە باڵادەستەکانی پیاوبوون و ژنبوون قبووڵ بکات. سەپاندنەوەی بەزۆری پیاوەتیی پێشمەرگانە و سەپاندنەوەی بەزۆری ژنبوونی تەقلیدیی بەسەر کۆمەڵگادا پرۆسەیەکە نەک تەنها بە پەنابردن بۆ توندوتیژیی جۆرێک لە حەتمیەت دەبەخشێت، بەڵکو توندوتیژیی خۆشی دەگۆڕێت بۆ ئامرازی هەرسەرەکیی پاراستنی خۆسەپاندنەوەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریی نوخبەی باڵادەست لە هەرێمدا.

ئەو ئاستە بەرزەی توندوتیژیی دژ بە ئافرەتان، کە ئێستا لە هەرێمدا هەیە، هاوشانە بەو توندوتیژییە فراوانەی لە ساڵانی ڕابردوودا ڕووبەڕووی ئەو نەوە گەنجە ڕەخنەییە کراوەتەوە کە لە هەرێمدا چالاک بوون، لەوانەش بۆ نموونە، ڕفاندن و لێدان و کوشتنی ئەو ڕۆژنامەنووسە گەنجانەی بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە لەسەر ئەو دونیایەیان نووسیوە کە دروست کراوە. پەنابردن بۆ توندوتیژی و بەکارهێنانی، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی، بەشێکی ناوەکی و ئۆرگانیی ئەو نەزمە سیاسییە لە هەرێمدا دروست کراوە، نەزمێک کە کۆمەڵێک بونیادی دەسەڵاتگەرانەی دروست کردوە و لە هەوڵی ئەوەشدایە بە هەر نرخێک بووە، هەم نەزمەکە و هەم شێوازی پیاوەتیی باڵادەست و هەم دابەشکردنی نایەکسانی داهاتەکان لەناویدا بپارێزێت.

فانتازیایەکی کۆمەڵایەتی و ڕەگەزیی نوێ لە کوردستاندا لەدروستبووندایە، کە پەیوەندییەکی هێجگار زەحمەت و پڕ ناکۆکیی بەو کەلەپوور و پەیوەندییە خێزانی و کۆمەڵایەتییە

کۆن و درێژخایەنانەوە هەیە کە لەئارادان. سەرجەمی ئەو کۆدە ئەخلاقییانەی کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەناوەکیی کراون و بە شێوەیەکی ڕۆتینی لەناو تاکەکاندا چێندراون و پەیڕەو کراون، ئێستا ڕووبەڕووی گومان و پرسیاری گەورە بوونەتەوە. ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی لە کوردستاندا تاکەکەسە جیاوازەکانی بەیەکەوە دەبەستەوە، لەوانەش، بۆ نموونە، پەیوەندییەکانی خزمخواهی، هاوشوێنی، بە مانای ئەوەی خەڵکی گەڕەکێک یان ناوچەیەکی دیاریکراو بیت، دین و ناسیۆنالیزم، سیاسەت، هەموویان گۆڕانکاریی گەورەیان بەسەردا هاتووە. پەیوەندییەکانی ناو خێزان و شوناسەکانی، پەیامە دینییەکان و دەزگاکانی، پارتە سیاسییەکان و ئۆرگانە جیاوازەکانیان، چیتر ئەو پێگەیەیان نەماوە بتوانن متمانە بە تاکەکەسەکان، لانی کەم بە ژمارەیەکی بەرچاو لە تاکەکەسەکانی کۆمەڵگای ئێمە ببەخشن. هەموو ئەم شوێنانە بوون بە ڕووبەری کۆمەڵایەتیی پڕ لە ناکۆکی و ململانێ و بێباوەڕی، کە هێشتنەوەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەناویاندا پێویستی بە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی هەیە. ئەم توندوتیژییەش لە ژینگەیەکدا پیادە دەکرێت کە تازەیە، ژینگەیەک کە زۆرینەی هەرەزۆری ژینگەیەکی شارییە. بەکورتییەکەی، مەسەلەکە تەنها مەسەلەی بوونی کەلەپوورێکی خێڵەکی چەند سەد ساڵە نییە کە خۆی دووبارە دەکاتەوە و دەبێتە هۆی کوشتن و خۆکوشتنی ئافرەتان، بەڵکو مەسەلەی سەرەکیی دروستبوونی ئەو ژینگە تازەیەیە کە پرۆسە سەرەکییەکانی و هەندێک لە تەفاسیلەکان

و کێشەکانی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەوردی باس کران.

بێگومان مەسەلەی تاوانبارکردنی پاتریارکیانەی ژیانی سێکسیی ژنان لە هەرێمدا بەشێکە لەو هۆکارانەی کە پێویستە لە شیکردنەوەی دیاردەی توندوتیژیی ڕەگەزیدا بەرامبەر بە ئافرەتان باس بکرێت و گرنگیی پێ بدرێت، بەڵام وەک ئەم لێکۆڵینەوەیە نیشانی دا ئەمە هەموو دیمەنەکە شی ناکاتەوە. شیکردنەوەی دروستبوونی ژینگە شارییە تازەکان بەو شڵەژانە پێوانەییەوە کە تیایاندا دروست بووە، بەتەنها ڕێگەیەک نییە بۆ ئەوەی لە ڕەگوڕیشە و هۆکارەکانی ئەم توندتیژییە تێبگەین، بەڵکو هاوکات هاریکارمان دەبێت بۆ بیرکردنەوە و داهێنانی ستراتیژیەتی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم توندوتیژییە. بەشێکی زۆری ئەو ئەدەبیاتەی لەسەر توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا نووسراوە، تا ئێستاش ئەم گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییانە پشتگوێ دەخات. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەنگاوێکی سەرەتاییە بۆ خوێندنەوە و سەیرکردنێکی نوێ بۆ ئەم بابەتە.

### ژمارەکان و ئامارەکان

وەک لە سەرەوە هێمای بۆ کرا ئەو ئامارانەی لەم لێکۆڵینەوەدا بەکار هاتوون لەلایەن "بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان" کۆ کراونەتەوە و ئەم بەڕێوەبەرایەتییەش سەر بە وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمە. ئەم دەزگایە بەرپرسی کۆکردنەوەی

زانیارییە لەسەر توندوتیژیی ڕەگەزی دژ بە ژنان لە هەرێمدا، کۆکردنەوەی ژمارەکانیش لە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوە ئەنجام ئەدرێت، لەوانە: لە ڕێگای قوربانییەکان خۆیانەوە، لە ڕێگای دەزگاکانی پۆلیسەوە، لە ڕێگای نەخۆشخانەکان و دەزگاکانی تەندروستیی لە هەرێمدا. ئەو ئامارانەی کە بەکار هاتوون ئاماری سالآنی ٢٠١٠ و ٢٠١١ و ٢٠١٢ و ٢٠١٣ شارەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆکن. ژمارەکان ئەم چەند لایەنە دیاریکراوانە دەگرێتەوە: ژمارەی قوربانییەکان، جۆری توندوتیژییەکان، تەمەنی قوربانییەکان، دۆخی شەخسییان (شوویان کردوە یان نەیانکردوە) ئاستی خوێندەوارییان، ئاستی بژێویی ژیانیان، شوێنی نیشتەجێبوونیان. ئەم لێکۆڵینەوەیە دەخوازێت لە ڕێگای شیکردنەوەی ئەو ژمارە و زانیاریيانەوە وێنەیەکی ڕاستتر و گشتیتر سەبارەت بە دیاردەی توندوتیژیی دژ بە ئافرەتان لە کوردستاندا بخاتە بەردەمی خوێنەران.

ئامارەکان لەم سێ خشتەیەی لای خوارەوە بەپێی شارەکان کۆ کراوەتەوە و نیشان دراون. لەبەر کەمیی ماوە نەکرا تەفاسیلی ژمارەکانی لە ساڵی ٢٠١٢ و ٢٠١٣دا لەناو خشتەکاندا تۆمار بکرێت، بەلآم ئەم تۆمارنەکردنە لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان ساڵەکاندا نییە. مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەش لێکدانەوەیەکی وردی ژمارەکان نییە، بەڵکو دروستکردنی وێنە گشتییەکەی بەکارهێنانی توندوتیژییە لە هەرێمدا بەرامبەر بە ئافرەتان.

## پاریزگای هەولێر

| | ٢٠١٠ | ٢٠١١ | ٢٠١٢ | ٢٠١٣ |
|---|---|---|---|---|
| ١-خۆکوشتن | ١٢ | ٩ | ٩ | ١٥ |
| تەمەن | ١٣-١٨: ٢٥%<br>١٩-٣٠: ٦٧%<br>٣١-٦٠: ٨% | ١٣-١٨: ١١%<br>١٩-٣٠: ٤٨%<br>٣١-٦٠: ٤١% | ١٤-٣٧: ١٠٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| باری خێزانی | شووکردوو: ٦٧%<br>شوونەکردوو: ٣٣% | شووکردوو: ٣٣%<br>شوونەکردوو: ٦٧% | شووکردوو: ٦٧%<br>شوونەکردوو: ٣٣% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٧٥%<br>نەخوێندەوار: ٢٥% | خوێندەوار: ٧٨%<br>نەخوێندەوار: ٢٢% | خوێندەوار: ١٠٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەروومامناوەندیی: ٤١%<br>مامناوەندی: ٤٢%<br>هەژار: ١٧% | سەروومامناوەندیی: ٥٦%<br>مامناوەندی: ٤٤% | سەروومامناوەندی: ٧٨%<br>مامناوەندی: ٢٢% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٣٣%<br>قەزاوناحیە:٥٩%<br>گوند:٨% | شار: ٥٦%<br>قەزاوناحیە: ٤٤% | شار: ٥٦%<br>قەزاوناحیە: ٤٤% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| ٢-کوشتن | ٢٦ | ٢٣ | ٢٢ | ٢٨ |
| هۆکار | تۆڵەی شەرەف: ١٩%<br>کێشەی خێزانیی: ٦٦%<br>نەزانراو: ١٥%* | ٤ تاوانی شەرەف تۆمارکراوە | تاوانی شەرەف: ٣٢% | |
| تەمەن | ١٣-١٨: ٧%<br>١٩-٣٠: ٥٧%<br>٣١-٦٠: ٣٢%<br>[illegible]: ٤% | ١٣-١٨: ٢١%<br>١٩-٣٠: ٣٨%<br>٣١-٦٠: ٤١% | ١٦-٣٦: ٩١%<br>٦٠-٧٠: ٩% | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| باری خێزانیی | شووکردوو: ٨٢%<br>شوونەکردوو: ١٨% | شووکردوو: ٤٨%<br>شوونەکردوو: ٥٢% | شووکردوو: ٧٣%<br>شوونەکردوو: ٩%<br>جیابووەوە: ١٨% | |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٥٤%<br>نەخوێندەوار: ٤٦% | خوێندەوار: ٨٠%<br>نەخوێندەوار: ٢٠% | خوێندەوار: ٩١%<br>نەخوێندەار: ٩% | |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەروماماناوەندی: ١١% | سەرومامناوندی: ٣٥%<br>مامناوندی: ٣٩% | سەرومامناوندی: ٤٥%<br>مامناوندی: ٥٥% | |
| | مامناوەندی: ٧٨%<br>هەژار: ١١% | هەژار: ٢٦% | | |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٤٧%<br>قەزاوناحیە: ١٤%<br>گوند: ٣٩% | شار: ٣٧%<br>قەزاوناحیە: ٤٢%<br>گوند: ٢١% | شار: ٥٠%<br>قەزاوناحیە: ٢٣%<br>گوند: ٢٧% | |
| ٣-سوتان | خۆسوتان: ١٠٢**<br>قەزاوقەدەر: ٦٤ | خۆسوتان: ٣٧<br>قەزاوقەدەر: ٨٤ | خۆسوتان: ٤٥<br>قەزاوقەدەر: ١١٤ | خۆ سووتان: ٤٦<br>قەزاو قەدەر: ١٠٠ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هۆکار | کێشەی خێزانیی: %٥٥<br>کێشەی خۆشەویستیی: %٦<br>کێشەی کۆمەڵایەتیی: %٦<br>کێشەی دەرونیی: %١١<br>نەزانراو: %٢٢ | | | | | |
| تەمەن | ١٣-١٨: %٢٣<br>١٩-٢٩: %٥٦<br>٣١-٦٠: %٢١ | ١٣-١٧: %١٧<br>١٨-٣٠: %٤١<br>٣١-٦٠: %٤٢ | ١٣-١٧: %٣٠<br>١٨-٣٠: %٥٩<br>٣١-٦٠: %٨<br>+٦٠: %٣ | ١٣-١٨: %٢٤<br>١٩-٣٠: %٥٤<br>٣١-٦٠: %٢٢ | ١٣-١٨: %٢٩<br>١٩-٣٠: %٤٧<br>٣١-٦٠: %٢٤ | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باری خێزانیی | شووکردوو: ٦٥%<br>شوونەکردوو: ٣٥% | شووکردوو: ٥٤%<br>شوونەکردوو: ٤٦% | شووکردوو: ٤٥%<br>شوونەکردوو: ٥٥% | شووکردوو: ٦٧%<br>شوونەکردوو: ٣٣% | شووکردوو: ٥٦%<br>شوونەکردوو: ٤٤% | |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٥١%<br>نەخوێندەوار: ٤٩% | خوێندەوار: ٧٧%<br>نەخوێندەوار: ٢٣% | خوێندەوار: ٨٢%<br>نەخوێندەوار: ١٨% | خوێندەوار: ٨٢%<br>نەخوێندەوار: ١٨% | خوێندەوار: ٦١%<br>نەخوێندەوار: ٣٩% | |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەرو مامناوەندیی: ٢٣%<br>مامناوەندیی: ٦٣%<br>هەژار: ١٤% | سەرو مامناوەندیی: ٤٩%<br>مامناوەندیی: ٣٢%<br>هەژار: ١٩% | سەرومامناوەندیی: ٢٦%<br>مامناوەندیی: ٣٢%<br>هەژار: ٤٢% | سەرو مامناوەندیی: ٤٠%<br>مامناوەندیی: ٤٩%<br>هەژار: ١١% | سەرو مامناوەندیی: ٤٢%<br>مامناوەندیی: ٣٥%<br>هەژار: ٢٣% | |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٣٩%<br>قەزاوناحیە: ٣٧%<br>گوند: ٢٤% | شار: ٦٠%<br>قەزاوناحیە: ٤٠% | شار: ٤٠%<br>قەزاوناحیە: ٤٥%<br>گوند: ١٥% | شار: ٥٠%<br>قەزاوناحیە: ٢٣%<br>گوند: ٢٧% | شار: ٤٠%<br>قەزاوناحیە: ٤٥%<br>گوند: ١٥% | |

## پارێزگای سلێمانی

| | ٢٠١٠ | ٢٠١١ | ٢٠١٢ | ٢٠١٣ |
|---|---|---|---|---|
| ١-خۆکوشتن | ٢٥ | ١٩ | ١٥ | ٨ |
| تەمەن | ١١-٢٠: ٥٥%<br>٢١-٣٠: ٢٤%<br>٣١-٤٠: ٩%<br>٤١-٥٠: ٦%<br>٥١-٦٠: ٣%<br>نەزانراو: ٣% | ١١-٢٠: ٣٧%<br>٢١-٣٠: ٣٢%<br>٣١-٤٠: ١٦%<br>٤١-٥٠: ٥%<br>٥١-٦٠: ٥% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| باری خێزانیی | شووکردوو: ٥٨%<br>شوونەکردوو: ٣٦%<br>نەزانراو: ٦% | شووکردوو: ٥٢%<br>شوونەکردوو: ٣٧%<br>نەزانراو: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٥٥%<br>نەخوێندەوار: ٣٠%<br>نەزانراو: ١٥% | خوێندەوار: ٧٣%<br>نەخوێندەوار: ١٦%<br>نەزانراو: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەروماماناوەندیی: ٥٥%<br>ماماناوەندیی: ٢١%<br>هەژار: ١٢%<br>نەزانراو: ١٢% | سەروماماناوەندیی: ٦٣%<br>ماماناوەندیی: ٢٦%<br>هەژار: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٣٤%<br>قەزاوناحیە:٢١%<br>گوند:٣٠%<br>گوندی بچووک: ١٥% | شار: ٤٢%<br>قەزاوناحیە: ٤٢%<br>گوند: ١٦% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| ٢- کوشتن | ٨ | ٩ | ١٠ | ٤ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| هۆکار | کێشەی خێزانیی: ٢٧% کێشەی کۆمەڵایەتیی: ٢٧% نەزانراو: ٤٦%* | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| تەمەن | بە شێوەیەکی گشتی هەمان ڕێژەی خانەی خۆکوشتنە | ١١-٢٠: ٢٠%<br>٢١-٣٠: ٤٥%<br>٣١-٤٠: ٣٣%<br>٤١-٥٠: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |
| باری خێزانیی | بە شێوەیەکی گشتی هەمان ڕێژەی خانەی خۆکوشتنە | شووکردوو: ٨٩%<br>شوونەکردوو: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی ساڵانی پێشوو |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاستی خویندەواریی | بە شێوەیەکی گشتی خانەی هەمان ڕێژەی خۆکوشتنە | خوێندەوار: ٥٥%<br>نەخوێندەوار: ٤٥% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | بە شێوەیەکی گشتی خانەی هەمان ڕێژەی خۆکوشتنە | سەروماماناوەندیی: ٤٥%<br>ماماناوەندیی: ٣٣%<br>هەژار: ١١%<br>نەزانراو: ١١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| شوێنی نیشتەجێبوون | بە شێوەیەکی گشتی خانەی هەمان ڕێژەی خۆکوشتنە | شار: ٣٤%<br>قەزاوناحیە: ٣٣%<br>گوند: ٣٣% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| سوتان | قەزاوقەدەر: ١٠٤<br>خۆسوتان: ٤٩ | خۆسوتاندن: ٣٧<br>قەزاوقەدەر: ٨٧ | خۆسوتاندن: ٣٠<br>قەزاوقەدەر: ٧٦ | خۆسوتاندن: ٢١<br>قەزاوقەدەر: ٥٧ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هۆکار | کێشەی خێزانی: ١٠%<br>قەزاوقەدەر: ٦٩%<br>کێشەی کۆمەلایەتیی: ٨%<br>نەزانراو: ١٢% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| تەمەن | ١١-٢٠: ٣٩%<br>٢١-٣٠: ٤٤%<br>٣١-٤٠: ١٠%<br>٤١-٥٠: ١%<br>٥١-٦٠: ١%<br>+٦١: ٥% | ١١-٢٠: ٢٧%<br>٢١-٣٠: ٥١%<br>٣١-٤٠: ١٤%<br>٤١-٥٠: ٣%<br>+٦١: ٥% | ١١-٢٠: ٢٤%<br>٢١-٣٠: ٤٠%<br>٣١-٤٠: ١٨%<br>٤١-٥٠: ٢%<br>٥١-٦٠: ٥%<br>+٦٠: ١% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باری خێزانیی | شووکردوو: ٦٣% شوونەکردوو: ٣٢% نەزانراو: ٥% | شووکردوو: ٦٨% شوونەکردوو: ٣٢% | شووکردوو: ٣٠% شوونەکردوو: ٦٢% نەزانراو: ٨% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٦٧% نەخوێندەوار: ٢٢% نەزانراو: ١١% | خوێندەوار: ٨٤% نەخوێندەوار: ١٦% | خوێندەوار: ٧٧% نەخوێندەوار: ٢١% نەزانراو: ٢% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | سالانی پێشوو | |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەرومامناوەندیی: %٥٤ مامناوەندیی: %٢٥ هەژار: %٢ نەزانراو: %١٩ | سەرومامناوەند یی: %٦٢ مامناوەندیی: %٣٠ هەژار: %٨ | سەرومامناوە ندیی: %٦٢ مامناوەندیی: %٢٥ هەژار: %٢٥ نەزنراو: %١٣ | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| شوێنی نیشتەجێ | شار: %٣٩ قەزاوناحیەکان: %٣١ گوند: %٢١ گوندی بچووک: %٩ | شر: %٣٧ قەزاوناحیەکان: %٥٥ گوند: %٨ | شار: %٢٠ قەزاوناحیەک ان: %٧٤ گوند: %٦ | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |

## پارێزگای دهۆک

| | ٢٠١٠ | ٢٠١١ | ٢٠١٢ | ٢٠١٣ |
|---|---|---|---|---|
| ١-خۆکوشتن | ١٥ | ١٠ | ١٠ | ٨ |
| تەمەن | ٨-١٨: ٢٧%<br>١٩-٣٠: ٦٠%<br>٣١-٦٠: ١٣% | ١٤-٣٠: ٨٠%<br>٣١-٦٠: ٢٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| باری خێزانیی | شووکردوو: ٣٣%<br>شوونەکردوو: ٦٧% | شووکردوو: ٥٠%<br>شوونەکردوو: ٥٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٦٠%<br>نەخوێندەوار: ٤٠% | خوێندەوار: ٤٠%<br>نەخوێندەوار: ٦٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەروماماناوەندیی: ٣٤%<br>هەژار: ١٣%<br>نەزانراو: ٥٣% | سەروماماناوەندیی: ٤٠%<br>ماماناوەندیی: ٣٠%<br>هەژار: ١٠%<br>نەزانراو: ٢٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی پێشوو |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٢٧%<br>قەزاوناحیەکان:٧٣% | شار: ١٠%<br>قەزاوناحیەکان: ٤٠%<br>گوند: ٤٠% | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی | بە شێوەیەکی گشتیی هەمان ڕێژەکانی سالانی |
| | | | پێشوو | پێشوو |
| ٢-کوشتن | ١٠ | ٦ | ٩ | ٤ |
| هۆکار | ٥٠% تاوانی شەرەف | ٥٠% تاوانی شەرەف | | |
| تەمەن | ١٩-٣٠: ٦٧%<br>٣١-٦٠: ٣٣% | ١٩-٣٠: ٨٣%<br>٣١-٦٠: ١٧% | | |
| دۆخی خێزانیی | شووکردوو: ٦٧%<br>شوونەکردوو: ٢٠%<br>جیابوەوە: ١١% | شووکردوو: ٨٣%<br>جیابووەوە: ١٧% | | |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٤٤%<br>نەخوێندەوار: ٥٦% | خوێندەوار: ٣٣%<br>نەخوێندەوار: ٦٧% | | | | | |
| ئاستی ژیانی ئابووریی | سەرومامناوەندیی: ١٠٠% | سەرومامناوەندیی: ٣٣%<br>مامناوەندیی: ١٧%<br>نەزانراو: ٥٠% | | | | | |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ٣٣%<br>قەزاوناحیەکان: ٦٧% | قەزاوناحیەکان: ١٠٠% | | | | | |
| ٣- سوتاندن | ٨٥ (وردەکارییەکانی نادیارە) | خۆسوتان: ٥١ | قەزاوقەدەر: ٣٤ | خۆسوتا ن: ٢٥ | قەزاوقەد ەر: ٣٥ | خۆسوتا ن: ٢١ | قەزاوقەدە ر: ٥٧ |
| هۆکار | کێشەی خێزانیی: ١١%<br>قەزاوقەدەر: ٦٦%<br>کوشتنی بە ئەنقەست: ١٥%<br>کێشەیدەرونیی: ٣%<br>نەزانراو: ٥% | | | | | | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| تەمەن | ٨-١٨: ٣٢%<br>١٩-٣٠: ٥٦%<br>٣١-٦٠: ١١%<br>نەزانراو: ١% | ١٣-٣٠: ٧٥%<br>٣١-٦٠: ٢٥% | ١٣-٣٠: ٧٩%<br>٣١-٦٠: ٢١% | | | |
| دۆخی خێزانیی | شووکردوو: ٥٩%<br>شوونەکردووە: ٤٠%<br>بەدەزگیران: ١% | شووکردوو: ٦٥%<br>شوونەکردوو: ٣٥% | شووکردوو: ٥٦%<br>شوونەکردوو: ٤٤% | | | |
| ئاستی خوێندەواریی | خوێندەوار: ٥٥%<br>نەخوێندەوار: ٤٥% | خوێندەوار: ٥١%<br>نەخوێندەوار: ٤٩% | خوێندەوار: ٥٣%<br>نەخوێندەوار: ٤٧% | | | |
| شوێنی نیشتەجێبوون | شار: ١٨%<br>قەزاوناحیەکان: ٨٢% | شار: ٤١%<br>قەزاوناحیەکان: ٤٩%<br>گوند: ١٠% | شار: ٢٩%<br>قەزاوناحیەکان: ٥٣%<br>گەند: ١٨% | | | |

# بەشی سێهەم

## شارەکانی هەرێم و دروستبوونی "ڕووبەری گشتی"ی نوخبەویی

# شارەکانی هەرێم و دروستبوونی "ڕووبەری گشتی"ی نوخبەویی

**سەرەتا**

ئـەوەی ئەمـرۆ بـە هــەر یەکێـک لـە شــارەکانی کوردســتاندا تێپەڕێـت، دەزانێـت کۆمەڵێـک ڕووبــەری کۆمەڵایەتیـی نـوێ لـە دروســتبووندان کـە جیـاوازن لـەو ڕووبـەرە کۆمەڵایەتییـە سونەتییانەی جاران لە کوردستاندا ئامادە بوون. ژمارەیەکی زۆر لـە چاخانـە و قاوەخانـە و بـاخ و گۆڕەپـان و شـوێنی یەکدیبینیـن و سـەیران و گفتوگۆکـردن دروسـت بـوون، کـە جاران یـان نەبـوون یـان بـەو شـێوەیەی ئەمڕۆکـە لـە دونیـای ئێمـەدا بوونیـان نەبـووە. لە شـارێکی وەک سلێمانیدا بۆ نموونە، دەیـان شـوێنی وەک "کافـێ نالـی" لـە سـەرچنار، "قاوەخانـەی کولتووری"، "کافـێ ١١"، قاوەخانـەی "سـیتی سـێنتەر" و "سـیتی سـتار" و "باخـی شـار" و چەندانـی تـر دروسـت بـوون، کـە پێشـتر لـەو شـێوە شـوێنانە بوونیـان نەبـووە. ئەمـە جگـە لـە دروســتبوونی چەنـدان شــەقام و مـۆڵ و باخچـەی نـوێ و چەندان یانـە و شـوێنی حەوانـەوە کە بەسـەریەکەوە بەشـێکن لە هەندەسـەی نوێـی شـارەکان لـە هەرێمـدا. لە هەولێـر و دهۆکیش هەمـان دیـاردە ئامادەیـە و گۆڕانەکانیـش لـەو دوو شـارەدا هاوشـێوەن و هەمـان ئاراستەشـیان هەیـە. لـەو دوو شـارەشـدا

چەندان قاوەخانە و یانە و مۆڵ و پارک و شوێنی گشتیی نوێ دروست کراون، کە لە دونیای بەر لە ڕاپەڕیندا بوونیان نەبووە. ژمارەی ئەم جۆرە شوێنانەش تا دێت ڕوویان لە زیادبوون و گەورەبوونە و تا دێت زیاتر ڕوخساری شارە گەورەکانی کوردستان دەستنیشان دەکەن.

ئەم ڕووبەرە تازانە بەشێکن لە پرۆسەی تازەبوونەوەی شارەکانی کوردستان، ئەو پرۆسەیەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن ئوربانیزەیشن urbanization و هێما بۆ دروستبوونی کۆمەڵێک ڕووبەری شاریی نوێ دەکەن جیاواز لە ڕووبەرە سونەتییەکانی ناو دونیای ئێمە. لەم شوێنە تازانەدا هەم کتێب و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی جیاواز هەن، هەم پەیوەندیی ئینتەرنێتی هەیە، کە ئەو شوێنانە بە دونیای دەرەوەوە گرێ ئەدەن، هەم "جمهوور"ێکی تێدایە جیاواز لە جمهووری زۆرێک لە شوێن و ڕووبەرەکانی تری ناو کۆمەڵگای ئێمە. هەموو ئەم شتانە لە ڕووی تیۆرییەوە ئەگەری ئەوە بەم شوێنانە ئەدەن کە ببن بە شوێنی ئەلتەرناتیڤ و داهێنەری گوتار و زمان و پەیوەندی و خەیاڵێک جیاواز لەوەی لە ڕووبەرە سونەتییەکاندا ئامادەیە. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا بەڕاست ئەم ڕووبەرە تازانە چین و چۆن بتوانین لەڕووی تیۆرییەوە مامەڵەیان بکەین؟ چ جۆرە چەمک و زمان و تیۆرییەک بەکار بهێنین بۆ تێگەیشتن لە چییەتی ئەم شوێنانە و لەو ئەرک و ڕۆڵانەی دەشێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ببینن؟ ئەوەی من لێرەدا بۆ خوێندنەوەی ئەم ڕووبەرە نوێیانە پێشنیاری دەکەم، چەمکی "ڕووبەری گشتیی"ە، بەو شێوەیەی لای فەیلەسوفی ئەڵمانی: یۆرگن هابرماز و هەندێک تیۆریستی تری دوای

هابرماز ئامادەیە. بە بۆچوونی من ئەم چەمکە دەتوانێت هاریکارمان بێت بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی تیوری بۆ خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی ئەم پرۆسە تازانەی بەشاربوون و دروستبوونی ئەم ڕووبەرە نوێیانە لە دونیای ئێمەدا.

بەڵام بەر لەوەی لەسەر هەندێک ئاکاری سەرەکیی ئەم ڕووبەرە تازانە بدوێم، سەرەکیترین پرسیارێک لێرەدا بیکەم ئەمەیە: ئایا بەڕاست ئەم شوێنە تازانە "ڕووبەری گشتی"ی نوێن بە مانا هابرمازییەکەی، یان شتێکی جیاوازن و بەشێکن لە کۆمەڵێک پرۆسەی کۆمەڵایەتیی دیکە کە کردەی دروستکردنی "ڕووبەری گشتی" ئاراستەیان ناکات. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە سەرەتا ماناکانی چەمکی "ڕووبەری گشتی" لێک بدەینەوە.

**ڕووبەری گشتی چییە؟**

یورگن هابرماز، فەیلەسوف و کۆمەڵناسی ئەڵمانی، لەساڵی ١٩٦٢ کتێبێک بە ناوی *گۆڕانکارییە بونیادییەکانی ڕووبەری گشتی* دەنووسێت، ئەم کتێبە دواتر دەبێت بە یەکێک لە کتێبە هەرە گرنگ و بەناوبانگەکان دەربارەی "ڕووبەری گشتی" کە بە عەرەبی "المجال العام" و بە ئینگلیزیی Public Sphere ی پێ دەڵێن. هابرماز لەم کتێبەدا بەوردی دەستنیشانی ماناکانی "ڕووبەری گشتی" دەکات و دەیکات بە یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی قسەکردن لەسەر کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. کتێبەکە وێنەیەکی گشتی و ئایدیالیی ئەو "ڕووبەرە گشتییە" دەکێشێت کە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگا ئەورووپییەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن. ڕووبەرێک

ئەو بە "مۆدێلی لیبرالانەی ڕووبەری گشتیی بۆرجوازییانە" لە سەدەی هەژدەهەمدا ناوی دەنێت. هابرماز لە داتاشینی چەمکی "ڕووبەری گشتی"دا سەرنج لەو گۆڕانکارییانە ئەدات کە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا دێتە کایەوە، بەتایبەتی ئەو گۆڕانکارییانەی کە چینی بۆرژوازیی لە ژیانی گشتیی ئەو کۆمەڵگایانەدا دروستی دەکات. لە دیدی هابرمازدا یەکێک لە گرنگترین گۆڕانکارییەکانی سەدەی هەژدەهەم، بریتییە لە دروستکردنی شوێنی کۆبوونەوە و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی لەناو شارەکاندا، شوێنێک کە تیایاندا هەم کات بەسەر دەبرێت و هەم قسەوباس و ڕاگۆڕکێ لەسەر مەسەلە سەرەکی و گشتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت. لە دیدی هابرمازدا، ئاکاری سەرەکیی ئەم کۆبوونەوە و ڕاگۆڕکێیانە دەستگەیشتن و گۆڕینەوەی ئازادی زانیارییەکانە بە هەمووان و لەنێوان هەمووواندا.

هابرماز شوێن لە "ڕووبەری گشتی"دا وەک ڕووبەرێکی جوگرفی مامەڵە ناکات، بەڵکو وەک ڕەهەندێکی گرنگ لە ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی وێنای دەکات. چاخانەکان و قاوەخانەکان و زانکۆکان و شوێنە گشتییەکانی تر، تەنها باڵەخانە و بینا و ڕووبەری جوگرافیی تایبەت نین، تەنها شوێنی مادی نین، بەڵکو درێژکراوەی ژیانی کۆمەڵایەتین. شوێنێکن تیایاندا خەڵک بیر و بۆچوونی خۆیان دەر دەبڕن و باس لە ژیانی خۆیان لەناو کۆمەڵگادا دەکەن (Habermas 1974: 49). لە دیدی هابرمازدا ئەوانەی لەم شوێنانەدا کۆ دەبنەوە و ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان دەر دەبڕن، ئەو کەسانەن کە "ڕای گشتی" دروست دەکەن (Habermas

(1974: 50).

لای هابرماز ئەم "ڕووبەرە گشتییە" دوو ئاکاری سەرەکیی هەیە. یەکەمیان ئەوەیە هەموو کەسێک ئەتوانێت بچێتە ناویەوە. دووهەمیان ئەوەیە هەمووان تیایدا ئازادانە توانای قسەکردن و ڕاگۆڕکێ و دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆیان هەیە (Habermas 1974: 49). هەمووانیش وەکو یەک دەستیان بەو زانیارییانە دەگات کە لەبەردەستدایە، واتە هیچ زانیارییەک لە هیچ کەس و لایەنێک ناشاردرێتەوە. ئەمانە وا دەکەن هابرماز ئاکارێکی دیموکراسییانەی بەهێز بە "ڕووبەری گشتی" ببەخشێت.

ئەو خاڵەی کە هابرماز لەسەری دەوەستێت ئەوەیە، کە لەم "ڕووبەرە گشتیی"ەدا بۆچوون و دید و ڕوانینی جیاواز و کەسانی سەر بە چین و پێگەی کۆمەڵایەتیی جیاواز ئامادەن. "گشتی" لە دەستەواژەی "ڕووبەری گشتی"دا هێما بۆ دروستبوونی فەزایەکی کۆمەڵایەتیی هاوبەش دەکات، کە کراوەیە بە ڕووی هەمواندا و تیایدا هەمووان دەتوانن بچنە ناو دەزگاکان و گوتارەکانیەوە، هەمووان ئەتوانن لەو فەزایەدا باس لە "مەسەلە گشتییەکان" ی ژیانی پێکەوەییبان بکەن و هەرکەسە و دەنگی خۆی وەک دەنگێکی بیستراوی ناو ئەو ڕووبەرە ئەزموون بکات. ئەوەی "گشتی"یە لە "ڕووبەری گشتی"دا ئەو مەسەلانەیە کە شوێنی گرنگییپێدانی هەمووانن، شتگەلێک نین پەیوەندییان بە ژیانی تایبەتیی ئەم یان ئەو کەس و لایەنەوە هەبێت، بەڵکو ئەو شتانەیە کە پەیوەندییان بە ژیانی گشتییەوە هەیە.

وەک وتم هابرماز دروستبوونی ئەم ڕووبەرە گشتییە

بە ئاکاری بۆرژوازییەتەوە گرێ ئەدات و بۆرژوازیەت وەک دروستکەری ئەو ڕووبەرانە دەبینێت، بەڵام هاوکات لەو کتێبەدا هابرماز هێما بۆ دروستبوونی "ڕووبەری گشتیی تر" و جیاواز لە "ڕووبەری گشتی"ی بورژوازییانە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا دەکات. بۆ نموونە باس لە "ڕووبەری گشتیی پرۆلیتاریا" دەکات، کە شتگەلێکی تێدا دەگوترێت و ئاڵوگۆڕ دەکرێت جیاواز لەوەی لە ڕووبەری گشتیی بۆرژوازیانەدا دەکرێت. هابرماز ئەم ڕووبەرە گشتییە پرۆلیتارییە بە "ڕووبەری کەنار" ناو دەبات، لە کاتێکدا "ڕووبەری گشتی"ی بۆرژوازیانە وەک "ناوەند" یان "سێنتەر" ناو دەنێت. خاڵێک لە تێزەکەی هابرمازدا بەرچاوە ئەوەیە لە سەدەی هەژدەهەمدا پەیوەندییەکانی ناو "ڕووبەری گشتی " پەیوەندیی ڕووبەڕوو و فیزیاییە، کەسەکان بۆ ئەوەی ڕا و بۆچوونەکانیان بڵێن، دەبوایە خۆیان لەناو ئەو ڕووبەرانەدا ئامادە بن، یان لانی کەم ئەو نووسین و وتارانە بخوێننەوە کە لە ڕۆژنامە تیراژکەمەکانی ئەو سەردەمەدا لەناو ئەو چاخانە و قاوەخانە و شوێنە گشتییانەدا دادەنران. لە دونیای ئەمڕۆدا ئەم دۆخە بەتەواوی گۆڕاوە، هابرماز خۆشی لە ئەنجامی گەشەی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی و هاتنەکایەی بەرفراوانی میدیای جەماوەریدا دەسکاریی تێزەکەی دەکات و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە مەرج نییە مرۆڤەکان ڕووبەڕوو یەکتری ببینن بۆ ئەوەی ببن بە بەشێک لە ڕووبەری گشتی. تاکەکەسەکان دەتوانن بیر و بۆچوونەکانیان لە ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکان و تەلەفیزۆنەکان و ڕادیۆکان و سایتەکانی سەر ئینتەرنێتدا بەیان بکەن و بەمەش ببن بە

بەشێک لەو ڕای گشتییەی کە دروست دەبێت، ئەمەش مانای ئەوەی کە دەکرێت ڕووبەری گشتیی تر دروست ببێت بەبێ تێپەڕین بەناو کردەی یەکتربینین و پێکەوەبوونی فیزیاییانە لە شوێنێکی گشتیدا.

## ڕووبەری گشتی و عەقڵانیەت

لە دیدی هابرمازدا ئەوەی دەتوانێت لەو گشتە ئاڵۆزەی ئامادەگیی لەناو ڕووبەری گشتیدا "ڕایەکی گشتی" دروست بکات، بیرکردنەوە و بەرخوردی عەقڵانیانەیە، توانای عەقڵە لە یەکخستنی ڕا و بۆچوونە جیاوازەکاندا، دروستبوونی ڕێکەوتنە لەنێوان دید و ڕوانینە جیاوازەکاندا لەسەر بنەمای گفتوگۆ و بەرخوردی عەقڵانی. ئەم ڕەگەزە عەقڵانیانەیە وا دەکات گرنگ نەبێت کێ چ پاشخانێکی کۆمەڵایەتیی هەیە و کێ لە کوێوە هاتووە، گرنگ نەبێت ئەوەی قسە دەکات کوڕی چ بنەماڵە و خێزانێک بێت و لە کام بەشی کۆمەڵگاوە هاتبێت. ئەوەی لە ڕووبەری گشتیدا کەسەکان بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە پێگە کۆمەڵایەتییەکانیان نییە، بەڵکو توانای بەرخورد و قسەکردن و ڕێکەوتنی عەقڵانیانەیە. ئەمە وا دەکات هابرماز ئاکارێکی عەقڵانی بە "ڕووبەری گشتی" ببەخشێت. بەکورتی لای هابرماز "ڕووبەری گشتی" هەڵگری سێ ئاکاری سەرەکییە لە یەک کاتدا کە بریتین لە: یەکەم ئەم ڕووبەرە ڕووبەرێکی دیموکراسییانە. دووهەم، ڕووبەرێکی عەقڵانیانە و سێهەم ڕووبەرێکی ڕەخنەگرانەیە. هاوکات چەمکی "ڕووبەری گشتی" لای هابرماز چەمکێکی نۆرماتیڤییە، واتە چەمکێکی پێوانەیی پۆزەتیڤە و ناکرێت مانای نێگەتیڤی هەبێت (Habermas ۱۹۷٤: ٥٤). لەم ڕووبەرەدا هاوڵاتییان بەیەک

دەگەن و خۆیان ڕێک دەخەن و دیالۆگ دەکەن، دەرەنجامەکەشی دروستبوونی ڕای گشتییە لە کۆمەڵگادا.

## ڕووبەری گشتی و دەوڵەت

بیرۆکەی سەرەکی لە "ڕووبەری گشتی"دا بیرۆکەی جیاکردنەوەی دەزگاکانی دەوڵەتە لەو ڕووبەرە گشتییانەی هاوولاتیان خۆیان بۆ خۆیانی دروست دەکەن، چ لە فۆرمی دەزگا و شوێنی کۆبوونەوە و قسەکردن و بلاوکردنەوە و گوێگرتن و بەیەککەیشتندا، چ لە فۆرمی چەندان گوتاری جیاوازدا لەو گوتارانەی دەوڵەت بەرهەمیان دەهێنێت. بەم مانایە "ڕوبەری گشتی" هەم شوێن و دەزگایە، هەم جۆرێکی تایبەتە لە قسەکردن و بیرکردنەوە. جیاکردنەوەی دەزگاکانی دەوڵەت و گوتارەکانی لەو دەزگا و گوتارانەی هاولاتیان خۆیان دروستی دەکەن، تێزەی سەرەکیی هابرمازە لە کتێبەکەیدا و "ڕووبەری گشتیش" ئەو چەمکەیە کە هێما بۆ ئەم مەسەلەیە دەکات. تێکەڵبوونی دەوڵەت و ڕووبەری گشتی بە یەک، کۆبوونەوەیان بەیەکەوە، یان بوونیان بە یەک، ئەو سیستمە تۆتالیتاریانە دروست دەکات کە لە سەدەی بیستەمدا بینیمانن. بۆیە "ڕووبەری گشتی" یەک لە پێداویستییە سیاسی و تیورییەکانی سیستمی دیموکراسی خۆشیەتی. لای هابرماز "ڕووبەری گشتی" بێشکەی ئەو گوتارانەیە کە گوتاری دەوڵەت نین، گوتاری هاوولاتیان و کۆمەڵگان و دیدی ئەمان بۆ ژیانی گشتیی دەخاتە ڕوو. وەک ژنە فەیلەسوفی ئەمریکی، نانسی فرێزەر، دەڵێت چەمکی "ڕووبەری گشتی" لای هابرماز وەک "شانۆیەک وایە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا تیایدا لە

ڕێگای قسەکردنەوە بەشداربوونی سیاسی چالاک دەکرێتەوە. ڕووبەری گشتی ئەو ڕووبەرەیە کە تیایدا هاوولاتیان بیر لە مەسەلە هاوبەشەکانیان دەکەنەوە" (Fraser ۱۹۹۰: ۵۷). بەکورتی، "ڕووبەری گشتی" ئەو ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەیە کە تیایدا ئەو گوتار و ڕوانینانە دروست دەبن و بڵاو دەبنەوە، کە یەکەم گوتار و ڕوانینی دەوڵەت نین، دووهەم هیی هەمووانە لە کۆمەڵگادا.

**ڕەخنە لە دیدی هابرماز**

بێگومان ئەم لێکدانەوەیەی هابرماز بۆ "ڕووبەری گشتی" ڕەخنەیەکی زۆر کراوە و نیشان دراوە ئەو ڕووبەرە لە سەدەی هەژدەهەمدا بەو ڕادەیە کراوە نەبووە بە ڕووی هەموو گروپەکان و تاکەکەسەکاندا وەک هابرماز دەڵێت. چینە هەژارەکانی کۆمەڵگا و گروپە لاوازەکان و ژنان، بەشێک نەبوون لەوانەی لەو "ڕووبەرە گشتیی"ەدا ئامادە بوون. واتە ئەم گشتیبوونە بەو ڕادەیە گشتی نەبووە کە هابرماز باسی دەکات (Fraser ۱۹۹۰). هاوکات هەر لەو سەدەیەدا "ڕووبەری گشتی"ی دژ و ڕووبەری ئەلتەرناتیڤی هێز و گروپەکانی تر دروست بووە و شتێک بە مانای یەک ڕووبەری گشتی لە فۆرمە هابرمازییەکەیدا بوونی نەبووە.

بێگومان ئەم ڕەخنانە ڕەخنەی گرنگن و هاریکاریی هەموو ئەوانە دەکات کە لەم دیدە تیۆرییەوە لە گەشەکردنی کۆمەڵگاکان دەڕوانن، بەلام خاڵێک کە گرنگە باس بکرێت ئەوەیە کە گەشەکردنی "ڕووبەری گشتی" لە ئەزموونی کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا ڕووی لە دابینکردنی ئەو لانی

کەمەی یەکسانی و دادپەروەرییە کە هابرماز دەیداتە پاڵ ئەم ڕووبەرە. ئیشکردنی سیستمی دیموکراسیی و گەشەکردنی، بە مانایەک لە ماناکانی، مانای بە دیموکراسیبوونی ئەو ڕووبەرە گشتییە و گۆڕینیەتی بە شوێنی کۆبوونەوەی زیاد لە هێزێکی کۆمەڵایەتی و بۆ شوێنێک بۆ ژنان و پیاوان و کرێکاران و هتد... ئەمڕۆ بەشێکی گەورەی "ڕووبەری گشتی" لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا ئەو لانی کەمە لە یەکسانی بۆ ژمارەیەکی گەورەی کەسەکان و گروپ و چینە جیاوازەکان دەستەبەر کردوە. مێژووی گەشەکردنی ئەم ڕووبەرە گشتییە لە ئەوروپادا مێژووی گۆڕانیەتی لە "ڕووبەرێکی گشتیی بۆرژوازیی"ەوە بۆ ڕووبەرێکی گشتیی کراوە بە ڕووی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی بۆرژوازیەتدا.

## ڕووبەری گشتی لە دونیای ئەمڕۆدا

لە دونیای ئەمڕۆدا دەکرێت زیاد لە چەند "ڕووبەری گشتی" دروست ببێت، گروپە سیاسی و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان دەتوانن "ڕووبەری گشتی"ی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن و گەشە پێ بدەن (Dahlgren ٢٠٠٦: ١٥٢). ئەم ڕووبەرە گشتییانەش دەشێت ڕووبەرێکی گشتیی نانۆرماتیڤی و نێگەتیڤ بن، واتە مەرج نییە هەمیشە ڕووبەری باش و پۆزەتیڤ بن، بۆ نموونە دەکرێت ڕووبەرێکی گشتیی فاشیستی یان سەلەفی یان ناسیۆنالیستیی پەڕگیر دروست ببێت و جۆرێک لە ڕا و بۆچوون و دیدی تیادا بەرهەم بێت کە دژ بە پێکەوەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی هێمن و ئارام بێت. ئەم خاڵە نیشانی ئەدات ئەوانەی ئەمڕۆکە تیوریزەی "ڕووبەری

گشتی" دەکەن، ئەو دیدە نۆرماتیڤییەی هابرمازیان بۆ ئەم ڕووبەرە نییە کە باسمان کرد و بەردەوام وەک ڕووبەرێکی پۆزەتیڤ مامەڵەی ناکەن.

لە کتێبێکی هێجگار گرنگ و بنچینەییدا: دێنیس ماکوایل، *ڕۆڵی میدیای جەماوەریی*، ئەوەی پێی دەڵێن ماس میدیا، ڕوون دەکاتەوە و کاریگەرییەکانی لەسەر "ڕووبەری گشتی" نیشان ئەدات. لای ئەم نووسەرە "ڕووبەری گشتی" پێناسێکی گشتیتر و فراوانتری هەیە و وەک ئەو ڕووبەرە دەیناسێنێت کە دەکەوێتە نێوان بەشی خوارەوەی کۆمەڵگا و ئەو توێژە باڵادەستەوە کە کۆمەڵگا ئاراستە دەکات (McQuail 2005: 181). خوارەوەی کۆمەڵگا لە هاوڵاتیان پێک دێت، بەڵام توێژەکەی سەرەوە دەزگا حوکومییەکان و هێزە سەرەکییەکانی بازارن(McQuail 2005: 181). لای ئەم نووسەرە "ڕووبەری گشتی" بە مانایەک لە ماناکان، دەگۆڕێت بۆ "کۆمەڵگای مەدەنی" و ئەو ڕۆڵە دەبینێت کە کۆمەڵگای مەدەنی لە دیدە تۆکڤیلیەکەوە بەرامبەر بە دەوڵەت دەیگێڕێت. ئەم نووسەرە کە باس لە ڕۆڵی میدیای جەماوەری دەکات باس لە کۆمەڵێک مەرج دەکات کە دابینکردنیان گرنگە بۆ ئەوەی بتوانن وەک ڕووبەرێکی گشتی کار بکەن، ئەو مەرجانەش بریتین لە کرانەوە و شەفافیەت، ئازاد بوون، ڕێزگرتنی جیاوازیی دەنگەکان و پلورالیزمی کومەلایەتی. میدیای جەماوەریی دونیای ئەمڕۆ میدیایەکی یەکئاراستە نییە، واتە میدیای تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤارە کۆنەکان نییە کە تیایاندا پەیامەکە لەناو ئەو ئامرازە تەکنۆلۆژیانەوە بەر گوێ و چاوی گوێگران و بینەران بکەون، بەڵکو میدیایەکی دووئاراستەیە و گوێگران و بینەران دەتوانن ڕاستەوخۆ

کاردانەوەکانی خۆیان بەرامبەر بەوەی دەگوترێت و دەبینرێت، دەر ببڕن. بەمەش توانای گەوجاندن و خراپبەکارهێنان و پەیوەندیی یەکجەمسەرە لاوازتر دەبێت و ئەگەری گۆڕینەوەی ئەرگومێنتی عەقڵانییانەش گەورەتر دەبێت. لە ساڵانی نەوەدەوە و لەگەڵ هاتنی ئینتەرنێت و میدیای دیگیتاڵی و کۆمەڵایەتیدا توانای کاردانەوەی کۆمەڵگا بە ڕووی ئەوەی دەگوترێت و دەنووسرێت و دەر دەکەوێت، زیاتر و گەورەتر بووە. لەسەر پەیوەندیی نێوان ئینتەرنێت و ڕووبەری گشتی لە چەند ساڵی ڕابردوودا دەیەهە کتێب نووسراوە، ئێرە شوێنی ڕاوەستان لەسەر دیدە جیاوازەکانی ناو ئەم ئەدەبیاتە زۆرە نییە، ئەوەی گرنگە بیزانین کە چەمکی ڕووبەری گشتیی یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی قسەکردن لە زیاد لە دەرکەوتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆکە.

## ڕووبەری گشتی لە کوردستاندا

خاڵێک کە دەشێت لەسەری ڕێک بین ئەوەیە، کە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی یەکسان و دادپەروەر نییە بەو مانایەی دەزگاکان و چوارچێوە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ئەو کۆمەڵگایە مرۆڤەکان وەک تاکەکەسی یەکسان ببین و مامەڵە بکەن، بەبێ گوێدانە ئینتیمای ناوچەیی و سیاسی و خێزانی و بنەماڵەی و دوڵەمەندی و هەژاری و هتد... ئەم چوارچێوانە، ئیدی لە چوارچێوە سیاسییەکانەوە بیگرە بۆ چوارچێوە بیرۆکراسییەکان و لەوانیشەوە بۆ چوارچێوە ئایینی و ئەخلاقییەکان، مرۆڤەکان و گروپەکان دەخەنە پەیوەندیی بونیادیی نایەکسانەوە و هەرەمیەتێکی تایبەت لە مافی

قسەکردن و گوێڕایەڵیکردندا دەسەپێنن. لەپاڵ ئەمەدا ئەم کۆمەڵگایەکە چەندان پێوەری جیاوازی نایەکسانی هەیە لە ڕێگایانەوە بەهای مرۆڤەکانی پێ دەوێت و ئەمیان لەویتریان بە باشتر و بەڕێزتر و خاوەنمافتر و قورستر و گرنگتر دەزانێت، ئیدی لە پێوەرە دینییەکانەوە بیگرە بۆ پێوەرە خێزانییەکان و لەوانیشەوە بۆ پێوەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان. بەکورتییەکەی "ژیانی گشتی" لە کۆمەڵگای ئێمەدا ژیانێکی پڕ نایەکسانی و بێدادی و فەرق و جیاوازیی فرەجۆر و فرەئاستە. بۆیە ئەوەی ناوی "گشتیی"ە لە دونیای ئێمەدا "گشتی" نییە بە مانا هابرمازییەکەی، هەروەها گشتیی نییە بە مانا دیموکراسییەکەی. "ژیانی گشتی" لە کۆمەڵگای ئێمەدا ژیانێکی پارچەپارچە و دابەش و لێکدابڕاوە، بەتایبەتی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا بەشی هەرەزۆری "گشتی"بوونەکانی ئەم ژیانە وێرانکراون و دونیای تەریب و لەیەکدابڕاویی بێپەیوەندیی شوێنی "گشتی"بوونەکانی گرتۆتەوە. من لە زیاد لە نووسینێکدا باسم لە دروستبوونی "کۆمەڵگای گێتۆ" و "لەدایکبوونی پاسەوان" لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا کردوە، کە ئەرکی ئەو پاسەوانانە پاراستنی ئەو سنوورە گەورانەیە کە دونیاکان و جیهانەکان و گەڕەکەکان و گێتۆکان لەیەکتری جیا دەکەنەوە. ئەم دابەشبوونە هەمەلایەنە وای کردوە زۆر گروپ و دەستە لە کوردستاندا هەوڵی دروستکردنی "ڕووبەرێکی گشتی"ی تایبەت بە خۆیان بدەن.

میدیای جەماوەری و ئینتەرنێتیش لە هەندێک ئاستدا ئەم دابەشبوونانەی گەورەتر و قووڵتر کردۆتەوە. ئەم میدیایە زۆر جار دابەشبوونەکانی ناو واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتیی

گۆڕیوە بۆ دابەشبوونی ناو دونیای دیگیتال و لەوێدا سەرلەنوێ دروستی کردونەتەوە و گەورەتری کردوون. بەم مانایە ئەوەی ناوی "ڕووبەری گشتیی"ە، بە مانا هابرمازییەکەی، هەم لە ئاستە دیگیتاڵی و هەم لە ئاستە نادیگیتاڵییەکەیدا لە دونیای ئێمەدا لاوازە و چەندەها میکانیزمی جیاواز هەن ڕێگە لە دروستبوونی ئەم "ڕووبەرە گشتیی"ە هاوبەشە لە هەرێمدا دەگرن.

ئەوەی لێرەدا شوێنی سەرنج و تێبینیی منە و دەمەوێت قسەیان لەسەر بکەم، ئەو ڕووبەرە نوێیانە کە لەناو نەخشە و ئەرشیتێکتی نوێی شارەکانی کوردستاندا هاتونەتە کایەوە. مەبەستم لەمەش بڕێکی زۆری ئەو چاخانە و قاوەخانە و شوێنە کولتووریی و هونەرییانەیە کە لە چەند ساڵی ڕابردوودا دروست بوون و بوون بە بەشێکی بەرچاوی فەزای نوێی ناو شارەکان. ئەو شوێنانەی لە سەرەتای ئەم وتارەدا لە شارێکی وەک سلێمانیدا باسم کردن.

**ئاکارەکانی ئەو ڕووبەرە نوێیانە**

بە بۆچوونی من بەشی هەرەزۆری ئەم ڕووبەرە نوێیانەی لە هەرێمدا دروست بوون "ڕووبەری گشتی" نین، یان تەواو گشتی نین بەو مانایانەی لە سەرەوە بەم چەمکە درا. بە پێچەوانەوە زۆربەیان ڕوبەرێکی نوخبەویی داخراون و بەشێکن لە میکانیزمەکانی دروستبوونی چینێکی نوێ لە کوردستاندا، کە هەلومەجی ژیانی دونیای دوای ڕاپەڕین دروستی کردون. ئاکاری سەرەکیی ئەم چینە خۆجیاکردنەوەیە لە کۆمەڵگا و دابڕانە لەو شتە "گشتیی"انە کە بەسەریەکەوە "ژیانی

گشتی" لەم کۆمەڵگایەدا دروست دەکات. زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی لەم ڕووبەرانەدا کۆ دەبنەوە کەسانی پارەدارن و ئەو شتانەی لەو شوێنانەدا دەفرۆشرێن بە ڕادەیەک گرانن کە لەگەڵ ئاستی ئابووریی زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی ئەو کۆمەڵگایەدا نایەنەوە. بۆیە ئەوانەی دەچنە ئەو شوێنانە "خەڵک" نین بە مانا سۆسیۆلۆژییەکەی چەمکەکە، بەڵکو کەسانی سەر بە نوخبە دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند و بەتواناکەی کۆمەڵگان و ڕووبەرەکانیش وەک ڕووبەری خۆجیاکردنەوەی خۆیان لە سەرجەمی کۆمەڵگا و وەک ڕووبەری کۆبوونەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە لە خۆیان دەچن، کار دەکات. بەم مانایە ئەم ڕووبەرانە پەیوەندییەکی پتەویان بە دەسەڵات و دەسەڵاتدارانەوە هەیە. کردەی خۆجیاکردنەوەکەش لە خەڵک و لە کۆمەڵگا بە مانا گشتییەکەی ئاکارێکی سەرەکیی ئەم شوێنانەیە.

ئەم خۆجیاکردنەوەیە لە چەندەها دەرکەوتی مادی و ڕەمزیدا بەرجەستەیە، بۆ نموونە لە چۆنیەتیی ڕێکخستنی ناوەکیی شوێنەکاندا، لە دیکۆر و تابلۆ و وێنەی سەر دیوارەکاندا، لە جۆری جلوبەرگی ئەوانەدا کە دێنە ئەوێ و لە جۆری ئەو ئامێرانەدا کە لەگەڵ خۆیاندا دەیگێڕن، زۆر جار کۆمپیوتەری لاپتۆپە، لە جۆری مۆسیقا و شێوازی خۆراک و جۆری خواردنەوەکانیشدا، تەنانەت لە جۆری ئەو کەسانەدا کە لەو شوێنانەدا کار دەکەن. لە سەرجەمی ئەم شتانەدا ئەم شوێنانە تەواو تایبەتن و بێپەیوەندین لەگەڵ بەشێکی گەورەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا.

بە مانایەک لە ماناکان ئەم ڕووبەرانە ئامرازێکن لە ئامرازە تایبەتەکانی خۆدروستکردنی ئەم چینە نوێیە، وەک چینێک کە پێگەی گرنگی لەناو ئابووری و دەسەڵاتی سیاسیدا هەرێمدا هەیە. ئەم ڕووبەرە تازانە، کە تۆڕێکی تایبەتە لە یانە و چاخانە و قاوەخانە و زانکۆ و هتد... وەک ڕووبەرێکی داخراو کار دەکەن و تەنها بەڕووی ئەوانەدا کراوەیە کە لە سەرەوەی هەرەمی کۆمەڵگادا نیشتەجێن. ئەم شوێنانە زۆر جار شوێنی یەکترناسین و بەیەکگەیشتنی کەس و گروپە جیاوازەکانی ناو ئەم نوخبە و چینە تازەیەی ناو هەرێمە. ئەمانە لەم شوێنانەدا گەشە بە پەیوەندییەکانیان ئەدەن و نەوە جیاوازەکانیان، بەتایبەتی کچ و کوڕە گەنجەکانیان، بەیەکتری دەگەن.

ئەم ڕووبەرە تازانە ئامرازێکی نوێی بەشبەشکردنی کۆمەڵگان لە ڕێگای لەیەکترجیاکردنەوە و دابڕانی جمهوورەکان لەیەکتری. شتێک بە ناوی ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتییەوە لەم شوێنانەدا بوونی نییە، هەندێک جار تەنانەت زمانی قسەکردن لەو شوێنانەدا زمانی کوردی نییە و ئەوانەی دەچنە ئەو شوێنانەوە بە ئینگلزی قسە دەکەن و مرۆڤ ئەو هەستەی لا دروست دەبێت کە ئەوانە لە شوێنێکی دەرەوەی کوردستانەوە هاتوونەتە ئەوێ. ئەم ڕووبەرانە "ئێمە"یەکی تایبەت دروست دەکات کە ئێمەیەکی داخراوە، "ئێمە"یەکە کە "ئێمە"یەکی گشتی بە مانا هابرمازییەکەی نییە، ئێمەیەکی "نوخبەوی"ی بچووکە.

لەم ڕووەوە ئەم ڕووبەرانە "ڕووبەری گشتی" نین، بەڵکو "ڕووبەری تەریبن" و ئەو دونیا کۆمەڵایەتییە ئاڵۆز

و گەورەیە نابڕن کە لە دەرەوەی ئەو شوێنانەدا ئامادەیە. شوێنێکی دابڕاون لەناو جوگرافیایەکی کۆمەڵایەتیی گەورەدا. ئەمانە وەک خاڵ و هێڵ و فاریزەی دەرەوەی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییە ئامادەن کە لە هەرێمدا هەیە و دورگەیەکی دابڕاون لەناو دەریایەکی کۆمەڵایەتیدا کە نایناسن و بێپەیوەندین لەگەڵیدا. لە ڕاستیدا ئەم شوێنانە درێژەدانن بە "پرۆسەی بەگیتۆکردنی کۆمەڵگا" و "بەگیتۆکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی" لەم ڕووبەرانەدا جۆرێک لە تاکەکەس ئامادەیە، مرۆڤگەلێک دروست دەبێت، کە خۆی لە کۆمەڵگا بە گەورەتر و بەهادارتر و زاناتر و پێشکەوتووتر و عاقڵتر دەزانێت و بە چاوێکی پڕ لە نرخاندنی بچووک و کەمەوە سەیری دەرەوەی خۆی دەکات. خەڵکی ناو ئەم ڕووبەرە تازانە، زۆر جار، هەڵگری نارسیسمێکی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتین، کە تەنها خۆیان وەک سێنتەری ژیانی کۆمەڵایەتی نابینن، بەڵکو جگە لە خۆشیان شتێکی دیکە لەو کۆمەڵگایەدا نابینن، یان وەک شتی جیاواز و نەخواستراو و نەیار دەیبینن. زۆرێک لەمانە جۆرە تاکەکەسێکن لەناو کولتوورێکی نوێی نوخبەگەردا دروست بوون، کە تەنانەت زمانەکەشیان جیاوازە، وەک وتم زۆر جار زمانی ئینگلیزییە، ڕەمزەکان و گوتارەکان و چاوەڕوانییەکانیان تەواو جیاوازە لەوەی لای زۆرینەی خەڵکی ئەو کۆمەڵگایە ئامادەیە. ئەم ڕووبەرە تازانە درێژکراوەی ئەو گیتۆ کۆمەڵایەتییانەن کە دەوڵەمەندانی دونیای دوای ڕاپەڕین بۆ خۆیانیان دروست کردوە. یاخود بەشێک لە کوردانەی لە دیاسپۆراوە گەڕاونەتەوە و چوونەتە

ناوی. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە لە ڕووبەری نویێ تەواو دژ بە بیرۆکەی هاوڵاتیبوونی یەکسان و بە بوونی لانی هەرەکەمی دادپەروەریی کۆمەڵایەتییە. لەباتیی کردنەوەی ڕێگا بەرەو لەدایکبوونی کۆمەڵگای هاوڵاتیبوون، ڕێگە بۆ دابەشکردنێکی نوخبەویانەی ڕووبەرە گشتییەکانی کۆمەڵگا خۆش دەکات و بەمەش یەکێک لە میکانیزمە سەرەکییەکانی دروستبوونی ژیانی گشتی و دروستبوونی هاوڵاتیی یەکسان و خاوەن مافی یەکسان پەک دەخات.

بەڵام سەرەڕای ئەو ڕاستییانەی سەرەوە، دوو ئاکاری تری ئەم ڕووبەرانە گرنگن و لە جێبەندیی و ڕەوت "سیاق"ی کۆمەڵگای ئێمەدا مانای گرنگیان هەیە. یەکەمیان ئەوەیە ئەم ڕووبەرانە ڕووبەری نێرانە نین، تەنها شوێنی پیاوان نین، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر ئافرەتیان تێدایە کە پیادەی هەندێک لە ئازادییە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن. واتە کۆمەڵێک شوێنە لە ڕووی جێندەرییەوە تێکەڵە.

دووهەمیان ئەوەیە ئەم ڕووبەرانە ڕووبەری مەدەنیی عەلمانین، تیایاندا یاسا و بەها و نۆرمە دینییەکان کار ناکەن. ئەمە مانای ئەوە نییە کەسانێک ناچنە ناو ئەم ڕووبەرانەوە کە دین شوناسی سەرەکییان بێت، کەسانی دینی دەچن و ژمارەیەکی بەرچاو لە خانمی پەچەپۆش لەوێدان، بەڵام ئەو شوناسە دینییە شەخسییە شوناسی ئەو ڕووبەرانە نییە. لەم ڕووەوە ئەم ڕووبەرانە بەشێکن لە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا ئێمە و ئەو لۆژیکەی لەم ڕووبەرانەدا کار دەکات لۆژیکێکی نادینییە.

**دەرەنجام**

دروستبوونی ئەم ڕووبەرانە هێما بۆ جۆرێک لە تازەبوونەوەی نایەکسان و نوخبەویی داخراو دەکەن و دەمانبەنەوە ناو هەموو ئەو سەرەتایانەی تیایاندا جەنگی بەرگریکردن لە دادپەروەریی جەنگی ژمارە یەکە. کێشەکە لەوەدایە ئەم مۆدێلە لە تازەبوونەوە زۆر جار دژەکەی خۆی بەهێز و گەورەتر دەکاتەوە، لە بەرامبەر ئەم ڕووبەرە گشتییە نادینییەدا "ڕووبەری گشتیی دینی" دروست و بەهێز دەبێت. بەمەش کردەی دابەشکردن و پارچەپارچەبوونی کۆمەڵایەتیی بەهێزتر و قووڵتر دەبێت. ئەگەر ئەو تێزە ڕاست بێت کە هەموو تازەبوونەوەیەک دژە-تازەبوونەوەی خۆی بەرهەم دەهێنێت، ئەوا سەلەفیەتی دینیی ئەو دژە-تازەبوونەوەیە کە ئەم شێوازە لە پرۆژەی نوخبەوی و داخراو و دابڕاو لە گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتی دروستی دەکات. بە مانایەکی دیکە بەرامبەر بەم ڕووبەرە مەدەنییە نوخبەوییە داخراوە، ڕووبەرێکی دینیی گەشە دەکات کە لەسەر نەفییەکی دینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی سەرجەمی ئەم ڕووبەرە تازانە کار دەکات.

بێبەشبوون لەو ڕووبەرە گشتییە نوێیانە کە ژمارەیەکی بەرچاوی ئافرەتی چینەکانی سەرەوەی تێدایە و بە شێوەیەک لە شێوەکان کەشوهەوای چاخانە و قاوەخانەکانی ئەورووپای تێدایە، دەشێت ببێتە سەرچاوەی کێشەی گەورە، بەتایبەتی بەهێزبوونی زیاتری ئوسوڵیەت و سەلەفیەت و لە کۆتاییشدا ڕەنگە تیرۆر.

# سەرچاوەکان

Dahlgren, P. (2006). 'The internet public spheres, and political communication: dispertion and Deliberation'. In: political communication.

Fraser, Nancy (1990).Rethinking the Public Sphere: A Contribution to the Critique of Actually Existing Democracy. Social Text No. 25/26, pp. 56-80

Habermas, j., Lennox, S& Lennox, F. (1974). 'The public sphere: An Encyclopedia Article (1964)' in: New German Critique.

McQuail, Denis (2005). McQuail's Mass Communication Theory. SAGE Publications.

# بەشی چوارهەم

## موناجاتی عیرفانی

## سەبارەت بە ڕۆحانیەتی بۆ ڕۆحانیەت لە دونیای ئێمەدا

# موناجاتی عیرفانی

**سەرەتا**

ئەمڕۆکە لە کوردستاندا شەپۆلێک لە موناجاتی عیرفانیی و شێوازێک لە سوفیزم و ڕۆحانیەتی ڕووکەش ئامادەیە، هەرکەسێک تاقەتی بینین و بیستنی هەبێت، دەتوانێت ببینێت و ببیستێت. ئەم شەپۆلە باس لە گرنگیی ڕۆحانیەت و لە گرنگیی دۆزینەوەی دیوە "نادیار" و "نەبینراو"ەکانی مرۆڤ و باس لە گرنگیی پاکژکردنەوەی بینین و گەشەدان بە توانای بەرهەمهێنانی "مەعریفەیەکی تر" و "کامڵتر"ی مرۆڤ و ژیان و بوون دەکات. بە شێوەیەکی گشتییش ئەم شەپۆلە لە ڕۆحانیەت لە ئاستی نووسینی هەندێک وتاری سادە و دووبارەکردنەوەی کۆمەڵێک کلێشەی ناو کەلەپوورێکی تایبەتی نووسین و گشتگیری گەورە و بەتاڵ و گەڕانەوە بۆ کۆمەڵێک دێڕ و تێکستی هەندێک لە شاعیرانی کلاسیک و گوێگرتن لە جۆرێکی تایبەت لە مۆسیقادا، ئامادەیە. بەدەگمەنیش نەبێت هیچ دەرکەوتێکی ئەم شەپۆلە عیرفانییە بەرز نەبۆتەوە بۆ ئاستی ئەوەی ببێت بە "شێوازێکی نووسینی" ڕاستەقینە و مانادارا و بۆ "شێوازێکی جیاواز" لە ژیان و دابڕاو لە شێوازی باڵادەستی ژیان لە کوردستاندا، کە مۆدێلێکی بەرخۆریی

بەربڵاو چوارچێوە سەرەکییەکانی دەستنیشان دەکات. یاخود بەرز ببێتەوە بۆ کۆمەڵێک هەڵسوکەوت و پراکتیکی ئینسانیی تایبەت و شێوازێک لە بوون و ئامادەگی لە جیهاندا، کە هێما بێت بۆ ئامادەگیی ڕاستەقینەی جیهانبینییەک کە نیازی دەسکاریکردنێکی ناوەکیی مرۆڤ و دەسکاریکردنی مۆدێلە باڵادەستەکانی ژیان و شێوازە سەروەرەکانی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی هەیە.

ئەم وتارە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ تێگەیشتن لەم دیاردە تازەیە و لەو پاشخانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییانەی لەمرۆکەی کوردستاندا بەرهەمیان هێناوە. هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە جۆرێک لە ئیدیعاکردنی ڕۆحانیەت، بەڵام تەواو بەتاڵ لە هەموو ڕۆحانیەتێکی ڕاستەقینە.

### سێ تێزی سەرەکیی

ئەم وتارە سێ تێزی سەرەکی سەبارەت بەم فۆرمە بەتاڵەی ڕۆحانیەت پێشنیار دەکات، کە بێگومان سەلماندنی تەواوی هەریەکێکیان پێویستی بە لێکۆڵینەوە و پشکنینی زیاتر هەیە. تێزەکانیش ئەمانەن:

یەکەم: ئەم موناجاتە عیرفانییە تازەیە لە زۆر سەرەوە درێژکراوەی ئەو دۆخی ناڕازیبوونە کۆمەڵایەتییە هەمەلایەنەیە کە لای زیاد لە بکەرێک و لەناو زیاد لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی دونیای ئێمەدا ئامادەیە. ئەم موناجاتە ئەوەندەی لە بێزاری لەو دونیایەوە سەرچاوەی گرتوە کە دروست بووە، بە بێزاربوون لە بەسیاسییکردنی دین خۆشیەوە، ئەوەندەش هێما بۆ شکستی توانای بەرگریکردن

و بەرەنگاربوونەوە دەکات، ئەوەندەی لە بێئمۆیدبوونەوە لە ئەنجامدانی گۆڕانکارییەوە سەرچاوەی گرتوە، ئەوەندەی لەناو کولتووری بەرخۆریدا نیشتەجێیە و خۆشی دەرکەوتێکە لە دەرکەوتەکانی ئەو کولتوورە، ئەوەندەش "منێکی نارسیستی بەرخۆر" هەڵگریەتی، کە خۆی بە سێنتەری هەموو شتەکانی ناو دونیا دەزانێت، ئەوەندە لە گەشەکردنێکی ڕۆحیی ناوەکی و لە دروستبوونی مرۆڤێکی تازەی پڕ گومان و لە دڵەڕاوکێکەری دینی یان نادینییەوە دروست نەبووە کە لە دۆخی گەڕانێکی ناوەکییدا بێت بەدوای کۆمەڵێک مانا و هەقیقەت و یەقین و پەیوەندیدا، کە دونیای دەرەکیی ناو ئەو کۆمەڵگایە نەتوانێت بۆی دەستەبەر بکات. بەکورتییەکەی ئەم موناجاتە عیرفانییە قەلەقی و دڵەڕاوکێیەکی ناوەکی نایجووڵێنێت، بەڵکو ئەو شتانە ئەیجووڵێنێت کە هێمامان پێ کرد. یەکێک لە مانا هەرە سەرەکییەکانی ڕۆحانیەت ئەوەیە کە مرۆڤ وەک "بوونەرێکی جیهانبینی دروستکەر" وێنا دەکات، نەک تەنها وەک مرۆڤێکی ئامرازدروستکەر. ئەو شێوازە لە عیرفانیەت کە لە دونیای ئێمەدا هەیە نە "مرۆڤێکی ئامرازدروستکەر" و نە "مرۆڤێکی جیهانبینی دروستکەر"ی لەپشت نییە، بەڵکو مرۆڤێکی تەواو بەرخۆریی لەپشتە. لەخەمی دروستکردنی دونیایەکی نوێدا نییە، بەڵکو لە خەمی خواردن و کرۆشتنی دونیایەکی دروستکراودایە.

تێزی دووهەمی ئەم نووسینە، پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییە کە ئەم موناجاتە عیرفانییە تازەیە هەوڵدانی ئەو خودە بەرخۆرە نارسیستییەیە بۆ تەلاقدانی مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ناو "ژیانی هاوبەش" و کێشە گشتییەکانی

کۆمەڵگا، کە لانی کەم داوای جۆرێک لە ئیلتیزامی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کەسەکان وەک هاوولاتییەک دەکەن. ئەگەر یەکێک لە مانا سەرەکییەکانی ڕۆحانیەت ئەوە بێت مرۆڤ "ژیانێکی کامڵ" و "ژیانێکی پڕ" بژی، ئەوا ئەم جۆرە لە موناجاتی عیرفانی لە دونیای ئێمەدا جگە لە لایلایەکردنی تاکەکەسێکی بەرخۆری ماندوو و دابڕاو بۆ خۆی، تاکەکەسێکی بێئینتیما کە تاقەتی "پشکنینی ژیانی" خۆشی نەماوە، بەڵام هاوکات بوونەوەرێکی نارسیستیی فووتێکراوە کە پێی وایە مۆدێلی پێرفێکت و کامڵی مرۆڤبوونە، شتێکی دیکە نییە. ئەم موناجاتە عیرفانییە ڕۆحانیەتێکی بەتاڵە دابڕاو لە هەستکردن بە کۆمەڵێک بەهای ئینسانیی گەورە کە مرۆڤ دەکەنە بوونەوەرێکی بەرپرسیاریی ناو ژیانی گشتی و دەیبەستنەوە بە مەسەلە سەرەکییەکانی مرۆڤ لەو کۆمەڵگایەدا کە تیایدا ئامادەن. ئەگەر ڕۆحانیەت "سەفەرێکی تاکەکەسییانە"ش بێت، دواجار ئەو سەفەرە سەفەرێک نییە لە بۆشاییدا، بەڵکو سەفەرە بەناو کۆمەڵگا و کێشە و گرفت و تەحەداکانیدا و دروستکردنی پەیوەندییەکی تەندروستە لەگەڵ ئەو شتانەدا کە بەشێکی دانەبڕاوی هەموو ڕۆحانیەتێکە نەگۆڕێت بۆ جۆرێک لە نارسیزمی فووتێکراو و نوقم نەبێت لەناو ئەو فەزا بەرخۆرەدا کە بەرهەمی هێناوە.

تێزی سێهەمی ئەم نووسینە ئەوەیە کە ڕۆحانیەت، هەموو ڕۆحانیەتێک، کوڕی کۆمەڵگا و سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراوە، شتێک نییە موجەرد و دەرەمێژوو بێت. بۆیە هەموو ڕۆحانیەتێک، وەک زۆر دیاردەی ئینسانیی تر، ئاکارێکی حەربایی هەیە و ڕەنگوڕووی ئەو ژینگە و ساتەوەختە

مێژووییە وەر دەگرێت کە لەناویاندا دروست دەبێت. ئەم شەپۆلەش لە موناجاتی عیرفانی لەمرۆکەی کوردستاندا ڕەنگی ئەو ژینگە بەرخۆر و نابەرپرسیارەی وەر گرتوە کە بەشێکی دانەبڕاوی ئاکاری زۆرێک لە نوخبە سەرەکییەکانی کوردستانە، لە نوخبەی سیاسییەوە بیگرە بۆ نوخبەی ڕۆشنبیری، بە تێپەڕین بەناو نوخبەی بازرگانی و میدیایی و پزیشکی و هتد... ئەوەی ئەم شەپۆلە لە عیرفانیەت پێشێلی دەکات ئەو بەهایانەیە کە هەم ڕۆحانیەت دەباتەوە ناو کۆمەڵگا و کێشە سەرەکی و بنەڕەتییەکانیەوە، هەم مرۆڤەکان خۆشیان دەگۆڕێت بۆ مرۆڤی "پڕ" و "کامڵ" و "فرەمەودا"ی بەرپرسیار بەرامبەر بە خۆیان و بەرامبەر بەو دونیایەی تیایدا دەژین. بەم مانایە ئەم شەپۆلە لە موناجاتی عیرفانییانە دەربڕی هەڵاتنێکی ڕاستەوخۆیە بۆ ناو فەزایەکی نارسیستی، کە لە دونیای ئێمەدا بەرخۆریی ژێرخانە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و فەرهەنگییەکەی ڕەنگڕێژ کردوە و ئەوەشی دەیهێنێتەوە ناو "فەزای گشتی" گەڕانی بەردەوامی ئەم خودە نارسیستییەیە بەدوای هەموو ئەو شتانەدا کە وێنەکانی ئەو نارسیزمە لەسەر خۆی دەسەلەمێنێت و ئاوێنەیەکی بۆ دروست دەکات کە جگە لە خۆی کەسی تری تێدا نەبینێت. ئەم ڕۆحانیەتە تازەیە دەرهاویشتەی ئەو سایکۆلۆژیا و دۆخە دەروونییەیە کە بەرخۆری لە کوردستاندا وەک دۆخی باڵادەست دروستی کردوە، ئەوەندی گەڕانە بەدوای "چێژێکی تر"دا، ئیتر گرنگ نییە ئەو چێژە چ ناوێکی لێ دەنێیت، ناوی "چێژی پەرستن و عیبادەت"ی خودا، یان "چێژی پەیوەندی لەگەڵ نادیار و بان-زەمینی و دەرە-مێژوو"دا، ئەوەندە ئەزموونێکی ڕۆحیی ناوەکی نییە، کە لە پەیوەندییەکی ڕەخنەیی و نەفیکەردا بێت لەگەڵ ئەو

دونیایەدا کە بەرخۆریی ڕەنگڕێژیی کردوە و چەندەها قەیرانی ئەخلاقی و دەرونی و کۆمەلایەتی و سیاسیی تێدا دروست کردوە. ئەم موناجاتە عیرفانییە ئەوەندەی موناجاتی گەڕان و بەدەستهێنانی چێژە بە مانا بەرخۆرییەکەی، هێندە بەدەستهێنانی چێژێکی عیرفانییە کە لە پەیوەندییەکی نەفیکەردا بێت لەگەڵ کولتوور و پراکتیکی بەرخۆرییدا.

### موناجاتێکی بێجووڵە

ئەوانەی شارەزای ئیسلامی سیاسین، دەزانن تەنانەت مەهدی لە سودان و حەسەن بەننا لە میسر و ئایەتوڵا خومەینی لە ئێران، هەموویان پاشخانێکی سوفی و عیرفانییان هەبوو، بەلام ئەمانە ئەم پاشخانە بەتوندی بە چالاکیی سیاسی و کۆششکردنی بەردەوامەوە بۆ گۆڕین و دەسکاریکردنی دونیاوە گرێ ئەدەنەوە. عیرفان و دینداری لای ئەمان ڕێگایەک بوو بۆ چوونەوە ناو دونیا و دەسکاریکردن و گۆڕان و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی. لە دەرەوەی دیدگایەکی سیاسیدا نەبوو، بەڵکە بەشێک بوو لە دیدگایەکی سیاسی کە خوازیاری دروستکردنی دونیایەکی تر بوو، هاوکات ئەم دیدگایە زۆر بەتوندی بە پراکتیک و هەڵسوکەوتی کۆمەلایەتیی نوێوە گرێدراو بوو. بەلام یەکێک لە ئاکارە هەرە سەرەکییەکانی ئەم شەپۆلە لە موناجاتی عیرفانیی نوێ لە کوردستاندا "خۆپاککردنەوە"یەتی لەو ڕەهەندە سیاسییە و لەو دەرگیربوونە ڕۆژانەییە لەگەڵ دونیادا بە مەبەستی گۆڕین و دەسکاریکردنی. کوشتنی هەموو ڕەهەندێکی کردەییە لەو موناجاتەدا و نمایشکردنیەتی وەک

جوولەیەکی ناوەکیی دابڕاو لە دونیا. بێگومان کێشەکە لێرەدا لە خۆخەریکردنی مرۆڤ بە خودی خۆیەوە نییە، ئەوە نییە مرۆڤ سەرقاڵی "مشوورخواردنی خودی خۆی بێت"، وەک میشێل فۆکۆ دەڵێت، یان مرۆڤ سەرقاڵی داهێنانی کەسایەتیی خۆی نەبێت بەپێی نۆرم و بەها و خواست و خەونی تایبەتی خۆی، کێشەکە لەوەدایە ئەم عیرفانیەتە تازەیە شێوازە هەرە نارسیستی و هەرە بەرخۆرەکەی "خۆ بە خود سەرقاڵکردنەوە"ە دەخاتە شوێنی هەموو سەرقاڵییەک بە دونیا و بە ئەوانی تر و بە کۆمەڵگاوە (Foucault ١٩٩٧). ئەمەش ئەو خاڵەیە کە ئەم جۆرە لە ڕۆحانیەت بەتوندی بەو سیستمی بەرخۆرییەوە دەبەستێتەوە کە لە کوردستاندا سەروەرە و لە کارکردنی خۆشیدا چەندەها تاکەکەس و مرۆڤی بێپەیوەندی و بێدەربەستی دروست کردوە و دروست دەکات، کە نارسیزمێکی ناتەندروست شوناسە هەرە سەرەکییەکەیەتی.

**کام بکەری کۆمەڵایەتی؟**

بکەرەکانی ئەم موناجات و عیرفانیەتە تازەیە فرەجۆر و جیاوازن، لە کەسانی دینییەوە بیگرە کە ناڕازین بە شێوازە باڵادەستەکانی دینداریی لە وڵاتەکەدا، بەتایبەتی دوای هاتنی داعش و دوای هەرچی زیاتری بەسیاسیبوون و بەسەلەفیبوونی دین، تا بەوانە دەگات کە ڕەخنەیەکی عیرفانییانە لە مۆدێرنە بەگشتی و لە دونیای هاوچەرخ بەتایبەتی دەگرن. بەشێکی تری ئەم موناجاتە عیرفانییە لە قەڵەم و قسەوباسی ئەو خوێندەوارە دینییانەوە دێت کە هەم پلەوپایەی دینی و

کۆمەڵایەتیی گەورەیان هەیە و هەم نوقمن لەناو دەرکەوتە جیاوازەکانی دونیای بەرخۆریدا، ئیتر لە فرەژنییە و بیگرە بۆ فرەمنداڵی و لەوانیشەوە بۆ فرەقسەکردن و فرەبەرژەوەندی و هتد.... ئەمە جگە لە کەسانێکی نادینییش کە بێزاری لەو دونیایەی تیایدا دەژین بەرەو جۆرێک لە عیرفانیەتی بردوون گونجاو لەگەڵ پێگە و دۆخی کۆمەڵایەتییاندا و لەگەڵ پاراستنی ئەو ئاستە لەبەرخۆریی کە بەدەستیان هێناوە. زۆربەی ئەمانە کەسانی سەر بە چینی ناوەراستی کۆمەڵگای ئێمەن کە لە دونیای دوای راپەریندا دروست بوون، خاوەنی ئاستێکی ژیانی مەعقوولن و توانایەکی تایبەتیی بەرخۆربوونیان هەیە. بەڵام هەموویان ئەو هەستەشیان لا بەهێزە کە ئەوان نەک بەرپرس نین لە دروستبوونی ئەو دونیایەی لە دوای راپەرینەوە دروست کراوە، بەڵکو خۆیان وەک رەخنەگری ئەو دونیایە و وەک قوربانییشی وێنا دەکەن. ئەم گروپەی دواییان، مەبەستم لە عیرفانییە نادینییەکانە، بەدوای ئەو شتەدا دەگەرێن کە لە کۆمەڵناسیی دیندا پێی دەڵێن "رۆحانیەت، بەڵام بەبێ دین"، یان "رۆحانیەتی نادینی" spiritual but not religious. ئەمانە زۆربەیان کەسانێکن لە قۆناغێکدا لە رووی سیاسییەوە چالاک بوون و ئەندامی ئەم یان ئەو رێکخراو و کۆر و کۆمەڵەی سیاسی و دینیی بوون، هەندێکیان تا ئەمرۆش ئەندامن و پێگەی بیرۆکراتییان لەناو حیزب و دەزگاکانیدا هەیە، بەڵام نائومێدبوونیان لەم ئەزموونە و خۆدۆزینەوەیان لەناو دونیایەکی پر لە بەرخۆریی تەریب بە دروستبوونی جۆرێک لە تاکگەراییی داخراودا، بەرەو ئەو شەپۆلە لە عیرفانیەتی تازەی بردوون.

هەموو ئەمانە لەناو ئەو دونیایەدا باس لە گەڕان بەدوای "سەرچاوەی سەرچاوەکان" و بەدوای "یەقینی ناوەکی" و دۆزینەوەی "ئارامیی دڵ و دەروون" دەکەن، باس لە پەیوەندی بە "خودێکی بانگەردونی" و "ڕەها"وە دەکەن، قسە لە "ژیانی کامڵ" و "مرۆڤی کامڵ" و "بوونی کامڵ" دەکەن، باسی "مەعریفەی قووڵ" و "نادیارەکانی ناو مرۆڤ" دەکەن، بەڵام بێ ئەوەی ئەم شتانە ببێتە هۆی دەسکاریکردنی شێواز و ستایەڵی ژیان و بەبێ لانی هەرەکەمی پاشەکشەکردن لەو دونیایەی کە بەرخۆری بەشێکی زۆری یاسا ئەخلاقی و دەرونییەکانی دادەڕێژێت و بێ ئەوەی فۆرمێکی نوێش لە جیهانبینییەک نیشان بدات کە کەسەکان خۆیان پراکتیککەری بنەما سەرەکی و بنەڕەتییەکانی بن. ئەم عیرفانیەتە لێوانلێوە لە بەرخۆری و بەردەوامیش ئەو جۆرە لە کەسایەتیی نارسیستی دروست دەکات کە لە یەکەمین نیگادا وەک کەسێکی هێمن و کراوە و میهرەبان دەر دەکەوێت، بەڵام لەناوەوە دڵسارد و بێهەست و بێبەزەیی، پڕ لە ویستی کۆنترۆڵکردن و بەکارهێنان و ئاراستەکردنی ئەوانی تر. ئەم نارسیستە بە شێوەیەکی ئاشکرا نمایشی دەرد و بێزاری و بیمارییەکانی خۆی دەکات، بەڵام ناتوانێت دەرد و بێزاری و بیماریی کەسانی دیکە ببینێت. وەستایە لەوەدا خۆی وەک قوربانی پێشکەش بکات، بەڵام توانای بینینی هیچ قوربانییەکی تری نییە. ئەم جۆرە کەسایەتییە خۆبەڕۆحانیزان و بەرخۆرە لەپاڵ ڕۆحی خۆبەگەورەزانین و تەکەبورێکی شاراوەدا توانای نیشاندانی بێڕێزییەکی گەورەشی هەیە و سڵ لەوە ناکاتەوە خەڵکانێکی زۆر وەک بوونەوەری گەمژە و بێنرخ و گرگن ببینێت و مامەڵە بکات. هەموو ئەمانە لە کاتێکدا پێویستییەکی دەرونیی

بەردەوامیشی بەوەیە ئەوەی ئەو بە حەشاماتی دەزانێت و وەک گەمژە دەیانناسێنێت، باسی بکەن و ئیعجابی خۆیانی بۆ دەر بڕن. بێگومان لەو شوێنانەشدا کە پێویست بکات و بۆ ئەو باش بێت خۆی وەکو کەسایەتییەکی شارستانی و میهرەبان نمایش دەکات، بەڵام لەکوێدا بۆی نەشیا و شتەکان لە قازانجی خودە نارسیستییەکەیدا نەبوون، دەتوانێت ببێتە بوونەوەرێکی بێویژدان و بێئەدەبترین ئاکار و ناشیرینترین زمان نیشان بدات. ئەم جۆرە نارسیستانە جۆرە کەسایەتییەکن بەردەوام تووڕەن، تووڕە لە کەسێک و لە شتێک، دونیای دەرەوەی خۆیان وەک هەڕەشەیەکی گەورە ئەزموون دەکەن، پەیوەندییان بە دونیاوە پەیوەندیی ململانێ و کێبەرکێیەکی بێبڕانەوەیە کە ئەو تیایدا هەم هەست بەوە دەکات کە قوربانییە، هەم بەوەی کە دەگمەن و بێوێنە و کاملە. بەردەوامیش ڕووی لە دوژمنێکە کە دڵڕەق و بێبەزەیی بێت بەرامبەری. ئەم عیرفانیەتە تێکەڵ بە بەرخۆرییە، لە ساڵانی ڕابردوودا زۆرێک لە مۆدێلی ئەم کەسایەتییانەی لە دونیای ئێمەدا دروست کردوە.

وەک پێشتر هێمام پێ کرد ئەم شێوازە لە عیرفانیەت، ئەوەندەی گەڕانە بەدوای "چێژی تر"دا، لەپاڵ ئەو چێژانەدا کە بەرخۆری دەیانبەخشێت، بە چێژی ئازاردانی ئەوانی تریشەوە، ئەوەندە ئەزموونێکی ڕۆحیی نییە کە تیایدا مرۆڤ بگۆڕێت بۆ بوونەرەوەرێکی ناسک و میهرەبان و خەمخۆر، مشوور لە خۆی و لە ئەوانی تر و لە کۆمەڵگا و لە دونیا بخوات.

**شێوازەکانی ئەم عیرفانیەتە تازەیە**

ئەمڕۆ ئەم ڕۆحانیەتە لە زیاد لە شێوەیەکدا دەر دەکەوێت و لە زیاد لە فۆرمێکدا بەرجەستەیە. بۆ نموونە گەڕانەوەیەکی بەرچاو هەیە بۆ سوفیزم لە شیعری کلاسیکیدا و وەک ئەزموونێکی ڕۆحانیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، لە گەڕانەوەوە بۆ جەلالەدینی ڕومیەوە بیگرە بۆ باوەشکردن بە شیرازی و سوهرەوەردی و حافیزدا و لەوانیشەوە گەڕانەوەیەکی بەرچاو، زۆر جار گەڕانەوەیەکی بێقووڵایی و ڕیتۆریکی، بۆ مەحوی و نالی و مەولەوی لە ئەدەبیاتی کوردیدا. لە زۆربەی هەرەزۆری ئەم دۆخی گەڕانەوەیەدا تا ئێستا تێکستێک نەنووسراوە توانیبێتی تیشکێکی نوێ بخاتە سەر قووڵاییی ئەو ئەزموونانە، یان خۆی بەرز ببێتەوە بۆ ئاستی ئەزموونێک لەو ئەزموومانە. لەم نووسەرە کلاسیکییانەش تێپەڕێت، ئەمڕۆکە گەڕانەوەیەکی هەمەلایەن بۆ ئەزموونە شیعریەکەی سوهرابی سپهەری لەئارادایە، ئەزموونێک لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆکەی ئێمەدا وەک ڕۆحانیەتێکی کەموێنە مامەڵە دەکرێت و لەشکرێکی گەورە لە سێبەر و لاسییکەرەوەی لەناو ئەو ئەدەبیاتەدا دروست کردوە. ڕۆڵی سوهراب، لە ڕێگای دروستکردنی ئەو هەموو کۆپییەوە لەلای ئێمە، ڕۆڵێکی نێگەتیڤە و ڕاستەوخۆ بەشدارە لە هەژارخستنێکی بەرچاوی شیعری کوردیی ئەمڕۆدا. ڕەنگە کێشەی ژمارە یەکی ئەم لاساییکردنەوەیە لەوەدا بێت ئەوانەی لاسایی دەکەنەوە تەنها لە ئاستی لاساییکردنەوەی زمان و وێنە شیعرییەکانیدا دەمێننەوە و ئەم زمان و وێنانەش لای ئێمە بۆ ناو دونیایەک ڕادەکێشرێن کە بەرخۆری سنوورەکانی دەستنیشان کردوە و ڕۆحانییەکان خۆشیان بەشێکی دانەبڕاوی ئەو دونیا

بەرخۆرەن. بە کورتییەکەی سوهراب بووە بە "چێژ"ێک لەپاڵ چێژەکانی تری ئابووری و لیبیدۆ و ئیستاتیکای بەرخۆریدا. ئەم باسە پێویستی بە لەسەروەستانی زیاتر هەیە کە بەداخەوە لێرەدا شوێنی ئەوە نییە.

ئـەم عیرفانیەتـە تازەیـە هـەر تەنهـا لـە ئاسـتی گەڕانـەوەدا بـۆ شـیعر بەرجەسـتە نییـە، بەڵکـو کۆڵەکەیەکـی سـەرەکییشـی لەنـاو جۆرێکـی تایبـەت لـە مۆسـیقادایە. خاڵـی هـەرە بنەڕەتـی لێرەدا مۆسـیقای ئێرانییـە، بەتایبەتـی ئـەو مۆسـیقا کلاسـیکییە نیمچەدینییـەی کـە ئەمـڕۆ چەندەهـا گروپـی تـازە لـە فۆرمـی تـازەدا پێشکەشـی دەکـەن و تێکسـتەکانی جەلالەدینـی ڕومـی و خەیـام و حافـز تێکسـتە سـەرەکییەکانین. دەسـتەواژە سـەرەکییەکانی نـاو ئـەم عیرفانیەتـە تازەیـە هەمـان دەسـتەواژە کۆنەکانـی وەک سـەما و شـەراب و مەیخانەیـە، کـە خۆیـان وەک جۆرێـک لـە هۆشـیاری ناهۆشـیار، یـان هۆشـیاری وجودی، یـان هۆشـیاری ئەودیوی حـەرام و حـەڵاڵ، نماییش دەکەن و بەدوای "یاری"کدا سـەرگەرمن کـە مەحاڵـە و ناگیرێـت. هەمـوو ئەمانـە لەنـاو کۆمەڵگا و ئابـووری و ئیتسـتیکای بەرخۆریـدا ماناکانیـان دەگۆڕێـت و دەبـن بـە بەشـێک لـە دونیـا ڕەمزییەکـەی ئـەو دونیـا بەرخـۆرە، بەتایبەتـی دوای سـڕینەوەی ڕەهەنـدە کردەیـی و سیاسـی و چالاکەکـەی ئـەو گوتـارە عیرفانییـە. تۆڕەکانـی یوتـوب و سـایتەکانی سـەر ئینتەرنێـت پـڕن لـەم شـێوازە لـە مۆسـیقا و گۆرانی و سـەما، کە زۆرینەی هەرەزۆریان فارسـین و بڕێکیشـیان ژێرنووسـی کوردییـان بـۆ دانـراوە.

هاوکات بڵاوبوونەوەی یۆگا وەک وەرزشێکی ڕۆحی و دروستکردنی سێنتەر و ناوەندی تایبەت بە یۆگا و نووسین

لەسەر بنەما دەرونی و دینی و مەعریفییەکانی یۆگا بەشێکی تری ئەم عیرفانیەتە تازەیەیە. ئەمانە گەشە بە پیشەسازیی گەڕان بەدوای نەزانراو و نەبینراو و نادیاردا دەدەن و پێ لەسەر "چێژی" دۆزینەوەی ئەو ونبوو و نەبینراو و نەزانراوانە دادەگرن، کە مرۆڤ لە ژیانی ئاساییدا و لە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتییدا لێی ون دەبێت و پێیان ناگات. هاوکات بازاڕێک بۆ ڕۆحانیەتێکی سروشتئامێز دروست بووە کە باس لە گرنگیی خواردنی هەندێک جۆری تایبەت لە گژوگیا و خواردنەوەی هەندێک جۆری چا و دەرمان و شلەمەنی دەکات وەک بەشێک لە ئەزموونێکی ڕۆحیی تایبەت. هاوکات سەردان لە هەندێک ناوچەی تایبەت و "گەڕانەوە بۆ سروشت" وەک توریستێک، بە دەرمانی سارێژکردنی ژمارەیەکی زۆر لە برینە دەروونییەکانی مرۆڤی ناو ئەو کۆمەڵگایە دەزانێت و بەمەش فۆرمێکی نوێ لە دابڕان لە کۆمەڵگا و لە پێکەوەبوونی دەستەجەمعی پێشنیار دەکات. ئەمە جگە لە بەشداریکردن و کۆبوونەوە لە هەڵقەی زیکر و سەما و مۆسیقای سوفیدا و برەودان بە بازاڕێکی تایبەت بۆ کتێب و چاپەمەنی عیرفانی.

هەموو ئەمانە دەچنە ناو ئەم پیشەسازییە تازەیەی چێژوەرگرتنەوە، کە لە دونیای ئێمەدا لە فۆرمی ڕۆحانیەتدا خۆی دەر دەخات و باس لە پەیوەندیی ناوەکیی مرۆڤ بە خۆی و بە نەزانراو و نەدیتراو و نادیارەوە دەکات. لە ڕووی جێندەرییشەوە زۆربەی ئەوانەی لە کوردستاند بەدوای ئەم شێوازە نوێیەی ڕۆحانیەتەوەن پیاون و لە کۆتاییەکانی دەیەی سێهەم و چوارەمی تەمەنیاندان، دیاردەکە لە بنەڕەتەوە دیاردەیەکی پیاوانەیە و هەڵگری هەموو ڕەهەندە

تەقلیدییەکانی پیاوسالاری و سیاسەتی نایەکسانیی جێندەرییە لە کوردستاندا.

**رۆحانیەتی ناو سەیارە گرانبەهاکان**

ئەگەرچی لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەسەر هەڵگرانی ئەم موناجاتە تازەیە لەبەردەستدا نییە، بەڵام هەموو ئەوانەی کە من بینیومن و قسەم لەگەڵ کردوون، یان ئەوانەی دووربەدوور دەیانناسم و ئەوانەشی لە "ڕووبەری گشتی"دا دەر دەکەون و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەم "شەپۆلە ڕۆحانییەوە" ئاڵاون، یان ئەوانەی من هەندێک لە نووسینەکانیانم خوێندۆتەوە، کەسانێک نین سادە بژین. زۆربەیان سەر بە چینی ناوەڕاستن، بەتایبەتی توێژی سەرەوە یان توێژی ناوەندی ئەم چینەن. شێوازی بەرخۆرییان سەر بە مۆدێلی بەرخۆریی چینی ناوەڕاستە و ژیانیان هاوتای ژیانی کەسە خۆشگوزەرانەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەن. ئەمانە زۆرکێیان ئوتومبێلیان هەیە، باخیان لە دەرەوەی شاردا هەیە، لە مۆڵەکاندا بازاڕ دەکەن، دەچنە چێشتخانە و قاوەخانە گرانەکانەوە بۆ نانخواردن و کاتبەسەربردن، جلوبەرگیان جلوبەرگی مارکەدارە و زۆریش ئاگاداری ڕوخسار و دەرکەوتنی جەستەی خۆیانن لەناو ڕووبەری گشتییدا. بەدەگمەنیش نەبێت کەسێکیان نییە ١٥ تا ٢٠ کیلۆ گۆشتی زیاد بە لەشیەوە نەبێت. بەکورتی ئەمانە ئەو مۆدێلەن لە ڕۆحانیەت کە هیچ شتێک نایانباتەوە سەر مۆدێلی غاندی و دایکە تێرێزا و ئەو عابید و سوفییانەی تر کە ژیانێکی تەواو سادە و بێمەسرەف و پرئیشکردن و ڕەنجکێشان ژیاون.

بەکورتی ئەم ڕۆحانیەتە ڕۆحانیەتێکە لەناو باخ و سەیارە و سەفەر و خواردنەوە و سەیران و ماسی و گۆشتخواردنێکی گەورەدا ڕوو دەدات. بەکورتی، بەرخۆری ئەم ڕۆحانیەتەی خستۆتە ناو چوارچێوە ئاڵۆزەکانی خۆیەوە و دایبڕیوە لەو کەلەپوورە درێژەی ڕۆحانیەت کە لەسەر سادەژیان و کەممەسرەفی و نەبوونی و نەدارییپەرستی کاری کردوە و کار دەکات، ڕۆحانیەتی ئەو عابیدانەی ڕۆژانە لەسەر سێوێک یان چەند دەنکە خورمایەک ژیاون و دەژین. وەک چۆن بەشێکی زۆری دنیداری لە کوردستاندا بووە بە دینداریەکی ڕووکەش و ئاکارێکی نمایشکەرانە و شانۆسازانەی وەر گرتوە، بەشێکی زۆری ئەم شێوازەش لە ڕۆحانیەت هەمان ئاکاری هەیە و هەمان میکانیزمی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ئاراستەی دەکات.

## ڕۆحانیەتی نیولیبرال

ئەو مۆدێلە باڵادەستەی ڕۆحانیەت کە لە کوردستاندا ئامادەیە، خودێک هەڵی گرتوە، لە ئەدەبیاتی زانستیدا ناوی "خودێکی نیولیبراڵی ڕۆحانی"ی لێ نراوە(Williams ٢٠١١: ٦١٦). ئەم شێوازە لە ڕۆحانیەتی نیولیبرال تەنها بەشدار نییە لە هەموو گەمەکانی مەسرەفگەراییدا بەو شێوە بەرفراوانەی لە کۆمەڵگادا هەیە و ئامادەیە، بەڵکو هاوکات پێ لەسەر دیدێکی تەواو ناسیاسی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دادەگرێت، کە جەوهەری دیدی نیولیبراڵە بۆ تاکەکەس و کۆمەڵگا. ئەم ڕۆحانیەتە جگە لەوەی گەڕانە بەدوای چێژدا، هاوکات گرنگیدانێکی سایکۆ تێرەپییانەیە بە خود وەک سێنتەری دونیا

لە جیهانێکدا پڕ لە نایەکسانیی کۆمەڵایەتی و نادادپەروەری و بێڕێزی بەرامبەر بە مرۆڤ. ئەم دیدە نیولیبراڵە بۆ ڕۆحانیەت بەختەوەربوون لە ژیاندا دادەبڕێت لە سەرجەمی پێگە و جێبەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگییەکان و گرێی ئەداتەوە بە توانای تاکەکەسیی چێژوەرگرتن و بینینی جوانی و ویستی ڕزگاربوون و پاکژبوونەوەیەکی تاکەکەسییەوە. لەم دیدە نیولیبراڵەدا بەختەوەری گرێ دراوە بە بەرپرسیارێتیی تاکەکەس خۆیەوە، لەوەدا بتوانێت دوور لە کێشە کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعییەکان و دوور لە نایەکسانی و ململانێ و خراپەکارییەکان، چاوەکانی خۆی پاکژ بکاتەوە و وایان لێ بکات بتوانن جوانی ببینن و دونیا بە شێوەیەکی ئیستاتیکی ئەزموون بکەن.

وەک پێشتریش وتم ئەم قۆناغە لە بەرخۆریی نیولیبرالانە قۆناغی فرۆشتنی نارسیسمە، لە ڕاستیدا ناکرێت قسە لە بەرخۆری و سایکۆلۆژیا و ئابوورییەکی نیولیبراڵ بکەین بەبێ قسەکردن لەسەر نارسیسم وەک کاڵایەکەی سەرەکیی ناو ئەم دونیا نیولیبراڵە. چونکە ئەوەی تاکەکەس دەکاتە سێنتەر، بەتایبەتی سێنتەر وەک کڕیار، پەرەدانە بە نارسیسم وەک یەکەی سەرەکیی سایکۆلۆژیای تاکەکەسی و گەورەکردن و فووکردنە بە خودێکدا کە بە مافی خۆی دەزانێت خاوەنی هەمووشتێک بێت و بتوانێت هەموو شتێک بکڕێت، ئیتر لە کڕیاری شتومەکە مادییەکانەوە بیگرە تا بە کڕینی سەرجەمی ئەو گوتار و زمان و ئەدەبیاتە دەگات کە بە ڕۆحانیەت و "دونیای مەعنەوەی"یەوە گرێ دراون. لە ڕاستیدا نارسیزم یاسای سەرەکیی دروستکردنی کڕیارە لە دونیای ئێمەدا،

کڕیاری شتە مادییەکان و کڕیاری شتە مەعنەوییەکان. نارسیزم ژێرخانە سایکۆلۆژییەکەی بەرخۆرییە وەک سیستمێکی ئابووری و ژێرخانە سایکۆلۆژییەکەی نیولیبرالیزمە وەک سیستمی دروستکردنی تاکەکەسی لەیەکدابڕاوی ناسیاسی و دابڕاو لە گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتی.

بێگومان ئەم مۆدێلە لە کڕیاربوون و بەبازاڕیکردنی مرۆڤ، تەنها لەبەردەمی ئەو کەسانەدایە کە توانای دابینکردنی بنەما مادییەکانی ژیانیان هەیە، دەتوانن منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە باشەکانەوە، بە ئوتومبێلەکانیان بچن بۆ سەر کارەکانیان، سەیران بکەن بۆ دەشت و شاخە دوورەکان و لە تەنیشت ئاوەکان و لەژێر کەپری باخەکانیاندا بخۆن و بخۆنەوە و ماسی ببرژێنن و گۆرانی بڵێن. بە هەموو مانایەک ئەم ڕۆحانیەتە ڕۆحانیەتی ناو مەسرەفگەراییەکی بەربڵاوە و ئەوەشی بنەما مادییەکەی دروست دەکات مەسرەفگەرایی خۆیەتی، هاوکات خۆشی بەشێکی دانەبڕاوە لەو ئەخلاقیات و مۆراڵەی مەسرەفگەرایی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. ئەم شێوازە لە ڕۆحانیەت، ڕۆحانیەتی ئەوانەیە کە دەتوانن مەسرەف بکەن، شت بکڕن، سەفەر بکەن، بچنە دەرەوەی شار، سەیران بکەن، مۆسیقا ڕۆحانییەکان لە ئوتومبێلەکانیاندا لێ بدەن، دوای تێرخواردن گوێ لە مەولانا و حافیز و سوپهەری بگرن، هتد...

ئەوەی شوێنی سەرنجە ئەم تاکەکەسە نارسیستیە کە ڕۆحانیەتێکی نیولیبرالانە ئاراستەی دەکات، خۆی وەک هاوڵاتی نابینێت بە هەموو چاوەڕوانی و بەرپرسیارێتییەکانی هاوڵاتیبوونەوە، بەڵکو گاڵتەی بە کۆمەڵگا دێت و ژیانی

پێکەوەیی دەستەجەمعی بە ژیانێکی سەتحی دەزانێت و کەسانی تر بە گەمژە و نەزان و بێکولتوور ناونووس دەکات. چارەسەری کێشەکانی ئەو دونیایەش لە گۆڕانی حوکمڕانی و دەسکاریکردنی بونیادی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا نابینێت، بەڵکو لە مشورخواردنێکی نارسیستییانەی تاکەکەسیدا بۆ خودی خۆی دەیبینێت. ئەم ڕۆحانییە نیولیبراڵە ڕۆحانیەتە لە دەرەوەی تەحەدا گەورە و کێشە سەرەکییەکانی دونیادا، ڕۆحانیەتێکە نارسیستبوونی هەڵگرەکانی، کە بەرهەمی ئابووری و دونیایەکی نیولیبراڵە، وەک مافێکی گەردوونی نماییش دەکات و دەشتوانێت تا ئەو شوێنە بڕوات وەک بەشێک لە مەفاکانی مرۆڤ بیناسێنێت. هاوکات ئەم ڕۆحانیەتە کە مەسرەفگەرایە، بەڵام مەسرەفگەراییەکە وەک مەسرەفگەرایی دەر ناخات، خۆی دەکات بەژێر کۆمەڵێک وێنە و گوتار و زمانەوە کە وا بکەن نە ڕووکارە نارسیستییەکی دەر بکەوێت، نە هەقیقەتەکانی ئەو موناجاتە عیرفانییە وەک بەشێک لە کولتووریی مەسرەفگەرایی. ئەم "ڕۆحانیانە!" کەسانی نامۆی ناو ئەو دونیا مەسرەفگەرە نین کە دروست بووە، بەڵکو کوڕە دڵسۆزەکانی ئەو دونیایەن و وەک ماسییش چۆن لەناو ئاودا مەلە دەکات ئەوانیش لەناو ئەو دونیا بەرخۆر و مەسرەفگەرایەدا مەلە دەکەن. ئەمانە پرسیاری ئەوە ناکەن ئەو ژینگەیە چۆن کار دەکات، بەڵکو بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن لەناو ئەو ژینگەیەدا چۆن ڕۆحانی و بەختەوەر بین، پرسیاری ئەوە ناکەن ئەو ژینگەیە چیها ناشیرینی و بێڕێزی و تاوان بەرهەم دەهێنێت، بەڵکو داوای ئەوە دەکەن جوانبین و جوانییەکانی ناو ئەو ژینگەیە بین و خۆمان لە پۆخڵەواتەکانی بەدوور بگرین. لەباتی ئەوەی بچنە

پەیوەندییەوە لەگەڵ ڕەهەندە سەخت و ناشیرین و دژوارەکانی ئەو ژینگەیەوە بە ئامانجی گۆڕین و دەسکاریکردنی، خەریکی ئەوەن ئەو ژینگەیە لەگەڵ ڕوانینەکانی ئەم خودە نارسیسیەتەدا بۆ خۆی بگونجێنن و لەباتیی جوانکردنی دونیا خەریکی جوانکردنی ڕوانین و چاوەکانیان بن. وەک سوپەهەری دەیانەوێت قەناعەتمان پێ بهێنن کە مادامەکی سێو هەیە پێویستە دڵمان بە ژیان خۆش بێت. بەڵام پرسیاری ئەوە ناکەن کێ ڕەنج ئەدات بۆ بەرهەمهێنانی ئەو سێوە، کێ دەیفرۆشێت و قازانجی لێ دەکات، کێ لە بەرهەمهێنانیدا نەخۆش دەکەوێت، چەندە منداڵ و پیر و پەککەوتە بەشدارن لە بەرهەمهێنانیدا، کێش دەتوانێت لەگەڵ خواردنی گۆشتی ماسی و ئاسکەکێوی و دوای شەرابخواردنەوە، بیخوات.

## ئەخلاقیاتی ڕۆحانیەت

بە بۆچوونی من هەر ڕۆحانیەتێک بخوازێت لە دونیای ئێمەدا وەک کردەیەکی ئەخلاقیی ڕاستەقینە ئامادە بێت، کردەیەک تیایدا مرۆڤ هەم لەبەردەمی خۆیدا و هەم لەبەردەمی کۆمەڵگاکەیدا بەرپرسیار بێت، پێویستە هەڵگری ئەم سێ پرنسیپە سەرکییە بێت.

یەکەم، سادەژیان و نەبوون بە بەشێک لەو پەتای بەرخۆرییەی لە کوردستاندا ئامادەیە. ئەمە مەرجی ژمارە یەکە و مەرجی هەرە سەرەتایی هەر ڕۆحانیەتێکە بخوازێت سنوورێک لەنێوان خۆی و سایکۆلۆژیای بەرخۆریدا بکێشێت. ڕۆحانیەت لە دونیای ئێمەدا هیچ مانایەکی نابێت گەر نەگۆڕێت بۆ شێوەژیانێکی ئەلتەرناتیڤ و جیاواز بۆ ئەو

دۆخە مادی و دەروونییەی بەرخۆری لە وڵاتەکەدا دروستی کردوە.

دووهەم؛ لەباتیی "کشان" و "قەڵەوبوونی من" لەباتیی "فووکردنە خود" تا ئاستی ئینتەلاکردنێکی مادی و مەعنەوی، لەباتیی نارسیزمێک کە هەڵپەی ڕاکێشانی هەموو دونیای بۆ ناو خود هەبێت، مرۆڤ لە ڕۆحانیەتدا هەوڵی "بەرزبوونەوە" و "دەرچوون" و "وازهێنان" ئەدات، هەوڵی بوون بە مرۆڤێکی کامڵ ئەدات، کە لە ئێستای کۆمەڵگای ئێمەدا مانای هەوڵدان بۆ نوقمنەبوون لەناو ئەو "قەڵەوبوون"ە جەستەی و ڕەمزییەدا، کە لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە و دابڕان لەو فۆرمە ترسناکەی نارسیزم کە بەرخۆری لە دونیای ئێمەدا دروستی کردوە (Kunnenman 2009). بەم مانایە ڕۆحانیەت مانای جێگرتنەوەی "بەهاکانی کشان" بە "بەهاکانی بەرزبوونەوە"، بەرزبوونەوە بە مانای تێپەڕاندنێکی هۆشیارانەی مۆدێلە باڵادەستەکانی بەخودبوون، کە لە دونیای ئێمەدا نوقمە لەناو دەرکەوتە ناتەندروست و خراپەکانی نارسزیمدا. نارسیست کەسێکە لە هەموو شوێنێکی ئەم دونیایەدا بەدوای وێنەکانی خۆی و سەدای قسەکانی خۆیدا دەگەڕێت، نەک بەدوای وێنەکانی جیهان خۆی و وێنەی ئەوانی تر و دەنگ و سەدای ئەو قسەوباس و زمانانەی کە لەوانەی خۆی جیاوازن.

سێهەم، ئەخلاق یان ئەتیکی ڕۆحانیی ئەخلاقی، ئیلتیزامێکی گەورەیە بە کێشە سەرەکییەکانی ناو ژیانی گشتییەوە، ئەخلاقێکە تەنها بەدوای "ڕزگارکردنی تاکەکەسی"دا ناگەڕێت، دونیا ناخاتە تایەکی تەرازووەوە و خودی خۆشی لە تایەکەی تریدا. لەم ئەخلاقەدا بەوەفابوون بۆ خود و بۆ خودا، بۆ

نەدۆزراوە و نادیار، دەبێت بەشێک بێت لە بەوەفابوون بۆ ئێرە و ئێستا، بۆ ئەوەی دیارە و دەیبینین، بۆ ئەوەی لە ئێستادا هەیە و دونیا دروست دەکات. مرۆڤی ڕۆحانی، مرۆڤێکە تێکەڵ بە دونیا، تێوەگلاو لە کێشە و تەحەداکانی، کەسێکە هاوکێشەیەکی تەندروستی لەنێوان پێکەوەبوون و تەنهاکەوتندا دۆزیوەتەوە.

مرۆڤ، چ ڕۆحانی بێت یان ناڕۆحانی، ناتوانێتماڵێکی هێمن لەناو جەهەنەمێکی کۆمەڵایەتیدا دروست بکات، خاوەنی خودێکی ئارام بێت لەناو دونیایەکی نائارامدا. ڕۆحانیەت لەم ئاستەدا بەشێکە لەو هەوڵ و کۆششانەی دەیانەوێت ئەو دونیایە باشتر و ئینسانیتر و یەکسانتر و دادپەروەرانەتر بکەن. ئەخلاقی ڕۆحانیەت ئەخلاقی ئینتیمایەکی دووجەمسەرەیە، لە سەرێکەوە ئینتیمایە بۆ خود خۆی وەک بکەرێک کە بەردەوام خەریکی خۆداهێنان و خۆدروستکردنە، لە سەرێکی ترەوە ئینتیما بۆ دونیا، بۆ خودا و بۆ ئەوانی تر، بە مەبەستی بەئینسانیکردنێکی بەردەوامی هەموویان. هەردوو ئینتیماکەش وەک چۆن دوو کۆڵەکەی گرنگی خودسازییەکی ئینسانی و ئەخلاقین، ئاواش بەشێکن لە پرۆژەیەکی قووڵی دەسکاریکردن و داڕشتنەوەی دونیا بە ئاراستەیەکەدا مرۆڤ تیایدا ناسکتر و میهرەبانتر و دادپەروەرانەتر بژی.

**کێشەی ئیستێتیزم وەک جوانسازییەکی پەڕگیر**

بەشێکی گەورەی ئەم موناجاتە عیرفانییە خۆی بە ئیستاتیکا و جوانناسییەوە گرێ داوە، تا ئەو شوێنەی هەڵگرانی ئەم موناجاتە بەرهەمهێنانی جوانییان کردوە بە ئەلتەرناتیڤی

بەرهەمهێنانی کۆمەڵگایەکی دادپەروەر. لەمەش خراپتر ئەم عیرفانیەتە تازەیە لە زۆر سەرەوە ئیستاتیکا دەکات بە ئەلتەرناتیڤی کردەی مێژوویی بە مانا کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکەی. ئیستاتیزم پێ لەسەر مەیلێکی جوانکاریی پڕ موبالەغە و لەسەر قەبەکردنێکی گەورەی ڕۆڵی هونەر و جوانی لە ژیانی کۆمەلایەتیدا دادەگرێت. یاخود سەیرکردنی دونیا بەپێی پێوەرە ئیستاتیکییەکان و بێنرخ و بێماناکردنی هەر کردە و خواست و حەزێکی مێژوویی کە نەچێتەوە ناو حیسابات و پێوەرەکانی جوانکارییەوە. مامەڵەکردنی دیدی جوانکاریانە وەک ئەلتەرناتیڤی سەرجەمی دیدە سیاسی و کۆمەلایەتی و دینی و فەرهەنگی و ڕەمزییەکانی تر. مەسەلەکە ئەوە نییە ئایا هونەر و جوانی ڕۆڵیان لە ژیانی کۆمەلایەتیدا هەیە یان نا، بەڵکو ئەوەیە ژیانی کۆمەلایەتی بە هەموو دەرکەوت و ئالۆزییەکانیەوە بۆ هونەر و جوانی کورت بکەیتەوە. یان لەمەش خورافیتر نمایشکردنی ئیستاتیکا وەک ئەلتەرناتیڤی هەموو کردەیەکی مێژوویی. لەم دیدە جوانسازییە پەرگیرەدا دونیای ئەمڕۆ جوانیی تیادا نەماوە و لەباتیی جوانییش پڕ کراوە لە "ئیبتیزال" و "تەخدیرکردنی هەستی مرۆڤ بە جوانی" بۆیە ئیشی مرۆڤ ئەوەیە جوانی بۆ ئەو دونیایە بگەڕێنێتەوە. ئەم وێناکردنە سادەیەی دونیای ئەمڕۆ لە چەندان سەرەوە وێناکردنێکی تەواو نوقسان و خورافییە. چونکە دونیای ئەمڕۆ دونیای چەندەها کێشەی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەخلاقی و فەرهەنگیی گەورەیە کە بە "دروستکردن" و "بەرهەمهێنان"ی جوانی چارەسەر ناکرێت. بینینی جوانیی سێوێک لەوە ڕزگارمان ناکات ناشیرینی

سەروبرۆتاشینی مرۆڤێک لە دەڤەری هەولێر نەبینین و تووڕدانیشی لە دێکەڵەوە بۆ ئەمدیو ڕامان نەوەستێنێت. ئەو ئازادییەش کە گوایە بەرهەمهێنانی جوانی، یان ئەم شێوازە لە بەپیرۆزکردنی ئیستاتیکا، بە مرۆڤی دەبەخشێت لە باشترین حاڵەتدا ئازادییەکی ڕەمزی و تاکەکەسیی دەرونییە لەناو دونیایەکی نائازادی پڕ لە جەبر و فشار و بونیاد و یەکە و هێز و خەونی نائازاد و چەپێنەردا، دونیایەک پڕ لە سووکایەتیکردنی بەردەوام و گەورە بە مرۆڤەکانی.

گۆڕانی دونیا بە ڕۆمانسیەتێکی گرێدراو بە هونەرەوە مەیسەر نابێت، جوانی ناتوانێت زۆرێک لە کێشەکانی دونیای ئەمرۆ چارەسەر بکات، ئەوەی پێویستە کردەی مێژوویی کۆنکریت و بەرەنگاربوونەوەی کێشە و گرفتە کۆنکریتەکانە کە سروشتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازی و بیرۆکراسی و هتد.. هەیە. خەونبینین بە دونیایەکی باشترەوە لەوەی لە ئێستادا هەیە و بەکارهێنانی خەیاڵ بۆ هەوڵدان بۆ وێناکردنی ئەو دونیایە بەتەنها بەس نییە، لە ڕاستییشدا بەشی هەرەزۆری خەونە ئینسانییە گەورەکان بە دونیایەکی باشترەوە بینراون، ئەوەی گرنگ و زەحمەتە، چۆنیەتیی دەسکاریکردنی دونیایە بە ئاراستەیەکدا بتوانێت بەشێک لەو خەونانە وەدی بهێنرێت.

لە ڕووی مێژووییەوە ئەو هێزەی کە بۆ جوانی و خۆشەویستی ژیاوە و پشتی کردۆتە پێدراوە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای بەرخۆریی مۆدێرن، هیپییەکان و هێزە پەراوێزیەکانی ساڵانی شەست و هەفتای کۆمەڵگاکانی خۆرئاوایە. ئەمانە ئەو کەسانە بوون کە هەم بۆ جوانی و هەم

بۆ خۆشەویستی دەژیان و لە ژیانی ڕۆژانەی خۆشیاندا وەک هەقیقەتێک لەگەڵ هەردووکیاندا ئەژیان. واتە لای هیپییەکان و هێزە پەراوێزییەکانی سالآنی شەست مەسەلەکە تەنها قسە و ڕیتۆریک و تێکست نەبوو، بەڵکو شێواز و ستایەڵی ژیانیش بوو. بەڵام دەرەنجامە مێژووییەکەی بۆ هەمووان ئاشکرایە و دەرکەوت ئەو فۆرمە لە کردەی مێژوویی بەس نییە بۆ ئەوەی دونیایەکی گونجاوتر دروست بکرێت.

ئەوەی لە کوردستاندا دەیبینین بە ئاستی هیپییەکانی سالآنی شەست و هەفتای خۆرئاوا ناگات، چونکە زۆرینەی ئەوانەی باس لە عیرفانیەت و ڕۆحانیەت و جوانی دەکەن و بەرگرییان لێ دەکەن، هیچ یەکێک لەم بەهایانە لە ژیانی خۆیاندا ڕەنگی نەداتەوە و ئامادە نییە. وەک وتم ئەوانە نوقمی ناو کۆمەڵگای بەرخۆریی ئەمڕۆکەی کوردستانن و لەگەڵ بەشێکی زۆری ناشیرینییەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەدا، چ لە ئاستی پەیوەندیی کۆمەلآیەتی و چ لە ئاستی خۆشەویستی و چ لە ئاستی سیاسیدا دەژین. ئەمانە هەڵگری ئەو جۆرە لە هۆشیارین کە هێربەرت مارکۆزە ناوی "هۆشیاریی بەختەوەریی" ناو کۆمەڵگای بەرخۆرییان لێ دەنێت (Marcuse 1991).

#### دەرەنجام

ئەم شەپۆلە لە ڕۆحانیەتی بەرخۆرانە کە لە هەرێمدا دروست بووە، ڕۆحانیەتێکە هێمایە نە بۆ خۆدۆزینەوەی تازەی ئەو کەسانە، نە بۆ داهێنانی خودێکی نوێ، نە بەشێکیشە لە پرۆسەی دەسکاریکردنی ژیان و پەیوەندییەکانیان، بەڵکو

درێژەدانە بە هەمان خودسازیی بەرخۆرانەی دونیای دوای ڕاپەڕین، لەناو هەمان مۆدێل لە ژیان و هەمان ژینگە و هەمان دونیابینیدا. ئەم ڕۆحانیەت و موناجاتە دینیی و نیمچەدینییە خۆی لەو دونیایە ناسێنێتەوە کە دروستی کردن و کە ڕۆژانەش بەبەردەوامی دروستیان دەکات، کەسیان نە کارەکەی، نە پۆستەکەی، نە پێگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی، نە ئەو شێوە ژیانەی کە ئەمانە بۆیان دەستەبەر کردوە، جێ نەهێشتوە، بۆ ئەوەی پێگەیەکی ڕۆحیی نوێ و خودێکی نوێ دابهێنن. ئەم ڕۆحنیەتە لە هیچ ئاستێکیدا ڕیفۆرمکردنی ژیانی ئەوان نییە، پەڕینەوە نییە بۆ ستایەڵ و تێگەیشتنێکی نوێ بۆ ژیان، یان بۆ وازهێنان لە کۆمەڵێک سەنگەرگیریی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و فەرهەنگیی تەقلیدی. بەشێکی گەورەی ئەم ڕۆحانیەتە دیاردەیەکی ڕیتۆریکیی بەرفراوانە و بەشێکیشە لەو پیشەسازیی چێژەی کە بەرخۆری لە کوردستاندا دروستی کردوە. ڕەنگە لە هەندێک ئاستدا ئەم ڕۆحانیەتە شێوازێک بێت لە "هۆشیارییەکی ڕەخنەیی"، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەم موناجاتە عیرفانییە ناتوانێت تا دواهەنگاو لەگەڵ ڕەخنەیبوونی خۆیدا بڕوات و ناتوانێت لەو فەزا دەرونی و سایکۆلۆژی و عەقڵییە ڕزگاری بێت کە بەرخۆری لە وڵاتەکەدا دروستی کردوە.

بەکورتی ئەم ڕۆحانیەتە هەرچییەک بێت، بەشێک نییە لە جووڵەیەک وا بکات مرۆڤ خۆی و کۆمەڵگاکەی و ژینگەکەی باشتر بناسێت، وا بکات ببێتە ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتیی چالاک بۆ دەسکاریکردنی خۆی و ژینگە و دونیاکەی، بەڵکو زیاتر تەعبیرە لە پەرچەکردادرێکی سایکۆلۆژی، کە بێزاربوونەکانی

ناو بەرخۆریزم ئاراستەی دەکات و هەر خودی بەرخۆریزم خۆشی وەک چارەسەر وێنا دەکات. ڕۆحانیەت لێرەدا بەشێکە لە سایکۆلۆژیای ناو مەسرەفگەرایی، نەک ڕۆحانیەت وەک هۆشیارییەکی ڕەخنەیی.

## سەرچاوەکان

Foucault, M. (1997). The ethics of the concern for self as a practice of freedom. In P. Rabinow (ed.). Ethics, Subjectivity and truth Essential works of Foucault, vol. 1 (pp. 281-301). New York: New Press.

Kunnenman, Hary (2009). Voorbij het dikke-ik: bouwstenen voor een kritisch humanisme. Uitgeverij S.W.P.B.V.

Marcuse, Herbert (1991). "Introduction to the Second Edition". One-dimensional Man: studies in ideology of advanced industrial society. London: Routledge

Williams, Ruth (2011). Eat, Pray, Love: producing the Female Neoliberal Spiritual Subject. The Journal of Popular Culture, Vol. 47, No. 3.

# بەشی پێنجەم

## لەودیوی تەکنۆفۆبیاوە

## تەکنۆلۆژیای پەیوەندی لە ژیانی ڕۆژانەدا

# لەودیوی

## سەرەتا

بەشێکی بەرچاو لەوانەی من لە نزیکەوە دەیانناسم، یان قسەیان لەگەڵ دەکەم و کاتیان لەگەڵدا بەسەر دەبەم، یان ئەوانەی لە چاخانەکان و شوێنە گشتییەکاندا دەیانبینم دانیشتوون و قسە دەکەن، یان کەسانێکی دیکە کە نایانناسم، بەڵام لە ڕێگای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی سەر ئینتەرنێتەوە پەیوەندیمان هەیە، زۆربەیان، ئەگەر نەڵێم هەموویان، بە شێوەیەکی بەرچاو لەناو دونیای دیگیتالدا ئامادەن و خاوەنی ئامێرە تەکنۆلۆژییە تازەکانی پەیوەندیکردنن. زۆربەیان سمارت فۆنێک یان لاپ تۆپێک یان ئای پادێک، یان هەموو ئەمانەیان بەیەکەوە هەیە و هەندێک لەم ئامێرانەش لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە ناو "ڕووبەرە گشتیی"ەکانی ناو دونیای ئێمەوە. زۆرێک لەمانە چەندە بە قسەکردن و گفتوگۆکردنەوە لەگەڵ یەکتریدا سەرقاڵن، ئەوەندەش، ئەگەر زۆر زیاتریش نەبێت، بە ئای فۆن و گالاسکی و سمارت فۆنەکانیانەوە سەرقاڵن. ئەم ئامێرانە بە جۆرێک ئامادەن لە زۆرکاتدا وەک درێژکراوەی جەستە و کەسایەتیی هەڵگرەکانیان دەر دەکەون، بەشێکن لەو کەسایەتییانە و دەرکەوتێکی گرنگی شوناسی

ئەوانـن لەنـاو کۆمەڵگای ئێمـەدا. وەک چـۆن هەندێکیـان هێمـا بـۆ پێگـەی چینایەتـی و شـێوازی ژیانـی هەڵگرەکانیـان دەکات هەندێکی دیکەیـان هێمـا بـۆ زەوق و چێژی ئیسـتاتیکیی ئـەوان دەکات. لـەم ڕووەوە ئـەم ئامێرانـە بـەڵام کەمتـر وەک ئامرێکـی بێلایـەن و زیاتـر وەک کۆدێکـی کولتـووری یـان ئامێرێکـی کولتـووری و ڕەمزیـی دەر دەکـەون. زۆرینـەی ئـەم ئامێرانـەش نووسـخە کۆپیکراوەکانـی ئـەو ئامێرانـەن کـە لـە ئەورووپـا و ئەمریکادا ئامـادەن و زۆربەشـیان لـە چیـن و تایلانـد و شـوێنانی تـردا وەک کۆپـی دروسـت کـراون و هێنراونەتـە بازاڕەکانـی کوردسـتانەوە و خەڵـک بـە خێراییەکـی پێوانەیـی دەیانکـڕن و بەکاریـان دەهێنـن. بـاوەڕ ناکـەم هیـچ ئامێرکـی تەکنۆلۆژیی دیکە بەخێراییـی ئـەم ئامێرانـە توانیبێتـی ببێـت بـە بەشـێکی دانەبڕاو و سـەرەکیی ژیانـی ڕۆژانـەی ژمارەیەکـی گـەورە لـە مـرۆڤ لـە کۆمەڵگای ئێمـەدا. ئەرکـی ئـەم ئامێرانـەش تەنهـا ئەرکێکـی کردەیـی نییـە، واتـە تەنهـا ئەرکیـان ئـەوە نییـە کـە پەیوەنـدی دروسـت و مەیسـەر بکـەن، یـان مـرۆڤ لـە ڕێگایانـەوە بتوانێت ئـەم یـان ئـەو کار جێبەجـێ بـکات، بەڵکـو ئەرکـی کولتـووری و ڕەمزیـی گرنگیشـیان هەیـە، لـەوەدا کـە دەخـوازن شوناسـێکی تایبەت بەو کەسـە بدەن کە هەڵگریانە و ڕوانینێکی تایبەتیشیان بـۆ مەیسـەر بکـەن.

لـە زۆر ڕووەوە ئـەم ئامێرانـە بەشـێکی سـەرەکیی ژیانـی ڕۆژانـەی ژمارەیەکـی بەرچـاوی مرۆڤەکانـی نـاو کۆمەڵگای ئێمەیـە و لـە زیـاد لـە بوارێکدا دەسـکاریی شـێواز و ناوەڕۆکـی ئـەم ژیانەشـیان کـردوە و دەکـەن و کۆمەڵێـک پرۆسـە و تێگەیشـتن و ڕوانینـی نوێیـان لەگـەڵ خۆیاندا هێنـاوە و دەهێنن.

تا دێتیش بەشێکی گەورەتری مرۆڤەکانی کۆمەڵگای ئێمە ڕۆژانە لە ڕێگای ئەم ئامێرانەوە "ئۆن لاین" و لەسەر تۆڕی پەیوەندییە ئەلەکترۆنییەکان چالاکن، لە زۆر کاتیشدا ئەو تۆڕانە بەشێکی سەرەکی و گرنگی ئەو جیهانەن کە تیایدا ئامادەن و پەیوەندییەکانیان ڕێک دەخەن و گەشە پێ ئەدەن.

**دونیای دیگیتاڵ لە هەموو شوێنێکدا**

جگە لەو خاڵانەی سەرەوە، بەشێکی زۆری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، گروپەکانی گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێ، دەزگا و ئۆرگانە ڕەسمی و نارەسمییەکانی دونیای ئێمە، گروپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، پلاتفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتیی جیاواز، پارتە سیاسییەکان، کۆچبەرانی دەرەوەی کوردستان، چالاکەوانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان، هونەرمەندان و ڕۆشنبیران، ڕێکخراوەکانی ژنان و منداڵان، یانە وەرزشییەکان و ئوتێلەکان هتد... هەموویان لەناو ئەم تۆڕانەدا ئامادەن و زۆر جاریش دەرکەوتە سەرەکییەکانی ژیانی ئەمانە و شێوازی سەرەکیی کارکردنیان و مۆدێلی باڵادەستی پەیوەندیکردنیان بە کۆمەڵگاوە، لە ڕێگای ئەم تۆڕانەوە ڕوو دەدات. ئەم تۆڕانە چیتر دیاردەیەکی لاوەکیی ناو کۆمەڵگای ئێمە نین، بەڵکو دیاردەی سەرەکی و بنەڕەتین و دونیای دیگیتاڵ دونیایەکی کۆمەڵایەتیی نوێیە کە مرۆڤی ئێمە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستویەکەمدا خۆی لەناویدا دەدۆزێتەوە و خۆی لەناویدا دروست دەکات.

لە ڕاستیدا تەنها گروپ و لایەن و هێزە ئامادەکانی ناو "ڕووبەری گشتی" نین کە لەسەر ئەم تۆڕانە چالاکن

و تەکنۆلۆژیـای پەیوەندیـی نـوێ کارگەریـی لەسـەر ژیانیـان بەجـێ دەهێڵێـت، بەڵکـو ئـەم تەکنۆلۆژیایـە لەنـاو "ڕووبـەری تایبەت"یشـدا بـە شـێوەیەکی بەرفـراوان ئامادەیـە و بەشـێکی گـەورەی "ژیانـی تایبـەت"ی کەسـانێکی زۆری نـاو کۆمەڵگای ئێمـە، بـە منداڵانیشـەوە، لـە پەیوەندییەکـی ڕاسـتەوخۆدان بـەم ئامێـرە تەکنۆلۆژییـە تازانـەوە. بەشـێکی بەرچـاوی "ژیانـی تایبـەت" لـە کوردسـتاندا لەنـاو ئـەو تۆڕانەدایە کە ئـەو ئامێرانـە دروسـتیان کـردەوە.

لـە هەندێـک ماڵـدا، بـۆ نموونـە، زیـاد لـە تەلەفیزیۆنێـک هەیـە، کـە نیشـانی ئـەدات ئەندامانـی ئـەو ماڵـە ناتوانـن لەسـەر سـەیرکردنی یـەک کەنـاڵ ڕێـک بکـەون و ناتوانـن یەکـڕا بـن لەسـەر ئـەوەی پێکـەوە سـەیری چـی بکـەن. بۆیـە لـە زۆر ماڵـدا زیـاد لـە ئامێرێکـی تەلەفیزیـۆن و زیـاد لـە سـەتالایتێک و زیـاد لـە کۆمپیوتەرێـک و زیـاد لـە لاپتۆپێـک و چەنـدان سـمارت فـۆن و مۆبایـل بوونیـان هەیـە، کـە هـەر یەکێـک لـەو ئامێرانـە سـەیرکردنی کەناڵـی تـر و پێگـەی تـر و شـتیتری نـاو دونیـای دیگیتـاڵ بـۆ هەریەکێـک لـەو کەسـانە مەیسـەر دەکات. لـەم ڕووەوە ئـەو شـێوازە لـە پێکەوەبـوون کـە جـاران لـە مەجالـی تایبەتـدا بوونـی هەبـوو، لـە زۆر شـوێن و لەنـاو زۆر خێزانـدا نەمـاوە. زۆرێـک لـە منداڵانیـش خاوەنـی ئـەو ئامێـرە ئەلکترۆنییـە جیاوازانـەن و زۆر جاریـش هـەر منداڵێـک بەتەنهـا خەریکـی یاریکردنـە، یارییـەک لـە یارییـە ئەلکترۆنییەکانـی نـاو ئـەو ئامێرانـە و بەدابڕاوی لـەو ژینگـە خێزانییـەی کـە ئامـادە و لەئارادایـە.

بـە مانایەکی دیکە ئـەم ئامێرانـە لەنـاو "ڕووبـەری تایبـەت"ی

ژیانی کۆمەڵایەتیدا لای زیاد لە نەوەیەک بە زیاد لە شێوازێک و بۆ زیاد لە مەبەستێک ئامادەیە. چ نەوە کۆنەکان و چ نەوە نوێیەکان، چ ژنان و چ پیاوان، چ خاوەن پارە و چ هەژاران، زۆرینەیان خاوەنی ئەم ئامێرانەن و بەشێکی گرنگی ژیانی ڕۆژانەیان بە هۆی ئەم ئامێرانەوە ڕێک دەخەن. ئەم دۆخە بە ڕادەیەکە لە زۆر شوێندا شتێک بە ناوی "کۆڵان" یان "گەڕەک"، یان "بەردەرگا" بە مانا سۆسیۆلۆژییەکەی جاران بوونی نەماوە، نە یاریی منداڵانی جاران لەناو بڕێک لە کۆڵانەکاندا ماوە، نە کۆبوونەوەی دراوسێکان لەگەڵ یەکدا، نە ئەو سەردان و میواندارییە شەوانانە کە بەشێکی گرنگ و بنەڕەتیی ژیانی کۆمەڵایەتی بوون. واتە شێوازێکی تایبەتی پێکەوەبوون و کارلێکردنی کۆمەڵایەتی کە "شوێنی کۆنکریت" ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەبینی، یان نەماوە یان تەواو لاواز بووە. ئامێرەکانی پەیوەندیکردنی نوێ دەسکارییەکی تەواوی ماناکانی "دراوسێیەتی" و "کۆڵان" و "گەڕەک"یان کردوە و لەناو دونیای دیگیتاڵیدا "شوێنی گریمانکراوی"ان وەک ئەلتەرناتیڤ بۆ دۆزیونەتەوە، کە "شوێنی ناو دونیای واقیعی" نین و بە مانا سۆسیۆلۆژیەکەشی شوێنێکی کۆنکریتی نین. بە مانایەک لە ماناکان شوێنە دیگیتاڵییەکان بوون بەو ڕووبەرە گریمانکراوانە کە بڕێکی زۆری مرۆڤەکانی کۆمەڵگای ئێمە، بەتایبەتی منداڵان، ناتوانن بچنە دەرەوەی. هاوکات زۆر جار وەک دەرەنجامی ئامادەگیی هەمەلایەنەی ئەم دونیا دیگیتاڵییە دەرەوەیەک نەماوەتەوە لە فۆرمی کۆڵان و گەڕەک و دراوسێدا کە کەسەکان بچنە ناویەوە و وەک دونیایەکی کۆمەڵایەتی مامەڵەی بکەن. لە ڕووە

سۆسیۆلۆژییەکەیەوە ئەم ئامێرانە کۆتاییان بە دونیایەک و بە شێوازێک لە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی و بە مانایەک لە ماناکانی شوێن هێناوە و دونیای تر و شێوازی تری پەیوەندی و مانای تریان خستۆتە جێیان. ئەم خاڵە ئەو ڕاستییەمان دەربارەی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی نیشان ئەدات کە ماکلوهان McLuhan لە سەرەتای شەستەکانەوە نیشانی داوین، ڕاستیی ئەوەی کە کاریگەریی ئامێرەکان وەک ئامێر، وەک تەکنۆلۆژیا، لەسەر کۆمەڵگا گەورەیە، بەبێ ئەوەی تەماشای ناوەرۆکی ئەو گوتار و باسانە بکەین کە ئەو تەکنۆلۆژیایانە بڵاوی دەکەنەوە. واتە کاریگەریی کاراکتەری ئامێرەکە خۆی وەک ئامێر، بەبێ ناوەرۆکی ئەو باسانەی بڵاوی دەکاتەوە، لەسەر کۆمەگا گەورەیە. بە مانایەکی دیکە ئامرازە تەکنۆلۆژییەکە خۆی ناوەرۆکەکەشیەتی (McLuhan 1994).

### سەردەمی دیگیتاڵ بۆ هەمووان

لە دوو دەیەی ڕابردوودا گەشەکردنی تەکنۆلۆژییای پەیوەندیی دونیایەکی تەواو تازەی دروست کردوە، کۆمپیوتەری لاپ تۆپ، تەلەفۆنی مۆبایل، دروستبوونی تۆڕەکانی ئینتەرنێت و لەدایکبوونی دونیای دیگیتالی، ئاستێکی تەواو نوێی پەیوەندییکردنی مرۆڤەکانی بەیەکترییەوە و پەیوەندییان بە خۆیانەوە، هێناوەتە کایەوە. ئەمڕۆ کەسانێکی زۆر لە شوێنە جیاوازەکانی دونیادا لە ڕێگای تەلەفۆنە مۆبایلەکانیانەوە بە تۆڕێک لە پەیوەندیی ئەلکترۆنییەوە گرێ دراون کە لە مێژوودا وێنەی نەبووە. لە ئێستادا زیاد لە دوو ملیار مرۆڤ

بە تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە گرێ دراون و زیاد لە پێنج ملیار مرۆڤیش خاوەنی تەلەفۆنی مۆبایلن. هەموو ئەمانەش لە ماوەیەکی هێجگار کورتدا و بە ڕادەیەک ساتێک لە مێژوودا نادۆزینەوە مرۆڤ بە ڕادەی ئەمڕۆکە ئەو هەموو توانایەی پەیوەندیکردنی بە کەسانی ترەوە و بە شتەکانی ناو ئەو دونیایەوە کە تیایدا دەژی، لەبەردەمدا بوو‌بێت (Chatfield ٢٠١٢: ١٢).

کۆمپیوتەر و تۆڕە گەورەکانی ئینتەرنێت و ئامرازە تەکنۆلۆژیاکانی تر وایان کردوە زۆر جار ئەرکی زیاد لە دەزگا و ئامرازێکی ناو ژیانی نادیگیتاڵی ببینن. بۆ نموونە، لاپ تۆپێک لە یەک کاتدا هەم کتێبخانەیەکی هێجگار گەورەی پڕ کتێب و زانیاریی هەمەجۆرە، هەم زانکۆ یان نیمچەزانکۆیەکە، هەم خەزێنەیەکی گەورەیە بۆ فێربوونی چەندان پیشەی جیاواز، یان لانی کەم گەشەدان بە تواناکانی مرۆڤ لە زیاد لە پیشەیەکدا، هەم ڕیکۆردەرێکی چالاکی دەنگ و خەزێنەیەکی گەورەی مۆسیقا و گۆرانی و فیلم بێت، هەم کامێرایەکی سینەمایی و هەم کامێرایەکی سادەی وێنەگرتنی فۆتۆگرافی و هەم تەلەفیزیۆن یان سینەمایەکی تەواو بێت، هەم هۆکارێکیش بێت بۆ پەیوەندیکردنی دەنگی و وێنەیی بە کەسانی ترەوە. هاوکات هەم بازاڕێکی تەواو بێت بۆ کڕینی ئەو شتانەی مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێویستیی پێیانە. بەشێکی گەورەی ئەم ئەرکانەش تەنانەت لەناو سمارت فۆنە مۆبایلەکانیشدا هەن و دەکرێت بۆ ئەو مەبەستانە بەکار بهێنرێن.

تا کۆتایی ساڵی ٢٠١١ هەموو ڕۆژێک و لە هەموو

دەقیقەیەکدا تەنها یەک کاتژمێر تۆماری ڤیدیۆیی خراوەتە ناو تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە، لە ئێستادا ئەو توانایە زۆر گەورەتر و زۆرترە و بەشێکی زۆری یاداوەریی مرۆڤایەتی، لە هەموو بوارەکاندا، لە فیلم و گۆرانی و مۆسیقا و هونەرەوە بیگرە، تا بە هەموو بەرهەمە فیکری و ئەدەبی و سیاسی و فەلسەفییەکان دەگات، لەناو دونیای دیگیتالیدا و بە زمانە جیاوازەکانی دونیا ئامادەن و بەشێکی بەرچاویشیان بەبێ بەرامبەر لەبەردەستی ئەوانەدایە کە دەتوانن و دەیانەوێت بەکاری بهێنن. تا ساڵی ٢٠٠٨ یەک ملیار لاپەڕە لەناو تۆڕەکانی ئینتەرنێتدا دانرابوون، لە ئێستادا ژمارەکە هێندە بەرز بۆتەوە کە ناژمێردرێت. لە ڕۆژی داهێنانی چاپخانەوە و بە درێژایی پێنج سەدەی ڕابردوو ژمارەی ئەو کتێبانەی بە هەموو زمانەکانی دونیا چاپ کراون سەد ملیارد کتێبێکە، لەمڕۆدا ئەو ژمارەیە لە تێکستی نووسراو تەنها لە مانگێکدا دەخرێتە سەر تۆڕەکانی ئینتەرنێت (ه. س. پ. ل ٢٧). ژمارەی بەشداربووانی ناو میدیای کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی بەشداربووانی فەیسبوک، تا ساڵی ٢٠١٣ لە سەرووی میلارێک و سەد ملیۆن کەسەوە بووە. ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی هێجگار گەورە لە کۆرسی جیاواز لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیانی عەمەلیدا، تا بە سەدان و هەزاران وانە و کۆرسی زانکۆ گەورە و گرنگەکانی دونیا دەگات، هەموویان لەسەر لاپەڕەکانی ئینتەرنێت هەن و ئەوەی بیەوێت دەتوانێت کەڵکیان لێ وەر بگرێت.

ئەوەی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گرنگە ئەوەیە کۆمپیوتەر و سمارت فۆن و تەکنۆلۆژیا تازەکانی تری پەیوەندییکردن تەنها ئامێرێک نین بۆ دانان و دۆزینەوە و هەڵگرتنی زانیاری،

بەڵکو ئامێری پەیوەندیی فرەجەمسەر و فرەجۆریشن، دەتوانرێت لەناویاندا دونیایەکی پڕ پەیوەندی و پڕ کارلێکردنی هەمەجۆرە و هەمەڕەهەند دروست بکرێت. دونیایەک تەریب یان لەپاڵ ئەو دونیا کۆمەڵایەتییەدا کە ئێمە لەناویدا دەژین، بەڵام هاوکات گرنگ و فرەڕەهەند. وەک نووسەرێک دەڵێت چۆن دروستکردنی شاری مۆدێرن لە چەند سەدەی ڕابردوودا دەبێتە هۆکاری کۆچ و ماڵگواستنەوەی ژمارەیەکی گەورەی دانیشتووانی لادێکان بۆ شارەکان، بە هەمان شێوە دروستبوونی دونیای دیگیتاڵ ژمارەیەک مرۆڤی زۆری لەناو دونیای کۆمەڵایەتیی خۆیانەوە بەرەو ئەو دونیا دیگیتاڵییە ڕادەکێشێت (ە. س. پ. ل ٢٧). ئەم ڕاکێشانەش دەسکاریی زۆر ڕەهەندی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕەمزیی مرۆڤەکان دەکات. کۆچ بۆ دونیای دیگیتاڵ یەکێک لە شێوازە هەرە سەرەکییەکانی کۆچکردنە لە دونیای ئەمڕۆدا. زۆر جار مرۆڤ پێویستی بە کۆچکردنی جوگرافیی نییە بۆ ئەوەی خۆی بە دانیشتووانی شوێنێکی دیکەی دونیا بزانێت، یان ئەو هەستەی هەبێت سەر بە گروپ و دەزگا و بزوتنەوە و کۆمەڵەیەکە کە لە ژینگە جوگرافییە ڕاستەوخۆکەی خۆیدا ناژین. بە بۆچوونی من بەشێکی گەورەی چینی ناوەند لە کۆمەڵگا جیاوازەکانی دونیادا لە دۆخی کۆچکردنێکی دیگیتاڵی بەردەوامدایە و بەشێکی گرنگی چالاکییەکانیان لەناو ئەو کۆچە دیگیتالیەدا ئەنجام ئەدەن.

مانوێل کاستێلس لە یەکێک لە کتێبە گرنگەکانیدا بە ناوی: *سەردەمی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان*، باس لەو ڕۆڵە گرنگە دەکات کە ئەم تۆڕانە لە دروستکردنی بکەری کۆمەڵایەتیی

نـوێ و بەرپاکردنـی گۆڕانکاریـی کۆمەڵایەتـی و مێژووییـدا دەیگێڕن. لای کاستێلس ئەم تۆڕانە دینامیکیەتی کۆمەڵایەتیی نوێ دروست دەکەن و ئەو کەسانەش بەڕێوەیان دەبەن کە نـاوی "هاوڵاتییانـی نـاو تـۆڕەکان" و نـاو "ڕووبـەری گشـتیی ژمارەیی"یان، لێ دەنێت. لە دیدی ئەم نووسەرەدا ئەم تۆڕانە دەتوانـن بەرهەمهێنـەری هۆشـیارییەکی مێژوویـی نـوێ بـن و دەتوانن بەشدار بن لـە دروسـتکردنی سـەردەم و ڕۆژگارێکی نوێـدا (Castells 2000).

بەرامبـەر بـەم دیـدە پۆزەتیڤـە بـۆ دونیـای دیگیتاڵـی و ئامادەگیـی مرۆڤـەکان لەنـاو ئـەو دونیایـەدا، دیدێکـی نێگەتیـڤ هەیـە کە پێی وایـە کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی ئەم دونیا دیگیتاڵییە لـە کاریگەرییـە پۆزەتیڤەکانـی زۆرتـر و گەورەتـرە و ئـەو خۆشـباوەڕییەی لەگەڵ دروسـتبوونی ئـەم تەکنۆلۆژیا تازانـەدا هاوتۆتـە کایـەوە، خۆشـباوەڕییەکی تـەواو سـادە و ناڕاسـتە. ئەم دونیا دیگیتاڵییە مرۆڤ لـەو ژینگە ڕاستەقینەیە دادەبڕێت کە لەناویدا دەژی و تووشـی جۆرێکی تـەواو نـوێ لـە تەنهایـی و دابڕانـی کۆمەڵایەتیـی دەکات، ئەمـە جگـە لـە گیرخـواردن بەدەسـتی چەندەهـا نارەحەتـی و ئـازاری جەسـتەییەوە، کـە وەک دەرەنجامـی دانیشـتنی زۆر لـە پشـتی کۆمپیوتـەر و تەکنۆلۆژیاکانـی تـری پەیوەندییـەوە دروسـت دەبێت. هـاوکات هەندێکـی دیکـە بـاس لـە دەرەنجامـە خراپەکانـی ئـەو شـەپۆلە کارۆموگناتیسییانە بۆ سـەر تەدروسـتی دەکەن، کە لە فـەزای ئامادەگیـی ئـەو ئامێرانـەدا دروسـت بـدەن. بەداخـەوە لێـرەدا کاتـی ئەوەمـان نییـە ئـەم دوو دیـدە بەدرێـژی بـاس بکەیـن و خاڵـی بەهێـز و لاوازی هەریەکێکیـان نیشـان بدەیـن، ئـەوەی

دەشێت بۆ مەبەستی ئەم نووسینە جەغتی لێ بکەینەوە، گرنگیی دروستبوونی سۆسیۆلۆژیایەکە کە بتوانێت دەرکەوتە جیاوازەکانی ئەم گۆڕانکارییانە، بە دەرکەوتە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤیەکانەوە بخوێنێتەوە و ڕاڤە بکات. سۆسیۆلۆژیایەک کۆتایی بەو ئیدانەکردن یان پیاهەڵدانە سادانە بهێنێت کە لە دونیای ئێمەدا بەرامبەر بە دونیای دیگیتالی ئامادەن.

## پێداویستیی هاتنەکایەی سۆسیۆلۆژیایەکی نوێ

بە بۆچوونی من کاتی ئەوە هاتووە سەرەتاکانی زانستێکی نوێ بە ناوی "سۆسیۆلۆژیای ژیانی دیگیتاڵی" یان "سۆسیۆلۆژیای ئینتەرنێت"، یان "سۆسیۆلۆژیای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان" لەدایک ببێت و ئەم دەرکەوتە تازە و گرنگانەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە دونیای ئێمەدا نیشان بدات و ڕاڤە بکات. نیشانی بدات چۆن ئەم ئامێرانە کاریگەریی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی جێ دەهێڵن، چ کاریگەرییەک لەسەر مۆدێلە فەرهەنگییەکان بەجێ دەهێڵن، چۆن کار لە مەیلە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، چۆن پرسی شوناس دەهێننە پێشەوە، چۆن پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو ژیانی ڕۆژانە دەسکاری دەکەن، چ جۆرێک لە شوناس و چ جۆرێک لە پێکەوەبوون و چ جۆرە تەنهاییەک بەرهەم دەهێنن و چۆن دەسکاریی ماناکانی پەیوەندیکردن و پێکەوەبوون دەگۆڕن؟ بەشێکی دیکە لەو پرسیارە گرنگانەی کە دەکرێت بیانکەین، پرسیارگەلێکی لەم بابەتەیە: ئایا مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایە چ وێنەیەک لەسەر ئەو تۆڕانە بۆ خۆی دروست دەکات؟ چ پرۆفایلێک لەسەر خۆی دەخاتە ناو ژیانی گشتییەوە؟ ئەم

وێنانـە چ پەیامێکی کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگییـان لەخـۆ گرتـوە؟ چ جـۆرە سیاسـەتێکی خودنماییشـکردن هەیـە و کار دەکات؟ ئایـا ئـەم تۆڕانـە چ جـۆرە کرانەوەیـەک دەهێنـن و چ جـۆرە داخرانێکـی نـوێ دروسـت دەکـەن؟ سـێلفی چ کاریگەرییـەک لەسـەر شوناسـی تاکەکەسـی جـێ دەهێڵێت؟ بەتایبەتـی کاتێک ئـەو سـێلفییە لـەوە دەر دەچێت لەنـاو ڕووبـەری شەخسـیدا بمێنێتـەوە و دەچێتـە نـاو ڕووبـەری گشتییەوە؟ ئایـا ئـەم تۆڕانـە چ توانـا و ئەگەرێکیـان بـە گـروپ و هێـزە پەراوێزخراوەکانـی دونیـای ئێمـە بەخشـیوە، ژنـان و پیـران و منـاڵان بۆ نموونـە و چ توانایەکیشـی تێدا لاواز کـردون؟ ئایـا هاتنـی ئـەم هەمـوو ئامێرە زیرەکانـە و دروسـتبوونی ئـەو دونیـای دیگاتلییـە، کـە بەشـێکە لـە ئابووریـی مەعریفـەی نـوێ، چ کاریگەرییـەک جـێ دەهێڵێت لەسـەر کۆمەڵگایـەک کـە کۆمەڵگایەکـی "بـەر لـە مەعریفە"یـە؟ ئـەم دۆخـە نوێیـە چـی لـە کولتـووری تەقلـدی و باڵادەسـتیی بەهـا و نۆرمەکانـی نـاو ئـەو کۆمەڵگایـە دەکات؟ ئـەو ئەگـەرە کۆمەڵایەتییانـە کامانـەن کـە دەیانکەنـەوە و ئـەو مەترسـی و ڕیسـکانەش چین کە لەگـەڵ خۆیاندا دەیهێنن؟ ئایـا ئـەم دونیا دیگیتاڵییـە چ ڕۆڵێکـی بینیـوە لـە قووڵکردنـەوەی دابەشـکردنە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانی دونیـای ئێمـەدا؟ چ ڕۆڵێکی هەبووە لـە بەرهەمهێنانـی ڕق و بوغـزی فەرهەنگـی و کۆمەڵایەتیـدا؟ ئـەی چ ئەگەرێکـی کاری پێکەوەیـی و لەدایکبـوون و هێـز و گـروپ و سـتراتیژ و پلانـی نـوێ دەخەنـەوە؟ چ کاریگەرییـەک لـە سـەر بونیـادە گـەورە و سـەرەکییەکانی وەک بونیـادی کۆمەڵایەتـی و ئابـووری و سیاسـی بەجـێ دەهێڵـن؟ ڕۆڵـی ئەم دونیا دیگیتالییە لە دروسـتبوونی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسـی،

گوتاری سیاسیی نوێ، ڕوانینی تر بۆ کۆمەڵگا و سیاسەتدا چی بووە؟ ئەم تۆڕانە چۆن دەستکاریی مۆبیلزەکردنی مەدەنی و سیاسییان کردوە؟ چ زمانێکی سیاسیی نوێیان دروست کردوە و گەشەیان بە چ جۆرە ڕیتۆریکێکی سیاسیی داوە؟ ئەم دونیا دیگیتالییە چ کاریگەرییەکی لەسەر شێوازی هاریکاریی کۆمەلایەتی و سیاسی هەبووە؟ کام مەسەلەی کۆمەلایەتی و سیاسییان بە سەرەکیی کردوە و کامیان بە لاوەکی؟ چ جۆرە بکەرێکی کۆمەلایەتی و سیاسیی نوێیان دروست کردوە و چ جۆرە بکەرێکیان پەراوێز خستوە؟ ئەم تۆڕانە چ جۆرە هیرارکیەتێکیان شکاندوە و چ فۆرمێک لە هیرارکیەتی نوێیان دروست کردوە؟ پەیوەندیی نێوان ئەم دونیا دیگیتالییە و نارسیزمی تاکەکەسی و کۆمەلایەتی چۆنە و چییە؟ چ ڕۆڵێک دەبین لە کردەی بەتاکەکەسبوون و دروستبوونی گروپی فانتازیاکراوی نوێدا؟ گشتیتر بپرسین: ئایا ئەم دونیا دیگیتاڵییە چ جۆرە بکەرێکی فەرهەنگی و کۆمەلایەتی و هونەری و میدیاییی دروست کردوە؟ چەندە ڕووبەری دیموکراسییبوون و بەشبەشکردنی هەقیقەتی گەورەتر کردوە؟ تا چەند ئەو پەردەی تەقدیس و پیرۆزبوونە تەقلیدییانەی شکاندوە کە بەسەر بکەرە دینی و کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکاندا دەدرێن؟ چەند قەیرانی بۆ دەسەلاتی "خەبیر"ەکان دروست کردوە؟ تا چەند دەسەلاتی ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و بەرهەمهێنەرانی تری دەسەلاتی ڕەمزیی تەحەدا کردوە؟ چ جۆرە موقەدەسێکیان شکاندوە و چ جۆرە موقەدەسێکی نوێیان دروست کردوە؟

بە بۆچوونی من هەر سۆسیۆلۆژیایەک بیەوێت دەرگیر

بێت لەگەڵ ئەم دونیا دیگیتالی و ئەم ئامێرە تازانەدا، پێویستە سەرقاڵی ئەو پرسیارانە بێت. دونیای ئێمە لە هەموو ئەو ئاستانەدا لەبەردەم کردە و گۆڕانێکی گەورە و هەمەلایەندایە و هەموویان پێویستیان بە خوێندنەوەی نوێ هەیە. لەم ئاستەدا دروستبوونی ئەم دونیا دیگیتالییە شەپازلەیەکی گەورەیە لە ڕووی سەرجەمی ئەو شێوازانەی بیرکردنەوە تەمبەڵانەی کە پێیان وایە دونیای ئێمە سەدەها ساڵە نەگۆڕاوە و سەدەها ساڵە خۆی و بونیادە گریمانکراوەکانی دووبارە و سەدبارە دەکاتەوە.

**لەودیوی تەکنۆفۆبیاوە**

بەلام بۆ ئەوەی لە ڕۆڵی ئەو دونیا دیگیتالییە و لە ڕۆڵی ئەو ئامێرانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسیی ئێمەدا تێبگەین و بۆ ئەوەی بتوانین دەرکەوت و کاریگەرییە جیاواز و تازەکانیان ببینین، ڕۆڵە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانیان بناسین، یەکەمین شتێک پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین و نەکەوینە ناویەوە: نەخۆشیی "تەکنۆفۆبیا"یە. تەکنۆفۆبیا بە مانای ترسێکی نەخۆشانە لە تەکنۆلۆژیا، ترسێکی دەرونی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیی ناعەقلانی بەرامبەر بە تەکنۆلۆژیا بەگشتی و بەرامبەر بە ئامێرە تەکنۆلۆژییە تازانەکان، بەتایبەتی.

کە ئەمە دەڵێم دەزانم ترس لە تەکنۆلۆژیا بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی تەکنۆلۆژیا خۆی، هەمیشە کەسانی تایبەت و هێزی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو هەبوون و هەن کە ڕۆحیان لە تەکنۆلۆژیا و تازەبوونەوەکانی چووە. لە

سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا لە سەدەی شازدەهەمەوە تا ئەمڕۆ ئەم ترسە بەردەوامە و لە قۆناغی جیاوازدا شێوازی جیاواز گرتۆتە خۆی. ئامێرە تەکنۆلۆژییەکانی سەرەتا ئەو ئامێرانە بوون کە دەیانتوانی کاری کرێکارە نەخوێندەوارەکان ئەنجام بدەن، ئەو کارانەی پێویستیان بە خوێندەواری و شارەزایی نەبوو، بەڵکو پێویستیان بە هێزی بازوو هەبوو. ئەوەی یەکەمی ئەوانەی لە ئامێرە تەکنۆلۆژییەکان دەترسان ئەم کەسانە بوون کە نەخوێندەوار و سەر بە چینەکانی خوارەوە کۆمەڵگا بوون، چونکە ئەو ئامێرانە هەڕەشە بوون لە کارەکانی ئەوان و دەیانتوانی بێکار و بێبژێویان بکەن. هەر لە سەدەی شازدەهەمدا کەسانێک هەبوون کەوتنە شکاندنی ئامێرەکان، بەڵام هیچ لایەنێک وەک بزوتنەوەی لۆدیەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، ناویان نەچووە ناو مێژووەوە وەک بزوتنەوەیەکی دژ بە تەکنۆلۆژیا و شکێنەری ئامێرەکان. نێد لۆد کرێکارێک بوو لە شاری پێرمەنگەهام پەلاماری ئامێرەکانی دا و چەند دانەیەکی لێ شکاندن، ئەم پیاوە وەک ڕوبین هوودی دونیای مۆیرن دەناسرێت، بەڵام ڕۆبین هوودێک کە لەگەڵ ئامێرە تەکنۆلۆژییەکاندا لە جەنگدایە، نەک لەگەڵ مرۆڤەکاندا. کارل مارکس لە خوێندنەوەیدا بۆ بزوتنەوەی لۆدیەکان باس لەوە دەکات کە کرێکارەکانی ناو ئەو بزوتنەوەیە هۆشیاریی چینایەتییان پێ نەگەیشتبوو، ئەوان لەباتیی دژایەتیکردنی "خاوەن ئامێرەکان" دژایەتیی ئامێرەکانیان دەکرد (Hobsbawm 2009)

## رۆمانسیەت و تەکنۆلۆژیا

لەگەڵ لەدایکبوونی بزوتنەوەی ڕۆمانسیەتدا ترس لە ئامێر و تەکنۆلۆژیا و لە خودی زانست خۆشی دەچێتە قۆناغێکی دیکەوە، ئەم ترسە پەیوەندییەکی گەورەی بە ترسی بەشێکی کۆمەڵگا مۆدێرنەکانەوە لە تەکنۆلۆژیا و ئامێر و لەدەستدانی سادەییەکانی ژیانەوە هەیە. لای ڕۆمانسییەکان ڕۆڵی خەیاڵ لە ڕۆڵی عەقڵ گرنگترە و ئەوەشی بە باشترین شێوە دەتوانێت جەوهەری عەقڵ بەرجەستە بکات، ئامێرە. لەم ڕوانینەدا عەقڵ یەکسانە بە ژیانێکی میکانیکی و خەیاڵ بە ژیانێکی ئۆرگانیکی، عەقڵ ماشینە و خەیاڵ ڕۆحانیەت و ئازادییە. بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دونیای مۆدێرن ئەم ترسە لە تەکنۆلۆژیا و ئەم حەز و نۆستالژیایە بۆ سەردەمە تێپەڕە سادەکانی تێدایە. لە سەدەی بیستەمیشدا ترس لە ئامێر و ترس لە بۆمبای ئەتۆمی و لە چەکی کۆکوژ و گازی ژەهراویی بەیەکدی تێکەڵ دەبن و ئەمانیش دێنە سەر ئەو کەلەپورە گەورەیەی ترس کە لە قۆناغەکانی پێشتردا هەبووە. ڕەنگە کەس هێندەی فەیەلەسوفی ئەڵمانی: مارتن هایدگەر، ئەم ترسەی مرۆڤی سەدەی بیستەمی لە تەکنۆلۆژیا بەرجەستە نەکردبێت. هایدگەر پێی وایە مرۆڤ لەم سەدەیەدا بە جۆرێک بووە بە بوونەوەرێکی تەکنۆلۆژی، کە توانای بینینی هیچ شتێکی لە هەقیقەتی خۆیدا نەماوە، ناتوانێت بوون وەک بوون ببینێت، بەڵکو تەنها لە ڕێگای تەکنۆلۆژیاوە دەتوانێت ببینێت، ئەمە هەم بۆ بینینی سروشت و هەم بۆ بینینی ئینسان خۆشی ڕاستە. بە مانایەکی دیکە مرۆڤی ئەم سەردەمە هەم سروشت و هەم مرۆڤەکانی

تر وەک کەرەستەیەکی خاو دەبینێت بۆ کۆمەڵێک پرۆسە و بەرخوردیی تەکنۆلۆژیی. بە مانایەکی دیکە مرۆڤی ئەم چەرخە لەلایەن تەکنۆلۆژیاوە بە جۆرێک کۆنترۆڵ کراوە کە توانای بینینی هیچ شتێکی لە دەرەوەی دەسەڵات و خواست و تواناکانی ئەو تەکنۆلۆژیایەدا نەماوە. مرۆڤی ئەم سەدەیە بە ڕادەیەک گیری بەدەست تەکنیک و عەقڵانیەتی تەکنیکییەوە خواردوە، مەگەر تەنها خودا مرۆڤایەتی ڕزگار بکات. سەبارەت بە دیدی هایدگەر بۆ تەکنۆلۆژیا بڕوانە: (Tijmes ١٩٩٢).

لە هەشتاکانی سەدەکەشدا بزوتنەوەی بەرگریکردن لە ژینگە لەدایک دەبێت، کە بەشێکی ئەم لەدایکبوونە پەیوەستە بە ترس لە تەکنۆلۆژیاوە. بەکورتی ترس لە تەکنۆلۆژیا بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی تەکنۆلۆژیا و لە مێژووی بیرکردنەوە لە تەکنۆلۆژیا. بێگومان بەشێکی ئەم ترسە تەواو ڕەوا و واقیعییە، ترسێکی بەرهەمهێنەر و سوودبەخشیشە، بەڵام لە کوێدا ئەم ترسە بوو بە فۆبیا و ئاکارێکی ناعەقڵانی و ڕۆمانسییانەی وەر گرت، ئیتر لەوە دەکەوێت ترسێکی ماقووڵ و مانادار بێت.

لە دونیای دیکیتاڵیی ئەمڕۆدا ئەم ترسە لە تەکنۆلۆژیا زیادی کردوە، کەمی نەکردوە، ترسی هەرە دیار ترسە لەوەی مرۆڤ ببێت بە ژێر تۆڕێکی زەبەلاح لە زانیارییەوە، کە نە توانای خوێندنەوەیانی هەبێت و نە توانای ڕێکخستن و نە توانای بەکارهێنانیان. لەدوای ئەمەش ترس لەوەی مرۆڤ ئاکارە کۆمەڵایەتییەکانی لەدەست بدات و ئامێر ببێتە هاوڕێ و دۆستی ژمارە یەکی و پێداویستیی بە کەسانی

تر بسڕێتەوە. ئەمانەش ترسی لەمرۆڤکەوتن و داخران بەڕووی دونیادا و ترسی لەدەستاندنی بەها ئەخلاقییەکان و لەدەستدانی ڕەسەنایەتی و دروستکردنی سەنەم و بتی نوێن. ئەمرۆکە هەموو ئەم ترسانە بە لەدایکبوونی نەوەیەکی نوێ لە ئامێری تەکنۆلۆژییەوە گرێ دراون و گرێ ئەدرێن. لە ڕاستیدا بەشێکی زۆری ئەم ترسانە کۆنن، بۆ نمونە، ترس لە زۆربوونی زانیاری و ونبوونی مرۆڤ لەژێریدا ترسێکی تازە نییە و هی سەردەمی دونیای ئەلکترۆنی و دیگیتاڵی نییە. زانایەکی سویسری بە ناوی کۆنراد گێسنەرەوە، Conrad Gessner، لە ساڵی ١٥٦٥ دا باس لە مەترسیی زۆربوونی زانیاری دەکات، بە جۆرێک ئینسان گەمارۆ بدات و نەتوانێت لێی دەر بچێت، هۆکاری ئەو ترسە لای ئەو داهێنانی چاپخانەیە کە ئەو پێی وا بوو زیانی زۆری بۆ تەندروستیی مرۆڤ دەبێت.[١] هەر ئەم مێژووییبوونە بڕێک لە ناعەقڵانیەتی ئەم ترسە نمایشدەکات، چونکە لە دونیای ئەمڕۆدا کەسێک نەماوە لە چاپخانە و بڵاوکردنەوەی کتێب بترسێت، مەگەر سەر بەم سەردەم و ڕۆژگارە نەبێت و لە ڕووی عەقڵییەوە لە سەدەی شازدەهەمدا بژی.

ترسی تازەی لە شێوزازی ترسی کۆپیکردنی مرۆڤ، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت "کلۆنین"، ترسی گۆڕانی ژیان بۆ "ماتریکس"، ترس لە "کۆیلەبوونی ناو سایبەرسپەیس"، ترسی بە "دیگیتاڵکردنی عەقڵ"، ترسی

---

١ بڕوانە:
(http://www.slate.com/articles/health_and_science/science/2010/02/dont_touch_that_dial.html)

"داگرتنی شوناس بۆ ناو عەقڵێکی کۆمپیوتەریی دروستکراو"، هتد... هەموو ئەمانە ئەمڕۆکە هەن و ئامادەن. کەسانێک هەن ئەم ترسانە بە ڕادەیەک گەورە دەبینن باس لە "قۆناغی دوای ئینسان"، قۆناغی "پۆست-ئینسان"، یان "کۆتایی ئینسان" دەکەن (Dinello 2005: 2).

بە بۆچوونی من بەشێکی زۆری ئەم جۆرە ترسە لە تەکنۆلۆژیا ترسێکی سایکۆلۆژی و ناعەقڵانییە و بەشێکی دیکەشیان بەشێکن لە حیکایەتێکی ئایدیۆلۆژی، کە ئەم ترسە بۆ بەرگریکردن لە وێنەیەکی تری دونیا دەخەنە گەڕ.

### ترس لە دونیای ئێمەدا

لە دونیای ئێمەدا ئەو شێوانەی سەرەوەی ترس کە باسکران بوونیان نییە، نە ترسی "کلۆنکردن" هەیە، نە ترسی "بەماتریکسکردنی دونیا" و نە ترسی "بەدیگیتاڵیکردنی عەقڵ"، هەروەها ئەو ترسە سەرەتاییانەش بوونی نییە کە ئامێر شوێنی ئیشکەرەکان بگرێتەوە، هاوکات ترسی جێگرتنەوەی دونیای دیگیتاڵ بۆ دونیای وایعیش هێشتا بەو خەستییەی لە شوێنانی تردا هەیە لای ئێمە لەئارادا نییە، هەر لە بنەڕەتیشەوە بەشی هەرەزۆری ئەم ترسانەش نەبوون بە بابەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا، کەچی هاوکات پرۆسەیەکی تایبەتی بەدەعاجانکردن و بەشەیتانیکردنی تەکنۆلۆژیا بوونی هەیە. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە: ئایا بنچینە و شێوازی سەرەکیی ئەم ترسە چییە؟ ئەگەر ئەم ترسە لە کۆمەڵگاکانی تردا ترس بێت لە تەسلیمکردنی ژیان و ئازادییەکان بە ماشێنە تەکنۆلۆژییە جیاوازەکان، ترس بێت لەوەی

تەکنۆلۆژیا کەینونەی مرۆڤ تێک بدات، ئەوا ترسەکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە پلەی یەکەم ترسێکی ئەخلاقی تەقلدییە، کە تیایدا زیاد لە هێزێک لەوە دەترسێت بەها ئەخلاقییە تەقلیدی و بالادەستەکان بشلەژێن و کۆتاییان پێ بێت و لەویشەوە پێگەی کۆمەلایەتی و ڕەمزیی ئەوان هەڕەشەی لێ بکرێت. ترسی دونیای ئێمە ئەوە نییە ئامێر کۆنترۆڵمان بکات، بەڵکو ئەوەیە ئەو ئامێرانە بەهای نوێ بهێنن کە بەها کۆن و بەموقەدەسکراوەکان تێک بدات.

کە ئەمە دەڵێم، نامەوێت نکوولّی لەوە بکەم کە ترسێکی تایبەت بەرامبەر بە ئامێر و بە تەکنۆلۆژیا لە دونیای ئێمەدا هەیە و ئەم ترسەش مێژوویەکی درێژی هەیە، لانی کەم ڕەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم. ئەم ترسەش ترسە لە تەکنۆلۆژیای جەنگ و سەربازی. لە چەک و تفاق و تۆپی سەرەتاییەوە بیگرە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا کۆتایی بە دەسەلاتی ئیمارەتە کوردییەکان دەهێنێت، تا ترسی هێرش و پەلاماری سەربازیی بەرفراوان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و لە سەردەمی جەنگەکەدا، تا بە ترسی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژی و چەکی ژەهراوی دەگات کە لە پەلامارەکانی ئەنفالدا دونیای ئێمە ڕووە هەرە تاریک و ترسناکەکانی لە فۆرمی جینۆسایدا ئەزموون کردوە. بە بۆچوونی من لە ڕووی مێژووییەوە ئەم ترسە سەربازییە لە ئامێر و تەکنۆلۆژیای جەنگ بالاترین فۆرمێکی ترس بووە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، ڕەنگە لە هەندێک قۆناغیشدا تاقە ترسێک بووبێت. هاوشان بەم ترسە سەربازییە، یان دوای ئەو و لەپاڵ ئەودا، ترسێکی دینییش لە ئامێر و تەکنۆلۆژیا

هەبووە کە پابەستی ترس بووە لە تێکچوونی بەها دینی و ئەخلاقییە باڵادەستەکان و جێگرتنەوەیان بە بەها و نۆرمی تر، کە پێگەی پیاوانی ئایین لە کۆمەڵگادا لاواز بکەن. ترس لە سینەما، ترس لە تەلەفیزیۆن، ترس لە ڕادیۆ، ترس لە ئامێرەکانی مۆسیقا، ترس لە کامێرا هتد... بەشێکن لەم ترسە دینییە کە لە قۆناغی جیاوازدا لە فۆرمی جیاوازدا لە دونیای ئێمەدا ئامادە بووە.

بە بۆچوونی من ڕەهەندێکی گرنگی ترسی ئەخلاقی لە تەکنۆلۆژیا لە دونیای ئێمەدا، ترسە لە دروستبوونی پەیوەندییەکی نوێ و کراوە لەنێوان نێر و مێدا. لەم ڕووەوە، بۆ نموونە، وەک چۆن پیاوانی ئایین و باوکانی تەقلیدی لە توانای ئەو پەیوەندییانە ئەترسن کە ئەم تەکنۆلۆژیایە لەنێوان نێر و مێ و گەورە و بچووک و دیندار و بێدیندا دروستی دەکات، ئاواش بڕێکی بەرچاو لە ڕۆشنبیران و خوێندەوارانیش ترسی ئەوەیان هەیە، بۆ نموونە ئەم شێوازە نوێیانە لە پەیوەندیی ئەلەکترۆنی کۆتایی بە "عەشق" بهێنێت. گوایە کاتێک کچ و کوڕی گەنجی ئەم وڵاتە کە نامەی ئەلکترۆنی، واتە "ئێس ئێم ئێس"، بۆ یەکتری دەنێرن، یان لە ژێرنووسی تەلەفیزیۆنەکاندا و لە ڕێگای میدیاکانەوە خۆشەویستیی خۆیان بۆ یەکتری بەیان دەکەن، ئەوا هێمایە بۆ نەمان و وێرانبوونی عەشقی ڕاستەقینە. لە دیدی ئەم تایپە لە ڕۆشنبیردا ئەمە "کۆتایی عەشق"ی ڕاستەقینە و "لەدەستدانی قووڵایی"یەکانی مرۆڤبوونە و جێگرتنەوەیانە بە "ئیحساسی سەتحی" و "ڕیکلامی میدیایی" و "خۆنماییشکردن" لە فەزای گشتیدا. ڕۆشنبیرانی تر هەن پێیان وایە شێوازە تازەکانی

تەکنۆلۆژیـای پەیوەندیکـردن "بەهـا ئەخلاقییەکانـی ڕێزگرتـن" وێـران دەکات و لەباتیـی ئـەوان ڕۆحـی "شـەڕانگێزی" و "حیقد" و "دووڕوویی" گەورە دەکات. لـەم ئاسـتەدا کۆمەڵگای ئێمـە شـاهێدی ئامادەگیی دوو جۆر گروپە، کـە هەردووکیـان لـە دوو دیـدگای جیـاوازەوە تەکنۆلۆژیـای پەیوەندیـی نـوێ تۆقاندوونـی. یەکەمیـان گروپـە دینییـەکان و پیاوانـی ئایینـن لـە وڵاتەکـەدا. دووهەمیـان بەشـێک لـەو ڕۆشـنبیرانەن کـە بـە نـاوی "ئەخلاقیاتـی ڕەسـەن" و هەسـتی "ئینسـانیی قـووڵ" و "مرۆڤبوونـی کامـڵ"ەوە ئەدوێـن و ئەنووسـن.

لەپاڵ ئەو ترسە ئەخلاقییەدا ترسێکی دیکە لە ئەمڕۆکەی دونیـای ئێمـەدا لـە تەکنۆلۆژیـای پەیوەندیـی نـوێ هەیـە، کـە بریتییە لـە تـرس لە تێکشکانی هەرمیەتە کۆمەڵایەتی و ڕەمزییە تەقلیدییـەکان. ئـەم تـۆڕە تازانـەی پەیوەنـدی، چونکـە تـۆڕی پەیوەندیی یەکسـەرە نین و ئینتەرئاکتیڤن، واتە پەیوەندییـەکان تیایدا دوولایەنـە و فرەجەمسـەرە، بۆیـە توانـای وەڵامدانـەوە و بەشـداریکردن بـە هەمـوو ئەوانـە ئەبەخشـن کـە لەسـەر هێڵـە ئەلەکترۆنییەکان ئامـادەن. کاتێـک نووسـەرێک لەسـەر لاپـەڕەی فەسـیبوکەکەی یـان لـە سـایتەکەی خۆیـدا نووسـینێک یـان ڕایـەک دەنووسـێت، ئـەودەم ژمارەیەکـی زۆر لـە خوێنـەران توانـای وەڵامدانـەوە و کاردانـەوەی ڕاسـتەوخۆیان هەیـە. دەشـێت هەندێک لـەم وەڵامانـە بـە دڵـی ئـەو نووسـەرە نەبێت کە نووسینەکەی نووسیوە. زۆر کـەس هـەن ئـەو کاردانەوانـە زۆر نێگەتیڤ دەنرخێنن و پێیـان وایـە ئـەم تەکنۆلۆژیا تازەیـە هەلـی بـە "گەمژەکان!"یـش بەخشـیوە بـۆ ئـەوەی بتوانـن "قسـە لـە قسـەی تـۆدا بکـەن"، یـان "قسـە لـە قسـەی کەسـانی تـردا بکـەن".

یەکێک لە دەرەنجامە پۆزەتیڤەکانی ئەم دۆخی ئینتەرئاکتیڤە ئەوەیە کە دەتوانێت بڕێک لە هەرمیەتە کۆمەڵایەتی و ڕەمزییە باڵادەستەکانی ناو کۆمەڵگا بشکێنێت، یان لانی کەم ڕێژەییان بکات و ڕەخنەیەکی بەردەوامیان لێ بگرێت. هەڵگرانی ئەم ترسە پێیان وایە ناکرێت هەموو کەسێک مافی قسەکردنی هەبێت، ئەم مافە تەنها هی ئەو نوخبە عارف و خوێندەوار و داهێنەرەیە کە ناشێت و نابێت کەس قسە لە قسەیاندا بکات و کەس ڕایەک لە ڕاکانیان موناقەشە بکات. ئەم تەکنۆلۆژیا تازەیە هەموو ئەوانە زویر دەکات کە پێیان وایە تەنها ئەوان مافی قسەکردنیان هەیە و تەنها ئەوان دەزانن کۆمەڵگا و پێویستیی بە چییە و تەنها ئەوان دەزانن مرۆڤ دەبێت چی بێت و چۆن بێت و چی نەبێت.

ترسێکی تر کە ئامادەیە، ترسی لەدایکبوونی جۆرێکی نوێیە لە شەرعیەت کە ماف و ئەگەر و ڕەوایەتی قسەکردن و ڕادەربڕین بە هەمووان دەبەخشێت، بە هەموو ڕەهەندە بریندارکەر و هێرشبەر و توندوتیژە ڕەمزییەکانی ئەم قسەکردن و ڕادەربڕینەوە، کە بێگومان تووڕەبوون و بێزاربوون و شڵەژانیشی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام بوونی ئەم شەرعیەتە هەمیشە لە نەبوون و کۆنترۆڵکردن و بێدەنگکردن باشتر و تەندروستترە. تەکنۆلۆژیای پەیوەندی توانا و ئەگەر و بوێریی ئەوە بە هەمووان دەبەخشێت قسە بکەن، دەشێت بەشێک لەم قسەکردنانە بریندارکەر بن، بەڵام قسەکردن لەم ئاستەدا هەمیشە لە هەموو میکانیزمەکانی بێدەنگکردن زیاتر خاوەنی شەرعیەتە.

ترسێکی تر کە ئەم تەکنۆلۆژیا تازانەی پەیوەندیکردن

دروستی دەکەن، ترسە لە ڕەخنە. ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییە تازانە توانا و ئەگەری ئەوە بە مرۆڤەکان و گروپەکان ئەبەخشن یەکتری ڕەخنە بکەن و لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و جووڵاندنەوەی یەکتری لەناو دونیادا قسە بکەن. ئەمەش دیسانەوە دەشێت مایەی بێزاربوون و ناڕەحەتی و شڵەژان بێت، بەڵام ڕووکارە پۆزەتیڤەکەی ئەوەیە کە بۆ هەمووان ئاشکرا دەبێت چی لە فیکر و خەیاڵی خەڵکدا هەیە و چ شێوازێک لە بەرخورد و تێفکرین ئامادەیە.

بەکورتی ترسە سەرەکییەکانی دونیای ئێمە لەم ئامێرانە لە قووڵاییدا ترسە لە ئەوی تر و لە ڕای تر و لە ڕوانینی تر، ترسە لە فۆرکەمانی تری مرۆڤبوون، ترسە لە تێکشکانی هیرارکیەتە کۆمەڵایەتی و ڕەمزییەکان، ترسە لە هاتنەکایەی ئەخلاقیاتی نوێ، ترسە لە ناو و ناوبانگ، واتە ترسە لە برینداربوونی سەرمایەی ڕەمزیی کەسەکان، کە بەسەریەکەوە دەتوانین کۆیان بکەینەوە و بڵێین لە قووڵاییاندا ترسە لە دیموکرسیەت لە مانا فراوانەکەیدا. دیموکراسیەت وەک دۆخی ئامادەگی و بیستنی ڕا و بۆچوون و خەون و خولیا و دیدگا و ڕوانینی جیاواز و ناکۆک بەیەکتری.

## هەندێک ڕوکاریی نێگەتیڤی تەکنۆلۆژیای پەیوەندیی

لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئینتەرنێت و سمارت فۆن و مۆبایل و دونیای دیگیتاڵیی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵێک کێشەی ڕاستەقینەیان دروست کردوە و دروست دەکەن، کە دەکرێت لێرەدا زۆر بەخێرایی لەسەر هەندێکیان بوەستین.

یەکەم، کێشەی ئیدمانبوون لەسەر ئینتەرنێت، ئیتر لە

ئیدمانبوون لەسەر یارییە زۆرەکانی ناو دونیای دیگیتاڵەوە بیگرە بۆ ئیدمانبوون لەسەر فەیسبووک. وەک هەر جۆرێک لە جۆرەکانی ئیدمانبوون، ئەم شێوازە لە ئیدمانبوونی دیگیتاڵی، کێشەی گەورە بۆ کەسە مودمینەکە خۆی و بۆ ئەو ژینگەیەش دروست دەکات کە تیایدا دەژی. ئیدی ئەو ژینگەیە دەشێت خێزان بێت، یان هەر شێوازێکی تری پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی، کە پێویستیی بە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی مرۆڤەکان بەیەکەوە هەبێت.

دووهەم، دروستکردنی چەندەها دەمامک و کەسایەتیی ساختە لەناو تۆڕەکانی دونیای دیگیتاڵدا. مرۆڤ دەتوانێت لەپشتی شاشەی کۆمپیوتەرەکەیەوە کەسایەتیی خۆی بگۆڕێت، ناوی تر و شوناسی تر و کەسایەتیی تر بۆ خۆی دروست بکات، بەو ناو و کەسایەتییە ساختەیەشەوە کێی بوێت و چۆنی بوێت کەسانی تر بەئاسانی بریندار بکات، کێشی نەویست بیسڕێتەوە و دیلیتی بکات، هتد...

سێهەم، گەورەکردنی مەوداکانی درۆکردن. هەمووان دەزانین کەسانێک هەن چەندەها ئەکاونت و لاپەڕەی جیاوازیان بە ناوی ترەوە کردۆتەوە و لەو لاپەڕانەدا یان مەدحی کەسایەتییە ڕاستەقینەکەی خۆیان دەکەن، یان پەلاماری ئەو کەسانە ئەدەن کە بە نەیاری خۆیانی دەزانن، یان ڕا و بۆچوونێک لەو ئەکاونتانەدا بڵاو دەکەنەوە کە ناوێرن لای خۆیان بڵاوی بکەنەوە.

چوارەم، بەهێزکردنی نارسیزم و کەسایەتیی سێلفی، بینینی دونیا وەک ئاوێنەیەک بۆ دەرکەوتنی خود خۆی بەتەنها.

پێنجەم، مەترسیی بۆ سەر نەمان و هاتنەژوورەوەی بێپرس بۆ ناو ژیانی شەخسیی کەسەکان و لەوێشەوە دەستدرێژکردنە سەر ئەو ژیانە شەخسییە.

شەشەم، دروستبوونی مەترسی بۆ سەر ژیانی کچان و ژنان بەتایبەتی کاتێک ئەو تەکنۆلۆژیای پەیوەندییە جۆرێک لە تەماس و پەیوەندی مەیسەر دەکات کە ڕوانینە ئەخلاقی و دینییە باڵادەستەکان وەک نەشیاو وێنای دەکەن.

حەوتەم، دروستکردنی جۆرێک لە خوێنەر و نووسەر و کاری فەرهەنگی و ڕۆشنبیریی سەتحی کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تاقە ڕووبەری خوێندنەوە و نووسینیانە. ڕاهێنانی ژمارەیەک لە خوێنەران لەسەر خوێندنەوەی کورت و تاقەتنەمان لە خوێندنەوەی جیددی و هێمن و لەسەرخۆ.

هەشتەم، ئەم تەکنۆلۆژیای پەیوەندییە لە دەستی هێزە سیاسی و دەسەڵاتدارەکاندا دەکرێت بگۆڕێت بۆ ئامرازێکی بەهێزی کۆنترۆڵ و چاودێری و دیسپلینکردن و دەشێت بە هۆیانەوە جاسووسی لەسەر ژیانی تایبەتی کەسانێکی زۆر بکرێت.

نۆهەم، کۆبوونەوەی ئەو بڕە زۆرە لەسەر زانیاری لە دەستی کۆمەڵێک کۆمپانیان و ناوەندی تایبەتدا وا دەکات ئەو کۆمپانیا و ناوەندانە دەسەڵاتێکی هێجگار گەورەیان هەبێت و بتوانن کاریگەریی زۆر گەورە لەسەر ژیانی ئینسانەکان بەجێ بهێڵن لە دەرەوەی ویست و خواستی خۆیاندا.

# سەرچاوەکان


Castells, M. (2000). The rise of the network society (2nd ed.). U.S.: Blackwell Publishing.

Chatfield,Tom (2012). How to thrive in the digital age. MacMillan.

Dinello, Daniel (2005). Technophobia!: Science Fiction Visions of Posthuman Technology. University of Texas Press.

Hobsbawm, Eric (2009). "'The Machine Breakers', Past and Present 1 (1952), 57–70". Libcom.org.

McLuhan,Marshall (1994). Understanding Media: The Extensions of Man. The MIT Press; Reprint edition (October 20, 1994)

P. Tijmes 91992). 'Martin Heidegger: techniek als metafysica', in: H. Achterhuis (red.), De maat van de techniek, Baarn.

# بەشی شەشەم

## کۆتاییی سیستمی خوێندن وەک سیستمێکی یەکسانخواز لە هەرێمدا

## لە گیتۆ کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ گیتۆکانی خوێندن

## کۆتاییی سیستمی خوێندن وەک سیستمێکی یەکسانخواز لە هەرێمدا

**سەرەتا**

بێدادی و نایەکسانی لە کۆمەڵگای ئێمەدا تەنها دیاردەیەکی حیزبیی سیاسی نییە، تەنها لەوەدا بەرجەستە نییە کە ئەندامانی ئەم یان ئەو خێزانی سیاسی و کادرانی ئەم یان ئەو پارتی سیاسی و کەسانی سەر بەم یان بەو ناوچەی دیاریکراو، مامەڵەیەکی تەواو تایبەت دەکرێن، کە هیچ شتێکی نایانبەستێتەوە بە مامەڵەکردنی کەسە سادەکانی دونیای ئێمەوە. دیاردەی بێدادی و نایەکسانی لە دنیای ئێمەدا تەنها دیاردەیەکی سیاسیی نییە، بەڵکو لە ئاستی زۆر قووڵتر و ترسناکتردا بەرهەم دەهێنرێت و گواستراوەتەوە بۆ ناو چۆنیەتیی ئیشکردنی دەزگا سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگا، لە پێش هەمووانیشەوە دەزگای قوتابخانە و سیستمی خوێندن و فێربوون لە کوردستاندا. بە درێژاییی مێژووی ئەم ناوچەیە و تا ساڵانێکی کەم لەمەوبەر یەکێک لە ئامراز و میکانیزمە سەرەکییەکانی دروستکردنی یەکسانی و کەمکردنەوەی بێدادیی کۆمەڵایەتی: سیستمی خوێندن و فێربوون بووە. قوتابخانەکان ئەو شوێنانە بوون کە هەلی جێگۆڕکێی چینایەتی

و بەرزبوونــەوە لــە هەرەمیەتـی کۆمەڵایەتییـان بەخشـیوە بـەو قوتابییانـەی سـەر بـە چینەکانی خـوارە بوون و سـەرکەوتووانە بوونەتـە خاوەنی بڕوانامـەی تایبـەت. لەنـاو سیسـتمی فێربوون و خوێندندا سـەرەتایەکی یەکسـان و جۆرێک لـە دادپەروەریی سـەرەتایی هەبـووە، کـە هەلـی گەشـەکردنی یەکسـانی بـە هەمـووان بەخشـیوە. لەنـاو پۆلەکانـی فێربـوودا منداڵـی خێزانـە دەوڵەمەنـدەکان و منداڵـی خێزانـە هـەژاران لەسـەر یـەک کورسـی دانیشـتوون و یـەک مامۆسـتا بـە یـەک زمانی هاوبـەش یـەک مەنهەجـی بـە هەمـووان گوتۆتـەوە. ئـەو منداڵانـەی توانـای فێربوونیـان زیاتـر بـوو، بـا لـە چینەکانـی خـوارەوەش هاتبـن، ئەوانـە ئەگـەر و هەلـی ئەوەیان لەبەردەمدا بـووە پێش بکەون و لـە منداڵـی خێزانـە دەوڵەمەندەکان زیاتـر بچنـە پێشـەوە. ئـەوەی ئەمـڕۆ لـە دونیـای ئێمـەدا بـە خێراییەکـی گـەورە ڕووی داوە وێرانبوونـی تەواوەتیـی سیسـتمی قوتابخانـە و فێربوونـە بـەو شـێوازەی کـە بتوانێـت لانـی کەمـی یەکسـانی و دادپـەروەری و لانـی کەمـی هەلـی یەکسـان بـۆ هەمـووان دەسـتەبەر بـکات. ئەگـەر بـە درێژاییـی مێـژوو سیسـتمی پـەروەردە و فێربـوون ئەگـەری دەسـکاریکردنی پێگـەی کۆمەڵایەتیـی قوتابییەکانـی لـە هەنـاوی خۆیانـدا هەڵگرتبێـت، بـۆ نموونـە کـوڕە هەژارێـک توانیبێتی لـە ڕێگای تەواوکردنێکی سـەرکەوتووانەی خوێندنەوە پێگـەی کۆمەڵایەتیـی خـۆی گۆڕیبێـت و بەسـەر هەژاریـدا سـەرکەوتبێت، ئـەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدات کۆتاییهاتنی سیسـتمی قوتابخانـە و فێربوونـە بـەو مانایـەی سـەرەوە. لـە هەرێمـی کوردسـتاندا دۆخێکـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی دروسـت کـراوە کـە قوتابخانـە ناتوانێـت ئـەو جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییـە دەسـتەبەر

بکات، کە لە قۆناغەکانی پێشتردا دەیکرد. ئەمەش وابەستەی ئەو گۆڕانکارییە وێرانکەرانەیە کە لەناو ئەم سیستەمەدا ڕوویان داوە و ئەو میکانیزمە تازانەیە کە لەناو سیستەمەکەدا چێنراون. بە بۆچوونی من ئەم گۆڕانە لە سیستەمی خوێندن و فێربووندا یەکێکە لە گۆڕانە هەرە نێگەتیڤ و وێرانکەرەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین.

**بیرۆکەی یەکسانی**

یەکێک لە بیرۆکە هەرە گرنگ و ئاڵۆزەکانی ناو فیکر و فەلسەفەی سیاسی، بیرۆکەی یەکسانییە، یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا. لە مێژووی دونیای مۆدێرندا زیاد لە ئایدیۆلۆژیایەک لەدایک دەبێت بەرگری لەم یەکسانییە دەکات، بۆ نموونە سۆسیالیستەکان، ئانارشیستەکان، سۆیسال دیموکراتەکان، کۆمۆنیستەکان، لیبرالە چەپەکان و زۆرانێکی دیکە. ئەگەرچی هەریەکێک لەمانە دیدێکی جیاوازی بۆ یەکسانی هەیە، بەلام لە هەموویاندا یەکسانی بنەمای هەرە سەرەکیی "دادپەروەریی کۆمەلایەتیی"ە، لەم ئایدیۆلۆژیانەدا ناکرێت باس لە دادپەروەریی کۆمەلایەتی بکەین و باس لە یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا نەکەین. پرسیاری سەرەکیی یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەلایەتییش، لە جەوهەردا، پرسیارە دەربارەی ئەوەی ئایا چۆن کۆمەڵگا ڕێک بخەین؟ چۆن پەیوەندییەکان و دەزگاکان و یاساکان و بەهاکانی ڕێک بخرێن بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی هێمن و ئاسایش و بەختەوەر دروست بکرێت؟

هەمووان دەزانین لە هیچ کۆمەڵگایەکی دونیادا مرۆڤەکان

لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە و لـە هەمـوو ئاسـتەکاندا بـە یەکتـری یەکسـان نیـن، کەسـانێک هـەن لەوانـی تـر دەوڵەمەندتـر و دەسـەڵاتدارتر و کاریگەرتـرن، چیـن و پێگـەی کۆمەڵایەتیـی جیاواز هـەن، شـێوازی جیاوازی دەوڵەمەندی و هـەژاری هـەن، ناوچـەی دەوڵەمەند و ناوچـەی هـەژار هـەن. بـە بۆچوونـی مـن پرسـیارەکە لـە بنەڕەتیشـەوە ئـەوە نییـە چـۆن مرۆڤـەکان لـە هەمـوو ئاسـتەکاندا بەیەکتری یەکسـان بـن و کـەس لـەوی تـر زیاتـر یـان کەمتری نەبێت. پرسـیارەکە ئەوە نییە هەمـوو دونیا، یـان هەمـوو کۆمەڵـگا، وەکـو یەکـی لـێ بکرێـت و مرۆڤـەکان هیـچ هیرارکـی و جیاوازییەکیـان لەنێوانـدا نەمێنێـت، پێـم وایـە ئـەم ڕووانینـە نـەک تەنهـا برێکـی گـەورە لـە خەونبینینێکـی یۆتۆپییانـەی تێدایە، بەڵکو دابەزاندنی ئـەم خەونـە بۆ نـاو واقیع لەنـاو مێـژووی مرۆڤایەتیـدا تـەواو کارەسـاتئامێز و خوێناویـی بـووە. بـە بۆچوونـی مـن پرسـیاری سـەرەکی ئەوەیـە، وەک جۆن ڕاوڵـز دەڵێت، چـۆن "سـەرەتای یەکسـان" بـۆ مرۆڤـەکان لەنـاو کۆمەڵـگادا دروسـت بکەیـن. چـۆن لـە کۆمەڵـگادا خاڵێک هەبێـت تیایـدا هەمـوو مرۆڤـەکان وەک "خاڵـی سـەرەتا" یـان "خاڵـی دەسـپێکردن" تیایدا بـە یەکتـری یەکسـان بـن و ئەگـەر نایەکسـانییش هەبێت لـە دوای ئـەو سـەرەتا یەکسـانەوە دەسـت پـێ بـکات (Voice 2011).

بـە مانایەکـی دیکـە مەسـەلەی یەکسـانی لـە بنەڕەتـەوە مەسـەلەی بوونـی یەکسانییەکی ڕەهـا نییـە لەنێوان مرۆڤەکاندا، بەڵکـو بوونـی سـەرەتا و خاڵـی دەسـپێکردنی یەکسـانە کـە تیایـدا کەسـەکان هەسـت بکـەن وەک یەکـن و لـە واقیعیشـدا وەک یـەک بـن. خاڵێکـی دیکـە کـە گرنگـە باسـی بکەیـن جـۆری

نایەکسانییەکانی ناو کۆمەڵگایە، چونکە نایەکسانییەکانیش یەک جۆر نین، بەڵکو هەمەجۆر و هەمەئاست و جیاوازن. پرسیاری سەرەکی ئەوە نییە چۆن کۆتایی بە هەموو نایەکسانییەکان بهێنین و بۆ هەتاهەتایە وا بکەین هەموومان لەگەڵ یەکدیدا یەکسان بین، بەڵکو ئەوەیە ئایا کۆمەڵگا چ جۆرە نایەکسانییەک قبووڵ بکات و تا کوێ و تا چەند لێگەڕێت نایەکسانییەکان هەبن و بڕۆن، لەکوێشدا پێویستە پرۆسەی دروستکردنی نایەکسانی بوەستێنرێت؟ بەکورتی کام بڕ و ڕادەی نایەکسانیی کۆمەڵایەتی قابیلی قبووڵکردنە، کامیشیان قابیلی قبووڵکردن نییە؟ ئایا نایەکسانی لەکوێدا لە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەوە دەگۆڕێت بۆ هەڕەشە و مەترسییەکی کۆمەڵایەتی و بوونی دەستەجەمعیی کۆمەڵگا دەخاتە مەترسییەوە؟ بە بۆچوونی من ئەمانە ئەو پرسیار و ڕوانینە سەرەکییانەن کە پێویستە لە پەیوەندییدا بە مەسەلەی یەکسانییەوە لەبەرچاویان بگرین.

**یەکسانی لەبەردەم دەزگاکاندا**

ئەوەی من دەمەوێت لێرەدا بەرگریی لێ بکەم ئەوەیە: یەکسانی مانای ئەوە نییە هەمووان هەمان مووچە وەر بگرن، کەس لە کەسی تر دەوڵەمەندتر و کاریگەرتر و خاوەن نفوزتر نەبێت، هەموومان توانای کڕین و پەیداکردنمان وەک یەک بێت. ئەم شێوازە لە یەکسانی نە لە مێژووی مرۆڤایەتی و نە لەمڕۆدا لە هیچ شوێنێکی دونیادا بوونی نییە. من سەروکاریشم لەگەڵ ئایینددەدا نییە بەو مانایەی پڕوپاگەندە بۆ چاوەڕوانییەک بکەم کە گوایە دوای سەد

سالّی تر، کەمەکێک زووتر یان دواتر، ئەو جۆرە یەکسانییە بەحەتمی هەر دروست دەبێت و هەمووان وەکو یەکیان لێ دێت. ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە بوونی یەکسانییە لە هەندێک هەلومەرجی سەرەکی و بنەڕەتیی ناو کۆمەڵگادا، کە بەبێ ئەوە بوونی کۆمەڵایەتی و فۆرمەکانی پێکەوەبوون دەکەونە ژێر مەترسیی زۆر گەورەوە. ئەو یەکسانییەی من بەگریی لێ دکەم، بۆ نموونە، باوەڕبوونە بەوەی کە پێویستە خەڵک یەکسان بن لەبەردەم و لە پەیوەندییاندا بە دەزگا سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگاوە، یەکسان بن لەبەردەم ئەو هەلومەرجە گشتییەدا کە هەموویان بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە و ئەو شتە دروست دەکات کە ناوی "ڕووبەری گشتی"، یان "ژیانی گشتی"یە. لە ئاستێک لە ئاستەکاندا ئەمە مانای ئەوەیە هەموو کەسێکی ناو ئەو ژیانە گشتییە "ئەگەر"ی پێشکەوتنی یەکسان و "ئەگەر"ی یەکسانی بەدەستهێنانی ژیانێکی باش و گونجاوی لەبەردەستدا بێت. ئەمەش دیسانەوە مانای ئەوە نییە دەرەنجامی بەگەڕخستنی ئەو ئەگەرانە وەک پرۆسەی کۆمەڵایەتی دەبێت بەحەتمی یەکسانیی لێ بکەوێتەوە، بە پێچەوانەوە ئەمە مانای ئەوەیە لە سەرەتای سەرەتاکاندا پێویستە ئەگەری یەکسان لەبەردەمی هەموو کەسەکاندا بێت، بەلام ئەوەی مرۆڤەکان دواتر چی لەم ئەگەرە یەکسانانە دەکەن و بە کوێ و بە چ دەرەنجامێکی دەگەیەنن، ئەمەیان مەسەلەیەکی دیکەیە. بۆ نموونە پێویستە هەموو منداڵێک ئەگەری یەکسانیی لەناو سیستمی خوێندن و پەروەردەدا لەبەردەمدا بێت، بەلام ئەو منداڵە دواتر لەناو پرۆسەی خوێندنا چی لەو ئەگەرانە دەکات و تا کوێ دەخوێنێت و چەند

لە خوێندنەکەیدا سەرکەوتوو دەبێت، ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە. یەکێکیش لەو دەزگا سەرەکییانەی کە پێویستە بەرجەستەکەری بیرۆکەی "سەرەتای یەکسان" و "بەخشینی ئەگەری یەکسان" بێت بە مرۆڤەکان، قوتابخانەیە. قوتابخانە پێویستە هەم دەزگایەکی یەکسانخواز بێت، هەم تواناسازیی یەکسان بە منداڵان ببەخشێت، هەم هەلی یەکسان بە هەموو ئەوانە ببەخشێت کە دەچنە ناویەوە. قوتابخانە یەکێکە لەو دەزگا کۆمەڵایەتییانەی کە پێویستە هەمووان لەناویدا و لە خاڵی دەستپێکردندا یەکسان بن، چینەکانی سەرەوە و چینەکانی خوارەوە، خەڵکی شار وخەڵکی لادێ، دیندار و بێدین، هەموویان دەبێت ئەگەری ئەوەیان هەبێت بەیەکسانی بچنە ناو سیستمی خوێندن و پەروەردەوە و دوای دەرچوونیش لە سیستمەکە هەمان ئەگەری گەشەکردنیان لەبەردەمدا بێت. قوتابخانە ئەو خاڵە سەرەتاییە یەکسانەیە کە کۆمەڵگا دەیخاتە بەردەمی هەموو ئەندامەکانیەوە. بەڵام با بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنێکی تەواوی ئەم بابەتە، با سەرەتا لەسەر خاڵێکی دیکە بوەستم کە گرنگە قسەی لەسەر بکەین، خاڵی پەیوەندیی نێوان چەمکی یەکسانی و چەمکی هاریکاری و ئازادی.

**هاریکاری و ئازادی**

هەمیشە کە باس لە چەمکی "یەکسانی" دەکرێت، ڕاستەوخۆ باس لە دوو چەمکی تریش دەکرێت کە دەچنە پاڵی و بەیەکەوە سیانەیەکی گرنگ پێک دەهێنن، ئەو دوو چەمکەش بریتین لە چەمکەکانی "ئازادی" و "هاریکاری". دواجار ئەوەی لە ژیانی

کۆمەلایەتیدا گرنگە: دروستکردنی کۆمەڵگایەکە ئەندامەکانی هەستی ئەوەیان تێدا بێت کە دەتوانن و دەیانەوێت پێکەوە و لەپاڵ یەکدا بە ئاسوودەیی و لە ئاسایشدا بژین. بەشی هەرە زۆری فیکری مۆدێرن، لە زۆربەی چاپە ئایدیۆلۆژییە جیاوازەکانیدا، بەرگرییەکی بەردەوامە لەم سێ چەمکە، بەلام بە پلە و ڕادەی جیاواز لە هەریەکێکیان. مەگەر تەنها ئەوانەی سەر بە "داروینیزمی کۆمەلایەتی"ن و کۆمەڵگا وەک جەنگەڵێک وێنا دەکەن، دژایەتیی ئەو سێ چەمکە سەرەکییەی ڕێکخستنی ژیان لەناو کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا بکەن. پرسیارە گرنگەکان لەم ئاستەدا بەم شێوەیەن: ئایا ئەگەر مرۆڤ ئازاد بێت چۆن دەتوانێت یەکسان بێت؟ ئایا ئازادی و یەکسانی لە ئاستێکی دیاریکراودا دژ بە یەکتری نین؟ ئەگەر مرۆڤ ئازادە، واتە ئازادیی ئەوەی هەیە هەموو ئەو شتانە بکات کە دەشێت قازانج و دەسکەوتەکانی زیاد بکات و بیکات بە کەسێکی نایەکسان لەگەڵ کەسەکانی دیکەدا. هەرچی مەسەلەی "هاریکاری"یشە دەشێت ناکۆک بێت بە هەردوو پرنسیپەکەی تر. ئەگەر مرۆڤەکان هەمووان وەک یەک بن، ئەودەم ڕەنگە مەسەلەی هاریکاریکردن مانایەکی نەمێنێتەوە؟ چونکە مادام هەمووان بەیەکتری یەکسانن ڕەنگە کەسانێک وا تێبگەن کە کەس پێویستیی بەوی تر نییە. هەمان شت لە پەیوەندیدا بە ئازادییەوە، ئایا ناشێت ئازادی ببێتە هۆی لاوازکردن یان نەهێشتنی هاریکاریی کۆمەلایەتی؟ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە بەشێکی گەورەی فیکر و فەلسەفەی سیاسیی مۆدێرنی سەرقاڵ کردوە و لێرەدا شوێنی

باسکردنیان نابێتەوە. ئەو خاڵەی من دەمەوێت بەرگریی لێ بکەم ئەوەیە کە هەموو کۆمەڵگایەک پێویستیی بە دۆزینەوەی هاوکێشەیەکی هاوسەنگە لەنێوان ئەو سێ چەمکەدا. هەموو کۆمەڵگایەک پێویستی بە یەکسانی هەیە، پێویستیی بە ئازادی هەیە و پێویستی بە هاریکاری و بەدەمەوەچوون هەیە. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە چۆن ئەم سیانە بەیەکەوە کۆ بکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین کۆمەڵگایەکمان هەبێت بە لانی هەرەکەمی بێدادیی کۆمەڵایەتییەوە، بە بڕێکی زۆری هاریکاری و بەدەمەوەچوونی کۆمەڵایەتی و بە ڕووبەرێکی گەورەوە بۆ ئازادی. لە کۆکردنەوەی ئەم سێ چەمکەدا بەیەکەوە، دیسانەوە سیستمی خوێندن و قوتابخانە ڕۆڵی گرنگ و سەرەکیی دەبینن. هەر سیستمێکی پەروەردەیی نەیتوانی ئەم سێ خواستە بەرهەم بهێنێت و دەستەبەر بکات، تەنها هێما بۆ فەشەلی خۆی وەک خوێندن و پەروەردەکردن ناکات، بەڵکو هێما بۆ کۆمەڵگایەکیش دەکاتە کە فاشیل بووە لەوەدا وەک کۆمەڵگایەک کار بکات بە لانی کەمی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و هاریکاری و ئازادی مرۆڤەکانیەوە.

**سیستمی خوێندن و نایەکسانی**

وەک وتم شتێک بە ناوی یەکسانیی ڕەهاوە لەناو هیچ سیستمێکی خوێندن و فێربووندا بوونی نییە، هەمیشە شێوازی جیاوازی نایەکسانی لەناو سیستمی خوێندن و فێربووندا ئامادەیە. بەڵام وەک لە سەرەتادا وتم شێوازەکانی نایەکسانی لەناو سیستمی خوێندن لە کوردستاندا هەموو سنوورێکی

تێپەڕاندوە و ئەو لانی کەمە لە ئەگەری پێشکەوتنی یەکسان کە جاران بوونی هەبوو ئێستا نەماوە و لە زۆربەی هەرەزۆری مندالآنی کوردستان سەندراوەتەوە. دابەشبوونە چینایەتییە ترسناکەکانی کۆمەڵگای دوای ڕاپەڕین، لەناو سیستمی خوێندن و فێربووندا و بە هۆی ئەم سیستمەوە سەرلەنوێ بەرهەم هێنراوەتەوە و داڕێژراوەتەوە. سیستمی خوێندن لەمڕۆکەی کوردستاندا هەر لەبەر دەرگای قوتابخانەکانەوە تا قۆناغی تەواوکردنی خوێندن، دابەشبوونە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکان بە زەقترین شێوە هەم بەرجەستە دەکات و هەم بەرهەمیشیان دەهێنێتەوە.

سەرەتا دابەشکردنی سیستمی خوێندن لە کوردستاندا بۆ "سیستمی حکومی" و "سیستمی ئەهلی" دونیایەک نایەکسانیی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە، کە درێژدانە بەو نایەکسانییانەی لەناو کۆمەڵگادا هەن، پاراستن و بەرهەمهێنانەوەی ئەو نایەکسانییانەی ناو کۆمەڵگایە لەناو سیستمی فێربوون و قوتابخانەکاندا. ئەم دابەشکردنە هەر لە سەرەتاوە بەرجستەکەری دابەشبوونی نێوان دەوڵەمەندان و کەمدەرامەتانی ناو کۆمەڵگایە. ئەوانەی پارەدار و دەوڵەمەندن منداڵەکانیان دەنێرنە قوتابخانە تایبەتەکان و ئەوانی تریش قوتابخانە حکومییەکان. بەر لە هەموو شتێک ئەم دابەشکردنە لە ڕۆژی یەکەمەوە منداڵە دەوڵەمەندەکان و منداڵە هەژارەکان لەیەکتری جیا دەکاتەوە و دەیانخاتە ناو دوو دونیای پەروەردەیی تەواو جیاوازەوە. بەمەش دوو دونیای تەریب بەیەکتری دروست دەکات، کە دوای تەواوکردنی قوتابخانەش لە هیچ ئاستێکدا بەیەکدی تێکەڵ نابن و یەکتری نابڕن.

زۆرینەی ئەوانەی لە قوتابخانە ئەهلی و تایبەتەکاندا دەخوێنن، دواتر دەچن بۆ زانکۆ تایبەتەکان و لەوێدا دەخوێنن و درێژە بە نایەکسانییەکانی ناو سیستمی خوێندن و پەروەردە دەدەن. لە کاتی خوێندن و دوای خوێندیش ئەو "ڕووبەرە گشتییە" نوخبەوییە لەیەکتریان جیا دەکاتەوە و ناهێڵێت لانی کەمی ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی دروست ببێت. (بڕوانە ئەو بەشەی ئەم کتێبە کە باس لە ڕووبەری گشتیی نوخبەوی دەکات)

خوێندنی ناو قوتابخانە ئەهلی و تایبەتەکان تەواو جیاوازە لە خوێندنی ناو قوتابخانە حکومییەکان و منداڵان لە قوتابخانە ئەهلییەکاندا هەم زمانە بیانییەکان فێر دەبن و هەم مامۆستای تایبەتیان هەیە وانەیان پێ دەڵێنەوە، هەم کەش و فەزای ناو پۆلەکانیان تەواو تایبەت و جیاوازە. لەم گشتەدا "هەبیتۆس"ێکی کۆمەڵایەتی ئامادەیە کە "هەبیتۆس"ی چینەکانی سەرەوەیە و هەموو سیستمە پەروەردەییە تایبەتەکەش دەبێتە هەڵگری ئەو هەبیتۆسە.[1] بۆیە هەر لە خاڵی سەرەتاوە و لە ڕێگای جیاکردنەوەی

---

١ چەمکی "هەبیتوس" یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو سۆسیۆلۆژیای پیار بۆردیۆ و لە ڕاستییشدا یەکێکە لە چەمکە هەرەناڵۆزەکانی. مەبەست لە هەبیتوس بوونی جۆرێک لە مەیل و توانا و ئاکار و ڕوانین و چێژی تایبەتە کە بە هۆیانەوە تاکەکەس وێنای دونیای کۆمەڵایەتی دەکات. ئەم شتانە بوون بە بەشێک لە جەستەی تاکەکەس و پێشوەخت و بە هۆی پێگەی چینایەتییەوە لەناو ئەو جەستەیەدا چێنراوە. ئەمانەش وا دەکەن پەیوەندییەکی تایبەتی بەو ژینگە کۆمەڵایەتییانەوە هەبێت کە دەچێتە ناویان. بە کورتییەکەی هەبیتوسی خەڵکی گەڕەکە هەژارەکان و خەڵکی گەڕەکە دەوڵەمەندەکان لەیەک جیایە و ئەم جیاوازییەش دەگوازرێتەوە بۆ ناو سەرجەم ژینگە و ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکانی تر. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ( Lizardo 2004)

سیستمی قوتابخانەکانەوە لەیەکتری، نایەکسانی و بێدادییەکی گەورە دروست دەبێت یەکەمین شتێک کە وێرانی دەکات ئەو "سەرەتا یەکسانە"یە کە باسمان کرد، سەرەتایەک کە کاری ژمارەیەکی قوتابخانە ئەوەیە بۆ هەموو مندالانی ولاتەکە دەستەبەری بکات. هەموو ئەو مندالانەی لە کوردستاندا ناتوانن بچنە قوتابخانە ئەهلی و تایبەتەکانەوە، هەلی فێربوون و پێشکەوتنیان لە ژیاندا تەواو کەمتر و لاوازترە لەوانەی لەو قوتابخانانەدا دەخوێنن. ئەو زمانانە فێر نابن کە مندالانی ناو ئەو قوتابخانانە فێریان دەبن و ئەو شێوازە مامەلەیەیان ناکرێت کە لەو قوتابخانانەدا دەکرێن و ئەو ڕوانینەیان تیا دروست ناکرێت بەرامبەر بە دونیا کە لەو قوتابخانانەدا دروست دەکرێن.

ئەم دۆخە نایەکسان و پڕ هەلاوێردیە دەرەنجامی ئەوە ڕاستیەیە کە سیستمی فێربوون لە کوردستاندا کراوە بە بزنس و بازاڕ و لۆژیکی بزانس و بازاڕ لەناو ئەم بەشە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەی لە ژیانی کۆمەلایەتیدا دەستبەکارە. قوتابخانە تایبەتەکان هەم خۆیان پرۆژەی ئابوورییین و هەم ئەو مندالانەی دەچنە ناوییەوە تەماحێکی ئابووریی گەورە، کە تەماحی چینە دەولەمەندەکانی هەرێمە، دەیناباتە ناو ئەو قوتابخانانەوە. بەلام ئەم بەبازاڕکردنەی خوێندن تەنها یارییەکی ئابووریی نییە و مەبەست لێی بەتەنها بەدەستهێنانی قازانجی ڕاستەوخۆ نییە، بەلکو بەشێکی سەرەکیی ستراتیژیەتی ئەو هێز و گروپە کۆمەلایەتییە دەسەلاتدارانەیە، کە میکانیزمەکانی بەرهەمهێنانەوەی پێگە کۆمەلایەتی و پێگەکانی دەسەلاتداربوونیان دەگوازنەوە بۆ ناو سەرەتای

هەرە سەرەتاکان: واتە بۆ ناو سیستمی خوێندن و فێربوونی منداڵان لە کوردستاندا و لەم ڕێگایەشەوە دونیای خۆیان بەتەواوی لە دونیای بەشە هەژار و نەدارەکەی دانیشتووانی هەرێم جیا بکەنەوە.

نایەکسانییەکان دواتر بۆ ناو زانکۆکانیش دەگوازرێتەوە، بێگومان لە ڕێگای ئەوەوە نا یەکێک دەبێتە دەرچووی کۆلێژی پزیشکی و یەکێکی دی دەرچووی کۆلێژی ئاداب، بەڵکو بەوەی یەکێکیان دەبێتە دەرچووی زانکۆیەکی ئەهلی و ئەوی تریان دەرچووی زانکۆیەکی حوکمی. یەکێک لە زانکۆی ئەمریکی لە سلێمانی خوێندویەتی و یەکێکی تر لە زانکۆی ڕاپەڕین. لە هەموو ڕوویەکیشەوە دونیای ئەم دوو زانکۆیە لەیەکتری جیاوازن و دەرچووانی زانکۆی ڕاپەڕین ئەو هەلی پێشکەوتنە کۆمەلایەتییەیان لەبەردەستدا نییە کە لەبەردەمی خوێندکارێکی زانکۆی ئەمریکیدایە. وەک وتم جیاوازییەکە لە قۆناغەکانی پێشتری ناو سیستمی فرێبوونەوە دەست پێ دەکات، لەو دابەشکردنەوە کە لەنێوان قوتابخانە ئەهلیەکان و قوتابخانە حکومیەکاندا دەکرێت. وەک وتم لە قوتابخانە ئەهلیی و تایبەتەکاندا منداڵان زمانە بێگانەکان، بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و تورکی دەخوێنن و گرنگیی زیاتر بە گەشەی منداڵەکان ئەدرێت، لە بەرامبەردا قوتابخانە حکومییەکان لە هەموو ڕوویەکەوە لەپاش ئەو قوتابخانە ئەهلییانەوەن. ئەم قوتابخانە ئەهلییانە هەم ژینگە تەندروستییەکەیان پاکتر و باشترە، هەم پۆلەکانیان قوتابیی کەمتری تێدایە و قەرەباڵغ نییە، هەم مامۆستاکانیان ئاستێکی بەرزتریان هەیە و هەم فۆرم و شێوازی دەرسگوتنەوە تیایاندا جیاوازە.

## نایەکسانییەکی زۆر تایبەت

ئەم شێوازە لە نایەکسانی لە سیستمی خوێندن لە کوردستاندا زۆر جیاوازە لەو جۆرانە لە نایەکسانی کە، بۆ نموونە، پیار بۆردیۆ لە سیستمی خوێندنی ناو قوتابخانەکانی فەرەنسادا باسیان دەکات. جیاوازییەکانی ناو کوردستان سیستمەکە دەکات بە دوو بەشی تەواو جیاوازی بێپەیوەندییەوە و بەشێکیان هەموو ئەگەرەکانی پێشکەوتن و قەڵەوبوونی کۆمەڵایەتی بۆ منالانی چینەکانی سەرەوە دەستەبەر دەکات، لەسەر حیسابی بەشەکەی تریان کە تیایدا زۆربەی دەرگاکانی ئێستا و ئایندە بە ڕووی ئەو منالانەدا داخراوە کە تیایاندا دەخوێنن و فێر دەبن. پیار بۆردیۆ لە زیاد لە لێکۆڵینەوەیەکدا سەبارەت بە سیستمی خوێندن لە فەرەنسادا کە باس لە قوتابخانە حکومییەکان دەکات، ئەویش باس لە نەبوونی "سەرەتای یەکسان" دەکات، بەلام سەرەتایەک جیاواز لەوەی لە کوردستاندا هەیە. بۆردیۆ باس لەوە دەکات کە سەرەتای یەکەم لەناو پۆلی خوێندن لە قوتابخانەکانی فەرەنسادا سەرەتایەکی نایەکسانە و بەشێکی زۆر لە جیاوازییە چینایەتییەکان لەناو پۆلەکانی خوێندندا بەرهەم دەهێنرێنەوە. بۆ نموونە بۆردیۆ باس لەو زمانە بالادەستە دەکات کە لە پۆلەکانی خوێندندا قسەی پێ دەکرێت و تێکستەکانی پێ نووسراوە، بۆردیۆ دەڵێت ئەم زمانە زمانی چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگای فەرەنسییە. بۆیە منداڵێکی سەر بە چینی ناوەڕاست لە پۆلەکەدا زۆر لەپێشترە لە منداڵی کرێکارێک کە زمانی

پۆلەکە لە زمانی قسەکردنی دایک و باوکی ئەو ناچێت. جگە لەم جیاوازییە بۆردیۆ چەمکی "سەرمایەی کولتووری" بەکار دەهێنێت بۆ نیشاندانی ئەو ڕاستییەی کە منداڵێکی سەر بە چینەکانی سەرەوە، هەڵگری سەرمایەیەکی کولتووریی گەورەترە لە منداڵێک سەر بە چینەکانی خوارەوە، لە کاتێکدا هەردووکیان لەناو هەمان پۆلدا ئامادەن. مەبەست لە "سەرمایەی کولتووری" سەرجەمی ئەو کۆدە ئیستاتیکی و فەرهەنگییانەیە کە منداڵان لە خێزانەکانیانەوە وەری دەگرن و لەگەڵ خۆیاندا دەیبەنە ناو پۆلەکانەوە. ئەمەش، وەک بۆردیۆ بەرجەستەی دەکات، نیشانمان ئەدات کە پۆلەکان لە سەرەتای سەرەتاکانەوە ڕووبەرێکی بێلایەن و بێجیاوازی نین، بەڵکو چەندان جیاوازییان تێدایە، چ لە ئاستی زمانی پەروەردە و فێرکردنەکەدا، چ لەو سەرمایە کولتوورییەدا کە منداڵەکان لەناو خێزانەکانیانەوە هێناویانە. بەکورتی لای بۆردیۆ پۆلی خوێندن شوێنێکە شێوازی جیاوازی "توندوتیژیی ڕەمزی"ی تێدایە. (Bourdieu, P. & Psseron, J.C. ١٩٩٠)

بێگومان ئەم تێزانەی بۆردیۆ تێزی گرنگ و سەرکین بۆ هەر سۆسیۆلۆژیایەک خۆی بە مەسەلەی پەروەردە و فرێبوونەوە سەرقاڵ بکات، بەڵام وەک نیشانم دا، کێشەکە لە کوردستاندا ئەوە نییە لە پۆلەکاندا بە زمانێک وانە دەگوترێتەوە کە زمانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگایە، یان سەرمایەی کولتووریی منداڵەکان لەناو پۆلەکاندا یەکسان نییە، واتە کێشەکە لە کوردستاندا کێشەی بوونی ئەو شێوازە لە جیاوازی لەناو پۆلەکانی خوێندندا نییە. لە کوردستاندا

کێشـەکە ئەوەیە ئەسڵەن پۆلـەکان و قوتابخانـەکان لـە هەنگاوی یەکەمـەوە لەیەکتـری جیـا کراونەتـەوە، لەتبوونێکـی شـاقوولیی سیستمی خوێندن و پەروەردەی بۆ دوو بەشـی جیاواز دابەش کردوە، کـە بەشـێکیان لـەوی تریـان کەمبایەختر و بێئابییندەترە. بـە مانایەکـی دیکـە نایەکسـانی و نەبوونـی دادپـەروەری لـە سیسـتمی خوێنـدن لـە کوردسـتاندا تەنهـا لـەو شـوێنانەدا نییـە کە بۆردیۆ باسـی دەکات، بەڵکو فۆرمـی نوێی وەر گرتـوە، کـە ڕەنگـە هـەرە بەرچاوترینیـان فۆرمـی جیاکردنـەوە و دابڕاندنـی منداڵانـی چینەکانی سـەرەوەیە لـە منداڵانـی چینەکانـی خـوارەوە، کۆکردنـەوەی هەریەکێکیـان لەنـاو سیسـتمی جیـاوازی فێربـوون و لەنـاو قوتابخانـەی جیـاوازدا. هـەر لـە سـەرەتاوە منداڵـی چینـە دەوڵەمەندەکانـی کوردسـتان لەگـەڵ منداڵانـی چینەکانـی خـوارەوە ناچنـە نـاو یـەک پـۆل، لـە یـەک قوتابخانـەدا ناخوێنن، لەنـاو ڕووبەرێکـی هاوبەشـدا پێکـەوە نیـن، بـە یـەک زمـان ناخوێنـن، یـەک جـۆر مامۆسـتا وانەیـان پـێ ناڵێتـەوە، نەخشـەی ناوەکیـی پۆلەکانیـان لەیـەک ناچێـت، هتـد... لـە هەمـوو ئـەم دۆخانەشـدا قوتابخانـە وەک دەزگای دابینکردنـی "سـەرەتایەکی یەکسـان" بـۆ هەمـوو منداڵانـی هەرێـم بەبـێ هیـچ داپۆشـین و پەردەپۆشـییەک، گـۆڕاوە بـۆ ئامـرازی درێـژەدان بـەو دۆخـی نایەکسـانی و جیاوازییـە چینایەتییـە گەورانـەی لـە دەرەوەی سیسـتمی خوێندنـدا لـە کۆمـەگای ئێمـەدا دروسـت بـووە. بەمەش یەکێـک لـە دەزگا هـەرە سـەرەکییەکانی بەخشـینی "هەلـی یەکسـان" و "ئەگـەری یەکسـان" بـە منـداڵان لـە کوردسـتاندا وێـران کـراوە.

**لە گیتۆ کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ گیتۆکانی خوێندن**

مـن تـا ئێسـتا لـە زیـاد لـە نووسـینێکدا باسـم لـە پرۆسـەی بەگیتۆکردنـی ژیانـی کۆمەڵایەتـی لـە کوردسـتاندا کـردوە و ئـەو خاڵـەم شـی کردۆتـەوە، کـە چـۆن چینەکانـی سـەرەوەی نـاو دونیـای دوای ڕاپەڕیـن، بەتایبەتـی نوخبـە دەسـەڵاتدار و دەوڵەمەندەکـە، دونیایەکـی تەریـب و کۆمەڵگایەکـی تەریـب و ژیانێکـی تەریبیـان بـۆ خۆیـان لەنـاو هەرێمـدا دروسـت کـردوە، کـە هیـچ شـتێک نایانباتـەوە نـاو گشـتێتیی ژیانـی کۆمەڵایەتـی و نـاو دونیـای کەسـە ئاسـاییەکانی کۆمەڵـگای ئێمـە. شـارە گەورەکانـی کوردسـتان بەکـردەوە بـوون بـە شـاری چەنـدان گیتـۆی کۆمەڵایەتـی و ڕووبـەری تایبـەت و داخـراو و پارێـزراو لـە ڕێگای پاسـەوانەوە. شـوێنی نیشـتەجێبوونی ئـەم نوخبەیـە و شـوێنی حەسـانەوە و جێگـەی بەیەکدیگەیشـتنیان تـەواو تایبـەت و داخـراوە و بـە زۆر مانـا لـە دەرەوەی کۆمەڵگاکەدایـە. یەکـەم شـت ئـەم پرۆسـەی بەگیتۆکردنـەی ژیانـی کۆمەڵایەتـی وێرانـی دەکات ئـەو هەسـتەیە کـە ئـەو کۆمەڵگایـە ژیانێکـی "گشـتی" و "هاوبـەش"ی هەیـە. کـە گروپـەکان خەمـی هاوبەشـیان هەیـە و بەیەکترییـەوە پەیوەسـتن و "هاریکاریـی کۆمەڵایەتـی" یەکێکـە لـە میکانیزمەکانـی بەیەکەوەگرێدانـی بەشـە جیاوازەکانـی ئـەو کۆمەڵگایـە. بەگیتۆکردنی کۆمەڵـگا لـە زۆر سـەرەوە کۆتاییهێنانە بـە زۆربـەی هـەرە زۆری "هاوبەشـە کۆمەڵایەتییـەکان" و لەناویانـدا کۆتاییهێنانـە بـە "هاریکاریـی کۆمەڵایەتـی" لەنێـوان تاکەکەس و گروپە جیاوازەکاندا و گرێدانـەوەی هـەر یەکێکیانـە بە دونیای ناوەکیی گیتۆ تایبەتەکانی خۆیانەوە و پاشەکشێیانە

بۆ ناو ئەو گێتۆیانە. وەک لە چەند نووسینێکی دیکەدا باسم کردوە، ئەم "پرۆسەی بەگێتۆکردن"ە و دروستکردنی ئەو دونیا دابڕاو و تەریبانە لەناو یەک کۆمەڵگادا، بەردەوام پێویستی بە پاراستن هەیە و ئاساییشی گێتۆکانیش بەشێک نییە لە ئاساییشی گشتیی کۆمەڵگا. ئەمە وای کردوە "پاسەوان" ببێت بە یەکێک لەو بوونەوەرە تازانەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست دەبێت و دەبێتە بەشێکی بەرچاوی ناو نەخشەی تازەی شارەکانی کوردستان. لەدایکبوونی پاسەوان وەک کەس و پاسەوانییکردن وەک شێوازی جیاوازی دابڕین و کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی کۆمەڵایەتی، دیاردەیەکی تەواو نوێی دونیای دوای ڕاپەڕینە. پاسەوان جاران کەسێک بوو دەزگا و فەرمانگە فەرمییەکانی دەوڵەتی دەپاراست، بەڵام لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا ئەم بوونەوەرە ماڵەکان و قوتابخانەکان و گێتۆکان و کەسایەتییەکان دەپارێزێت، واتە بەشێک لە کۆمەڵگا بەرامبەر بە بەشەکانی تری کۆمەڵگا دەپارێزێت. دیاردەی دروستکردنی دیوار و شوورا بەدەوری گەڕەکە دەوڵەمەند و تازەکاندا، بەدەوری ئەو گێتۆیانەدا کە دروست دەکرێن، بەشێکی سەرەکیی هەندەسەی ئەو بەشە تازانەی شارەکانە کە نوخبە دەوڵەمەندەکەی دوای ڕاپەڕین بۆ خۆیان دروستیان کردوە. پاسەوان بەشێکی جەوهەری و سەرەکیی ناو ئەو فۆرمە تایبەتەی بەشاربوون و تازەبوونەوەیە کە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دێتە کایەوە، فۆرمێک زۆر شت تیایدا دەبێت بە گێتۆ، لە گەڕەک و شاری خەونەکانەوە بۆ سیستمی خوێندن و فێربوون.

درێژەدان و گواستنەوەی لۆژیکی گیتۆبوونی کۆمەڵایەتییە بۆ ناو سیستمی خوێندن و پەروەردە. ئەگەر پێشتر بەگیتۆبوونی کۆمەڵایەتیی خێزانە دەوڵەمەند و گروپە پارەدارەکانی هەرێم خۆیان لە سەرجەمی کۆمەڵگا جیا کردبێتەوە وماڵی ناو گیتۆ تازەکانیان لە ماڵەکانی تری ناو شارەکان دابڕیبێت، لە ڕێگای دروستکردنی شوورا و دیوار و پاسەوان و کامێرای کۆنترۆڵ و چاودێرییشەوە گیتۆکانیان پاراستبێت، ئەوا یەکێک لە ئیشە سەرەکییەکانی سیستمی خوێندنی تایبەت و ئەهلی لە هەرێمدا ئەوەیە منداڵەکانی ئەم نوخبە دەوڵەمەندە لە منداڵانی تری وڵاتەکە جیا بکاتەوە. وەک چۆن یەکێک لە کارە سەرەکییەکانی دروستکردنی ئەو "ڕووبەرە گشتیی"ە نوخبەوییە تازەیەی لە هەرێمدا دروست بووە، جیاکردنەوەی هەمان دوو بەشی کۆمەڵگایە لەیەکتر، لەناو فەزا کراوەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا.

بە جیاکردنەوەی قوتابخانەکان و سیستمی فێرکردن لەیەکتری، هەم شوناسی چینایەتیی منداڵە دەوڵەمەندەکان دروست دەکرێت و سەرلەنوێ بەرهەم دەهێنرێتەوە، هەم کۆمەڵێک توانا و لێهاتووییان تێدا دەچێنرێت کە لە منداڵانی تردا ناچێندرێت، وەک وتم منداڵە دەوڵەمەندەکان فێری زمانێک یان چەند زمانێکی بیانی دەکرێن. ئەرکێکی تری ئەم جاکردنەوەیە سەرلەنوێ دارشتنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، لەباتیی ئەوەی ئەو پەیوەندییانە پەیوەندیی نێوان هاوڵاتییانی یەکسان بێت لەگەڵ یەکدا، ئەم جیاکردنەوەیە دەمانباتەوە بۆ ئەو سەردەم و شێوازەی کە پەیوەندییەکان لەنێوان "خاسە" و "عامە"دا بووە، خاسەیەک

کە سەروەر و زانایە و عامەیەک کە گەمژە و نەزانە. نوخبە دەوڵەمەندەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین وەک چۆن ماڵەکانیان بە دیوار و پاسەوان و کامێرای کۆنترۆڵکردن لە کۆمەڵگا جیا کردۆتەوە و جیا دەکەنەوە، ئاواش لە ڕێگای بەبازاڕکردنی سیستمی خوێندن و فێربوونەوە سیستمێکی تایبەتیان بۆ منداڵەکانیان دروست کردوە و لە سەرجەمی منداڵانی وڵاتیان جیا کردوونەتەوە. ئەم لۆژیکە کۆمەڵایەتییە گێتۆسازەیە کە ئەمڕۆکە لەناو سیستمی پەروەردە و فێرکردنی کوردستاندا ئامادەیە، لە باخچەی ساوایان و قوتابخانە سەرەتاییەکانەوە دەست پێ دەکات و تا قۆناغی زانکۆ و دوای زانکۆش درێژە دەکێشێت.

ئاشکرایە کێشەکە لێرەدا تەنها کێشەی جیاکردنەوەی منداڵان نییە لەیەکتری، تەنها ئەوە نییە منداڵی خێزانە دەوڵەمەندەکان لەگەڵ یەکتریدا و بەدابڕاوی لە منداڵانی تری وڵات دەخوێنن و پەروەردە دەکرێن، کێشەکە گواستنەوەی تەواوەتیی عەقڵیەت و لۆژیکی ناو گێتۆ کۆمەڵایەتییەکانە بۆ ناو لۆژیکی سیستمی خوێندن و پەروەردە. گواستنەوەی دابەشکردنی کۆمەڵگایە لەسەر بنەمای "خاسە" و "عامە" و لەسەر بنەمای سەرجەمی دابەشکردنە ئەرستۆکراتییە تەقلیدییەکانی قۆناغی بەر لە مۆدێرنەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ ناو سیستمی خوێندن و لەوێشەوە تەعمیمکردنی تەواوی بەسەر هەموو کۆمەڵگادا. دەرەنجامی ئەم گواستنەوەیەش تەنها بەگێتۆکردنی سیستمی خوێندن و فێربوون نییە لە کوردستاندا، بەڵکو قرتاندنی هەموو پەیوەندییەکە لەنێوان سیستمی خوێندنی مۆدێرن و خواست و توانا و ئەگەری

دروستکردنی کۆمەڵگایەکی مۆدێرندا. ئەمەش لە ڕێگای بەتاڵکردنەوەی ئەم سیستمە لە هەموو ئەو ئەگەرە یەکسانخواز و دادپەروەرانەی کە پێویستە هەڵگریان بێت و لە قۆناغێکی مێژووییدا هەڵگریان بووە. پەکخستنی قوتابخانەیە وەک یەکێک لەو دەزگا گرنگانە کە ئیشی پەرەدانە بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و بەخشینی سەرەتای یەکسان بە هەمووان. بەگیتۆکردنی سیستمی پەروەردە هەموو "سەرەتا یەکسان"ەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمە وێران دەکات و نایەکسانیی نێوان چینەکان و گروپە کۆمەڵایەتییەکان لە شوێنێکدا دەچێنێت کە نابێت بچێنرێت.

ئەگەر لە قۆناغەکانی بەر لە دونیای مۆدێرندا سیستمی پەروەردە و فێربوون ئامرازێک بووبێت بۆ هەندێک جێگۆڕکێی کۆمەڵایەتی، فێربوون شتێک لە یەکسانیی تێدا بووبێت و منداڵی جووتیارێک کە قوتابخانە دینییەکانی تەواو کردبێت، توانای ئەوەی لەبەردەمدا بووە ببێت بە موفتی، یان سەرۆکی دەزگا گەورەکانی خوێندنی وەک زانکۆی ئەزهەر، یان مەلای مزگەوتە گەورەکان، ئەوا ئەمڕۆ ئەم ئەگەرە لە سیستمی خوێندن و فێربوون سەندراوەتەوە. ئەمڕۆ ئەوەی ڕوو دەدات سڕینەوەی ئەم ڕەهەندە یەکسانخوازەیە کە سیستمە کۆنەکانی خوێندن لێی بێبەش نەبوون.

## سەرچاوەکان

Bourdieu, P. & Passeron, J.C. (1990 [1970]). Reproduction in Education, Society and Culture. Second Edition. London: Sage Publications.

Lizardo, O. 2004, "The cognitive origins of Bourdieu's Habitus", Journal for the Theory of Social Behaviour, vol. 34, no. 4, pp. 375-448.

Voice, Paul (2011). Rawls explained : from fairness to utopia. Chicago : Open Court.

# سەلەفیەت و شار

**سەرەتا**

ئەمڕۆ بزاوتێکی ئیسلامی سەلەفی لە کوردستاندا ئامادەیە، کە بۆ هەمووان دیار و بینراوە، سەلەفییەکان خۆشیان سڵ لەوە ناکەنەوە لەناو شارەکانی کوردستاندا خۆیان وەک "دینداری جیاواز" نمایش بکەن و شوناسێکی ئایینی بە خۆیان ببەخشن جیاواز لە شوناسی زۆرینەی دینی لە کوردستاندا. لەناو "ڕووبەری گشتی"ی دونیای ئێمەشدا بە شێوازی جیاواز دەر دەکەون. هەم شێوازی جلوبەرگ و خۆپۆشینیان جیاوازە، هەم چۆنیەتیی ڕێکخستنی لەش و ڕوخساریان، هەم ئەو ڕوانین و دیدانەی بۆ دین و دینداری هەیانە. ئەمە جگە لە ئامادەبوونیان لەناو چەندەها مزگەوت و ناوەندی دینی و فێرگە و پۆلی خوێندنی ناو زانکۆکانیشدا. هاوکات بە شێوەیەکی بەرچاو لەناو دونیای پەیوەندییە تەکنۆلۆژییە مۆدێرنەکاندا ئامادەن، ئەم بزوتنەوە تازەیە هەم تەلەفیزیۆن و ڕادیۆی هەیە، هەم ئەکاونتی تایبەت لەسەر فەیسبوک و هەم چەندان وێبسایت و پێگەی ئەلکترۆنیی جیاواز. زۆربەشیان لە دەوری ئەم یان ئەو "زانا" و "شێخ" "بانگخوازی"ی دینی کۆ بوونەتەوە و ئەوانیش ڕۆڵی سەرکردەیەکی دینیی

دەبینن کە دەتوانێت دەست بخاتە ناو ژیانی شەخسیی هەواداراکانیەوە. نموونەکانیان لە کوردستاندا کەسانی وەک وەک د.عەبدولواحید و مەلا شووشکەیی و مەلا عەبدوللەتیفن. ئەم سەلەفیانە کتێبی دینی و نادینیی تایبەت بە خۆیان هەیە و لە کۆمەڵێک کتێبخانەی تایبەتیشدا دەفرۆشرێن.

لەم دەیەی دواییدا ئەم سەلەفیانە ناوی زیاد لە خوێندەوار و تیوریستێکی دینییان هێناوەتە کوردستانەوە کە زۆرینەیان سعودی و خەلیجین و پێشتر ئەو ناوانە نە لەناو کایەی دین و نە لەناو کایەی ڕۆشنبیریی ئێمەدا بوونیان نەبووە، لە ناوە هەرە دیارەکانیش ئەبو محەمەدی المقدسی، سفر الحوالی، سالح الفوزان، شێخ عبدالرحمن البراک و ڕەبیع بن هادی المدخلی. ئەمانە و چەندان ناوی تر، کە خۆیان بە پەیڕەوکەری سەلەفی سالح دەزانن، هاتوونەتە ناو ئەو فەزا دینی و ڕووبەرە گشتییەوە کە لە کوردستاندا ئامادەیە. هاوکات ئەم گروپانە زمانێکی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە زۆر جار زمانێکی دینیی تەواو سادەگۆیە و جیاکردنەوەی حەڵاڵ لە حەرامی دینی یەکەی سەرەکیی ناو ئەو زمانەیە. خۆنماییشکردنی خۆشیان وەک "هەوادارانی سوننەتی پێغەمبەر" یەکێکی ترە لە تەوەرە سەرەکییەکانی شوناسی دینییان و لە ڕووی تیۆلۆژییشەوە گرنگییەکی گەورە بە "حەدیس" و "سوننە"ی پێغەمبەر ئەدەن، نەک بە قورئان خۆی، چونکە پێیان وایە باشترین کەسێک لە قورئان تێگەیشتبێت پێغەمبەری ئیسلام و نەوەی یەکەمی ئەسحابەکانە. ئەم سەلەفیانە زمان و زاراوە سەرەکییەکانیان لەناو مێژووی فیکری ئیسلامیی کلاسیکییەوە دەر دەهێنن

و لە زۆر ڕووەوە درێژەدانە بەو شێوازە لە زمان کە لە ئەدەبیاتی "سیاسەتی شەرعی" و "ئەحکامی سوڵتانی"دا ئامادەیە.

هاوکات بڕبڕەپشتی بیر و بۆچوونە سیاسییەکانیان لەناو کایەی سیاسیی ئێمەدا لەسەر پێداگرتن لەسەر "ئیتاعەتی سیاسی" و "وەلا بۆ وەلی ئەمر" کار دەکات، هەموو ڕەخنە و ناڕەزاییدەربڕینێک وەک "خرووج" لە دین و لە ئیسلام وێنا دەکەن و وەک شکاندن و دەرچوون لە "بەیعەت" و هەڵگیرساندی "فیتنە" دەبینن. "دانبەخۆداگرتن" و "تەحەمولکردنی حاکم" بەها سیاسییە سەرەکی و گرنگەکانیانە و شتێک بە ناوی "دەوڵەتی یاسا"، "جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکتری"، "حوکمڕانیی دەستوری" و "ژیانی پەرلەمانی" و زۆرێکی تر لە پێدراوە مۆدێرنەکانی تری حوکمڕانیکردن لای ئەمانە ئامادە نییە. نەک هەر ئەمە بەڵکو خودی دیموکراتیەت خۆشی وەک سیستمێکی سیاسی لای ئەمانە وەک کوفر مامەڵە دەکرێت و بە داهێنراوێکی خۆرئاوایی ناو دەبرێت، کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلام و بە کەلەپووری ئیسلامییەوە نییە. "نەسیحەت"کردنی حاکم و دەسەڵاتدار ئامرازی سەرەکیی بەشداریکردنی سیاسییە و خیلافەکەیان لەسەر ئەوەیە ئایا ئەم "نەسیحەت"ە بەنهێنی ئەنجام بدرێت یان بەئاشکرا. لە کوردستاندا هەم یەکێتی و هەم پارتی گروپی سەلەفیی تایبەت بە خۆیان هەیە.[1]

---

١ سەلەفییەکانی سەر بە مەلا عەبدوڵڵەتیفی مەدخەلی لە یەکێتی نزیکن و پارتییەکانیش گروپی سەلەفیی تایبەت بە خۆیان هەیە کە سیروان ئەشقەر سەرکردایەتییان دەکات.

بەڵام هەندێک گرووپی سەلەفیی تر هەن کە باوەڕیان بە نەسیحەت و مەشوەرەت نییە و لەباتیی ئەمانە هەڵگری گوتارێکی سیاسیی ڕادیکاڵیی ڕەخنەیین و داوای کۆتاییهێنان بە سیستمی سیاسیی دەکەن بەو شێوەیەی کە هەیە. بەڵام هەموویان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و دینییەوە تەواو داخراو و کۆنەپارێزن و دیدێکی هێجگار سادە و خورافی یان نیمچەخورافییان بۆ چۆنیەتیی کارکردن و ڕێکخستنی کۆمەڵگا هەیە. بنچینەی سەرەکی ڕێکخستنی کۆمەڵگا لای ئەمان جیاکردنەوەی تەواوی نێر لە مێ و داپۆشین و دیسپلین و گەمارۆدانی جەستەی ئافرەتە. لەم ڕووەوە هەڵگری داخراوترین دیدی پاتریارکین بۆ چۆنیەتیی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و چۆنیەتیی دارشتنەوەی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ لە کۆمەڵگادا (Meijer 2009).

پرسیاری سەرەکی ئەوەیە چۆن لەم دیاردەی سەلەفیەتە لە کوردستاندا تێبگەین؟ بە بۆچوونی من بەبێ گەڕاندنەوە بۆ سۆسیۆلۆژیای دین تێگەیشتن لەم دیاردەیە مەحاڵە، بەتایبەتی ئەو شێوازە لە سۆسیۆلۆژیا کە دین بە ژیانی ناو شارە گەورەکانەوە و بە پرۆسە ئاڵۆزەکانی بەشاربوونەوە گرێ ئەدات، واتە بەو پرۆسەیەوە کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن ئوربانیزەیشن urbanization. دیاردەی سەلەفیەت دیاردەی ناو دونیای دوای ڕاپەڕینە، دونیایەک تیایدا تەنها مۆدێلێکی سوڵتانیی تایبەت لە ئاستی حوکمڕانیدا دروست نابێت، بەڵکو پرۆسەیەکی تایبەتی بەشاربوونیش چییەتی و ناوەرۆکی فەزا گشتییەکانی ئەو کۆمەڵگایە دەستنیشان دەکات. من تا ئێستادا لە زیاد لە نووسینێکدا باسم لەوە

کردوە کە سولْتانیزمی سیاسی لە کوردستاندا پێویستی بەو گوتارە سەلەفییە هەیە کە لە ڕووی سیاسییەوە باس لە "نەسیحەت" و "مەشوەرەت" و "ئیتاعەتکردنی وەلی ئەمر" دەکات، ئەم پرۆسەیەشم لە زیاد لە نووسینێکدا بە پرۆسەی "بەسعودییکردنی کوردستان" ناو ناوە، ئەوەی لەم وتارەدا دەمەوێت جەغتی لێ بکەمەوە؛ پەیوەندیی نێوان سەلەفیەت و پرۆسەی بەشاربوونە لە کوردستاندا.

## سۆسیۆلۆژیای شار

تا سەرەتای سالآنی هەفتا لە سۆسیۆلۆژیای شار و شارنیشینیدا ئەو گریمانەیە بالآدەست بوو کە ژیانی شار ژیانێکی نادینی دەبێت، ژیانێکی سێکولەر بەبێ ئامادەگییەکی بەرچاوی دین لە ژیانی گشتیدا. گریمانەکە باسی لەوە دەکرد ڕاستە دین لە شاردا دەمێنێت، کەسانی دینی لەناو شاردا بوونیان دەبێت، بەلآم ژیانی گشتی لە شار و لە ڕووبەرە گشتییەکانی ناو شاردا، ژیان و ڕووبەرێکی دینی نابن. ئەم ڕوانینە بەشێک بوو لە تیزی "بەعەلمانیبوونی حەتمیانەی دونیا" وەک بەشێک لە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەلآیەتی. لێرەشەوە لەم شێوازەدا لە سۆسیۆلۆژیای دین پرۆسەی بەشاربوون، ئەوەی بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن ئوربانیزەیشن، urbanization، وەک پرۆسەی لاوازبوونی دین و پەراوێزکەوتنی دینداری وێنا دەکرا(Cox ١٩٦٦).

لەنێوان هاتنەکایەی شاری گەورە و بەهێزیی دینداریدا پەیوەندییەکی پێچەوانە گریمان دەکرا. بێگومان ئەم گریمانەی بەعەلمانیبوونەی فەزای شار لە هەندێک ئاست

و لەنـاو هەندێک لـە ڕووبـەرە شـارییەکاندا ڕاسـتە و ڕاست بووە، بەڵام بۆ گشـتێتیی پرۆسـەی بەشـاربوون ڕاسـت نییە و ڕاست نەبووە. بۆیە کۆمەڵناسـە تـازەکان گەشـە بە دیدێکی تر بۆ پرۆسـەی بەشـاربوون ئەدەن جیـاواز لـەو دیدە سـەرەتاییە کە پشـتی تـەواوی بـە تێزی بەعەلمانیبوونـی دونیا لە پرۆسـەی تازەبوونـەوەدا، بەسـتوە. لـە ڕاسـتیدا لـە هەفتـاکان بـەدواوە ڕەهابـوون و دۆگماییبوونـی ئـەو گریمانەیـە بـەر ڕەخنەیەکی زۆر دەکەوێت و ژمارەیەکی زۆر کۆمەڵناس ئـەو ڕاستییەیان بـۆ دەر دەکەوێـت کـە شـارە گـەورەکان، لەپـاڵ لاوازبوونـی هەندێـک دەرکەوتـی دینـی و کۆتاییهاتنـی هەندێـک شـێوازی تایبەتـی دینداریدا، هـاوکات ژینگەیەکی نوێن بـۆ دروسـتبوونی چەنـدان بزوتنـەوەی ئایینیـی تـازەی بەهێـز و چەنـدان شـێوازی نوێی دنیدارییش، شـارە گەورەکانـی ئەمڕۆکـەی دونیا نموونەی ئـەو شـوێنانەن کـە تیایانـدا دیـن و نادیـن، مرۆڤـی بـاوەڕدار و مرۆڤـی بێبـاوەڕ، بزوتنـەوەی دینـی و بزوتنـەوەی نادینیـی فرەشـێوە و هەمەجۆریـان تیادایـە. ئـەم وتـارە هەوڵدانێکـە بـۆ بەسـتنەوەی بزوتنەوەی سـەلەفیەت لە کوردسـتاندا بە پرۆسـەی بەشـاربوونەوە لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا (AlSayyad and Massoumi 2010).

### بەعەلمانیبوونی دونیا یان بەپلورالبوونی؟

لـە سۆسـیۆلۆژیای سـونەتیدا کۆچکـردن و گواسـتنەوە لـە لادێکانـەوە بـۆ شـار سـەرەتا وەک بەشـێک لـە پرۆسـەی بەعەلمانیبوونی دونیا وێنا دەکرا، کە تیایدا کۆچبەران ژینگە تەقلیدییـە دینییەکـەی خۆیـان جـێ دەهێڵـن و لەنـاو شـارەکاندا

بەها و ئەخلاقیاتی نوێی نادینی وەر دەگرن، بەڵام دواتر دەر کەوت ئەم شێوازە گواستنەوە و کۆچکردنە بۆ بەشێک لە کۆچبەران ڕاستە و بۆ گشتێتیی دیاردەی کۆچکردن ڕاست نییە. کۆچکردن لە لادێوە بۆ شار هەندێک کەس و گروپ و هێزی کۆمەڵایەتی لە دین دوور دەخاتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم کۆچکردنە بۆ شارەکان ژینگەیەکی بەهێز و لەباریش بۆ گەشەکردنی دینداریی نوێ و دروستبوونی بزوتنەوەی دینی دەڕەخسێنێت. ئەگەر زانا کۆمەڵایەتییەکان و مێژوونووسان پێشتر باوەڕیان وا بووبێت کە پرۆسەی بەشاربوون و تازەبوونەوەی دونیا، مانای دروستبوونی کۆمەڵێک شار بێت خاڵی لە دین، یان شار بێت لەپاڵ شێوازێکی لاواز و پەراوێزی دینداریییەوە. ئێستا بەشی هەرەزۆری ئەوانەی باس لە پرۆسەی بەشاربوون دەکەن، باس لەوە دەکەن کە دەشێت ئەم پرۆسەیە هاوشان بێت بە دروستبوونی دینداریی نوێ و دروستبوونی بزوتنەوەی ئایینیی جەماوەری، وەک چۆن دەشێت بەشێک بێت لە دروستبوونی ژینگەیەکی پڕ لە ململانێ و ناکۆکیی دینی، کە تیایدا زیاد لە ڕوانینێک بۆ دین و زیاد لە فۆرمێک لە دینداری بەر یەک بکەون و ململانێ لەگەڵ یەکدا بکەن. بەڵام وەک وتم ئەم پرۆسەیە دەشێت هاوکات هۆکارێکیش بێت بۆ کەمبوونەوە و لاوازبوونی دین لای کەسان و هێزگەلێکی دیاریکراو. واتە پرۆسەی بەشاربوون هەم دەشێت دینداری لاواز بکات، لای هەندێک کەس و گروپ، بەڵام دەشێت بەهێز و بەرفرانیشی بکات، لای کەسان و گروپی دیکە. (AlSayyad and Massoumi ٢٠١٠).

هەموو ئەمانەش هێما بۆ بەپلورالبوونی ژیانی ویژدانی و عەقڵی و ئایدیۆلۆژیی ناو شارەکان دەکات و پرۆسەی بەشاربوون زیاتر وەک پرۆسەیەک بۆ بەرهەمهێانی پلورالیزم وێنا دەکرێت، نەک وەک پرۆسەیەک بۆ بەعەلمانیبوونی دونیا. ئەم تێزە، ئەگەرچی لێرەدا شوێنی شیکردنەوەی زیاتریم نییە، بەڵام یەکێکە لە تێزە سەرەکی و گرنگەکانی کۆمەڵناسی ئەمریکی: پیتەر بێرگەرە. ئەم کۆمەڵناسە پێی وایە مەرج نییە پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن هاوشان بێت بە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی بەردەوام، واتە مەرج نییە عەلمانەیت هەمیشە و هەردەم هۆکار یان دەرەنجامێکی حەتمیی پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن بێت، بەڵام ناکرێت بیر لە پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن بکەینەوە بەبێ بیرکردنەوە لە دروستبوون و بەرهەمهێنانێکی گەورەی پلورالیزم، بەبێ بەرهەمهێنانی جیاوازیی هەمەڕەنگ لە زیاد لە کایەیەکی کۆمەڵایەتی و لەناو زیاد لە شێوازێکی بیرکردنەوە و خۆڕێکخستن و خۆنماییشکردن لە ڕووبەری گشتییدا. پلورالیزمێک کە تیایدا دینی و نادینی، عەلمانی و ناعەلمانی، باوەڕدار و بێباوەڕ بەیەکەوە و لەپاڵ یەکدا دروست دەکات و دادەنێت (Berger & Luckmann 1995).

**لە قاهیرەوە بۆ سلێمانی**

قاهیرە نموونەی یەکێکە لەو شارانەی کە پرۆسەی بەشاربوون و پرۆسەی بەعەلمانیبوون و پرۆسەی لەدایکبوونی بزوتنەوەی ئایینیی نوێ و هاتنەکایەی شێوازی نوێی دینداری بەیەکەوە لەئامێز دەگرێت. لەگەڵ گەشەکردنی

زیاتری شارەکە و کۆچی ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینان لە لادێکانەوە بۆ ئەو شارە، زیاد لە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە کە هەریەکەیان بە ئاراستەیەکدا دەڕۆن و بکەری جیاواز و زۆر جار ناکۆک بەیەک دەجووڵێنن. لەم ڕەوتەدا وەک چۆن کەسایەتییەکی لیبرال و عەلمانی و مۆدێرنیستی وەک تەها حوسەین لە لادێیەکی میسرەوە کۆچ بۆ قاهیرە دەکات و لەوێ دەبێت بە یەکێک لە بکەرە سەرەکییەکانی ناو ژیانی مەدەنی و ڕۆشنبیری و پەروەردەیی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، تەها حوسەین چەندەها زانکۆی لە میسردا دروست کرد و دواتریش بوو بە وەزیری خوێندنی باڵا. بەڵام یەکێکی وەک حەسەن بەنا و سەید قوتبیش لە هەمان سەردەمدا لە گوندێکی چەپەکی میسرەوە بۆ قاهیرە کۆچ دەکەن و ئیسلام سەرلەنوێ وەک یەکێک لە ئایدیۆلۆژیا سەرەکییەکانی سەدەی بیستەم دروست دەکەن، ئەمە جگە لە دروستکردنی بزوتنەوەی ئیخوان موسلیمین، کە قاهیرە شوێنی لەدایکبوونیەتی. لە دوای ئەم لەدایکبوونەشەوە لە سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەمدا، ئیتر لە هەفتاکانی سەدەکەدا زانکۆکانی ناو قاهیرە و سەندیکا و ڕێکخراوە پیشەییەکانی پڕ دەبن لە خوێندکار و مامۆستای ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی خۆشی وەک ئایدیۆلۆژیا و وەک بزوتنەوەیەکی سیاسی لەو ناوەندە تازە و مەدەنییە نوێیانەدا گەشە دەکات. ئەم گەشەکردنەی باڵە جیاوازەکانی ئیسلامی سیاسی، بە ئیخوانی و سەلەفی و سەلەفیی جیهادییەوە، هاوشانە بە گەشەکردنی قاهیرە خۆشی وەک شارێک و گەورەبوون و فروانبوون و قەرەباڵغبوونییەوە. چ لە ڕووی

دروستبوونی شاری تەنەکە و پەراوێزخراوی گەڕەکە دوورەدەستەکانی ناو شارەکەوە، کە ملیۆنان مرۆڤیان تیا دەژین، چ لە ڕووی گەشەی گەورەی دانیشتووان و بێتوانابوونی دەوڵەت لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان بەو دانیشتووانە، چ لە ڕووی دروستبوونی چەندەها "شاری تایبەت" و "گیتۆی کۆمەڵایەتیی"ەوە کە دەوڵەمەندەکانی شار لە هەژارەکانی دادەبڕێت و جیا دەکاتەوە، چ لە ڕووی باڵادەستبوونی گەندەڵی و دزی و جەردەییی بێوێنەی بەرپرسانی وڵاتەکەوە، قاهیرەی ئەمڕۆ ڕووبەرێکی نوێیە پڕ لە ناکۆکی و بکەر و بزوتنەوەی دینی و نادینیی جیاواز و هەمەڕەنگ (Bayat ۲۰۰۹).[1]

بە بۆچوونی من مۆدێلی گۆڕانەکانی ناو قاهیرە مۆدێلی بەشێکی زۆری شارەکانی تری ناوچەکەیە هەر سۆسیۆلۆژیایەک بیەوێت لە بزوتنەوە دینییەکانی ناو ئەم شارانە و لە شێوازە تازەکانی دینداری لەم شوێنانەدا تێبگات، سەیرکردنی ئەم وێنە گشتییەی بەشاربوون گرنگییەکی گەورەی هەیە.

ئەوەی لە شارەکانی کوردستانی دونیای دوای ڕاپەڕیندا ڕووی داوە و ڕوو دەدات، پرۆسەی هاوشێوەی ئەو پرۆسانەیە کە پێشتر لە شارێکی وەک قاهیرەدا ڕوویان داوە. بەڵام بە خێراییەکی زۆر زیاتر و بەناو شێوازێکی زۆر گەورەتر لە گەندەڵی و بەگیتۆکردنی هەمەلایەنەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە

[1] _لەم ڕووەوە کارەکانی ئاسف بەیات، کۆمەڵناسیی بە ڕەچەڵەک ئێرانی، مایەی خوێندنەوە و لەسەروەستانە، بەتایبەتی کتێبی "ژیان وەک سیاسەت: چۆن خەڵکی ئاسایی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان گۆڕی".بڕوانە: (Bayat 2009).

سەر ڕووبەرێکی جوگرافیی زۆر بچوکتر و لە ماوەیەکی زەمەنیی هێجگار کورتتردا. وەک چۆن ئیسلامی سیاسی لە قاهیرەدا دیاردەیەکی شارییە، ئاواش ئیسلامی سیاسی لە هەرێمەکەی ئێمەدا دیاردەیەکی شارییە، ڕاستە بەشێکی زۆری سەرکردە و کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بزوتنەوەیە لە کوردستاندا بە ڕەچەڵەک خەڵکی لادێکانی کوردستانن، بەڵام بزوتنەوەکە لە شارە گەورەکانی کوردستاندا گەشە دەکات و بڵاو دەبێتەوە و هەواداری زۆر دروست دەکات، نەک لە گوندەکاندا. تەنها لە دونیای دوای ڕاپەڕینیدا ئیسلامی بەسیاسیکراو وەک دیاردەیەکی جەماوەری و پەرلەمانی لەدایک دەبێت، شوێنی لەدایکبوونەکەشی هەولێر و سلێمانی و دهۆکە، نەک گوند و شارۆچکە چەپەکەکانی کوردستان.

بە بۆچوونی من هەموو قسەکردنێک لەسەر سەلەفیەتی دینی لە کوردستاندا لە دەرەوەی پرۆسەی بەشاربوونی خێرا و هەمەلایەنەی شارەکانی هەرێمی کوردستان و لە دەرەوەی پرۆسەی کۆچکردن و گواستنەوە لە لادێکانەوە بۆ ئەم شارانە و هاوکات لە دەرەوەی دروستبوونی ململانێی دینیی گەورە لەناو کایەی دین خۆیدا (لەنێوان ئیسلامی ئیخوانی و ئیسلامی سەلەفی و ئیسلامی سوفی و ئیسلامی میلیدا) و لە دەرەوەی تێکەڵبوونی دین بە دەسەڵات و بەستنەوەی بە پرۆژەی بەسوڵتانیکردنی سیستمی سیاسییەوە لەسەر مۆدێلی سعودی (پرۆسەی بە سعودیکردنی کوردستان) و لە دەرەوەی کردەی دروستکردنی هەزاران مزگەوت لە ماوەیەکی هێجگار کورت لە هەرێمدا، (نزیکەی شەش هەزار مزگەوت لە کوردستاندا هەیە)، لە دەرەوەی دروستبوونێکی

خێرا و بەرچاوی "گیتۆی کۆمەڵایەتی" لە فۆرمی "شاری خەون"ەکان و "بە بەرخۆرییکردنی ئارەزووەکان"دا، دەڵێم لە دەرەوەی ئەم دیاردە گەورە و فرەلایەنانەدا هەموو قسەکردنێک لەسەر سەلەفیەتی دینی قسەکردنێکی بێسەمەر دەبێت و ڕێگر دەبێت لەوەی لەم دیاردە تازەیە و لە زۆرێکی تری دیاردەکانی ناو کۆمەڵگای کوردستانی ئەمڕۆکە تێبگەین.

**شار وەک چوارچێوە**

شار شوێنی کۆبوونەوە گەورەکانە، شوێنی کۆکردنەوەی ژمارەی گەورەی خەڵکە لەدەوری ئەم یان ئەو بیرۆکەی ئایینی یان نائایینی. ئەوەی کە هەندێک جار لە شارێکی وەک هەولێردا نزیکەی دە هەزار کەسێک لەدەوری مزگەوتێک و مەلایەک و بانگخوازێک کۆ دەبنەوە، تەنها لەناو فەزای جوگرافیی شارەکاندا دەکرێت دروست ببێت. شار ڕووبەرێکی گەورە و فراوانە کە توانای کۆکردنەوەی ژمارەی گەورەی لە خەڵک هەیە، بەبێ شار پرۆسەی بەجەماوەریکردنی دین و بەجەماوەریکردنی هەر ئایدیۆلۆژیایەکی دیکە، مەحاڵە. جگە لەمە شارەکان ئەوەتەی هەن شوێنی دروستکردن و بونیادنانی پارت و ڕێکخراوی سیاسی و ناسیاسیی هەمەجۆرن. شوێنی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکانن، بێشکەی لەدایکبوونی بزوتنەوەی سیاسیی نوێن. لە هەمان کاتدا شار شوێنی هەستکردنێکی بەرجەستە و ڕاستەوخۆیە بە بوون و ئامادەگیی زیاد لە تێگەیشتن و خەون و چاوەڕوانییەک لای دانیشتووانە گەورەکەی. شوێنی پێکەوەبوونی کەسانی جیاواز و فرەڕەنگە، کە دەشێت هەم

لەسەر زۆرشت هاورا بن، بەڵام لەسەر زۆر شتی تر ناکۆک و دژبەیەک بن. بەکورتی شار ژینگەیەکی پڕ دینامیکیەتی تازەیە، کە ئەگەری جیاواز دەخاتە بەردەمی تاکەکەس و گروپی جیاواز، بە گروپە دینییە سیاسی و ناسیاسییەکانیشەوە.

جگە لەمە شار هەمیشە جوگرافیایەکی تایبەتە کە هەندێک کەس و هەندێک گروپی کۆمەڵایەتی تووشی جۆرێک لە نامۆبوونی کۆمەڵایەتی و کولتووری دەکات، شێوازێک لە "داچڵەکین و "شۆک"ی کولتووریی بەرهەم دەهێنێت، هەندێک تەواو وەڕس و هەندێک تەواو دڵخۆش دەکات. کەسانێک هەن پێیان وایە شار لە دونیای ئێمەدا بوونی نییە و ئەوەی هەیە درێژکراوەی لادێ و کولتووری لادێکانە. ئەم جۆرە ڕوانینە، کە زۆر جار بە ناوی فیکر و فەلسەفە و بیرکردنەوە و تێبینیی قووڵەوە دەر دەبڕدرێن، جگە لە تەمبەڵییە فیکرییەکەی پشتییان کە وایان کردوە توانای پشکنینی ڕاستەقینەی هیچ دیاردەیەکی کۆنکریتییان نەبێت، هاوکات ڕێگریێکی گەورەن لەبەردەم تێگەیشتن لە سادەترین دیاردەکانی ناو دونیای ئێمەدا. ئەم جۆرە ڕوانینە لەباتیی ئەوەی پێمان بڵێن ئێمە چ جۆرە شارێکمان هەیە، پرسەی بەشاربوون لەناویدا چۆن دروست دەبێت، چ هێز و گروپ و بزوتنەوەیەک دروست دەکات، بە کێ ئینتیما دەبەخشێت و کێ بێئینتیما دەکات، هتد... دەکرێت باس لە دەیان پرۆسەی دیکە بکەین، دەڵێم لەباتیی خۆماندووکردن و گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە و هاوشێوەکانیدا، ڕێگە هەرە سادە و ئاسان و پڕتەمبەڵییەکە هەڵدەبژێرن و ئەڵێن ئێمە شارمان نییە.

بۆ سەلماندنی هەڵەی ئەم دیدانە، هەر بۆ نموونە، وێنەی

"ڕووبەری گشتی"ی شارێکی وەک سلێمانی لە هەفتاکان و هەشتاکاندا وەر بگرە و بەراوردی بکە بە وێنەی "ڕووبەری گشتی" لەمڕۆدا. لە هەفتاکان و هەشتاکاندا ئەو ڕووبەرە گشتییە پڕ بوو لە ئافرەتی بێحیجاب و مینیجۆب و تەنوورەی کورتلەبەر، پڕ بوو لە مەیخانە و یانە و دوکانی فرۆشتنی مەی، سینەمای تێدا بوو کە هەموو جۆرە فیلمێکیان نیشان ئەدا بە فیلمی ئیرۆتیکییشەوە، فۆرمێکی تایبەت لە مۆسیقا باڵادەست بوو، گروپی شانۆیی جیاواز و بۆنە و ئاهەنگ و کۆڕ و کۆبوونەوەی هەمەڕەنگی تێدا بوو، ئەمە جگە لە بوونی چەندان کتێبخانە کە پڕ بوون لە ئەدەبیاتێکی تەواو چەپگەر و عەلمانی. هەموو ئەمانە سەرچاوەی نامۆبوون و شۆکی کولتووریی بوون بۆ کەسانێک کە نەک تەنها ئەندامی ئەم یان ئەو گروپی ناچالاکی سەر بە ئیسلامی سیاسی بوون، بەڵکو بۆ ئەوانەش کە مەیلی دینیی کۆنەخواز و داخراویان هەبوو. بۆیە گرێدانەوەی دروستبوونی ئیسلامی سیاسی و سەلەفیەتی دینی بە فۆرمە جیاوازەکانی "نامۆبوونی کۆمەڵایەتی" و "شۆکی کولتووری" لەو شارەدا، کارێکی سەیر و سەمەرە نییە و بەشێکە لە هەر دیدێک بخوازێت بە شێوەیەکی زانستی لە دیاردەی سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسی لە دونیای ئێمەدا تێبگات لە چوارچێوەی پرۆسەی تازەبوونەوە و پرۆسەی بەشاربووندا نیشتەجێیان بکات. کە ئەمە دەڵێم، نامەوێت دروستبوونی ئیسلامی سیاسی بۆ ئەم ڕەهەندە شارییە کورت بکەمەوە، بەڵام فەرامۆشکردنی ئەم ڕەهەندە تێگەیشتنێکی تەواو نوقسان و کەمخوێنی ئەم دیاردەیەمان پێ دەبەخشێت. مرۆڤ تەنها لەناو ژینگەیەکی

شاریدا و لەناو ڕووبەری شارە گەورەکاندا هەست بە دیاردە کولتوورییە جیاوازەکان دەکات، هەست بەوە دەکات کە کولتوورێک دۆڕاوە، یان خەریکە دەدۆڕێت و کولتوورێکی دیکە دێت و خەریکە شوێنەکەی دەگرێتەوە.

**شار و توانای ڕێکخستن**

وەک وتم شار ئەگەر و توانای مۆبیلزەکردن و ڕێکخستن و پەیداکردنی ئەندام و هەواداری زۆر دەخاتە بەردەمی هەر بزاوتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، هەر ئایدیۆلۆژیایەک دەتوانێت هەوادار بۆ خۆی بدۆزێتەوە. هاوکات ڕووبەرێکی گەورە بۆ کاری پێکەوەیی و دەستەجەمعی دەستەبەر دەکات و دەتوانێت ئەو ژێرخانە مرۆییە دروست بکات و بخاتە گەڕ، کە هەر بزوتنەوە و ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی بۆ کردەی تەشەنەکردن و بەجەماوەریبوون پێویستی پێیەتی. بۆ هێزگەلێکی وەک ئیسلامی سیاسی، بە هێزە سەلەفیەکانیشەوە، مەسەلەی گەیشتن بە ژنان و ڕێکخستن و کۆکردنەوەیان لەناو ڕیزەکانیاندا مەسەلەیەکی سەرەکی و بنەڕەتیی گرنگە. مادامەکی شێوازی جلوبەرگ و خۆپۆشینی ئافرەتان یەکێکە لە "ڕەمزە سیاسی و دینی و کولتووری"یە هەرە سەرەکییەکانی ئیسلامی سیاسی بە شێوەیەکی گشتی و سەلەفیەتی دینی بەتایبەتی، بۆیە ژنانی ناو شارەکان ئەگەرێکی گەورە و گرنگی دروستکردن و بڵاوکردنەوەی ئەو ڕەمزە بەم جۆرە بزاوتانە دەبەخشن. لە ڕاستیدا هەم شێوازی ڕێکخستنی ئافرەتان لەناو بزوتنەوەکە خۆیدا گرنگە، چونکە زۆر جار دەبێت بەو مۆدێلەی ئەم بزوتنەوە دینییانە

بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ لە سەرجەمی کۆمەڵگادا پێشنیاری دەکەن، هەم بۆ پێوانی بڕی گەشەکردن و سەرکەوتنی خۆیان. واتە گەیشتن بە ئافرەتان هەم قەبارە و بەربڵاویی بزوتنەوە دینییەکان نیشان ئەدات، هەم ڕۆڵی ئەو ڕەمزە دینییەیان پێ دەسپێردرێت، لە ڕێگای جلوبەرگ و خۆپۆشینەوە، کە لە بزوتنەوەکانی تریان جیا دەکاتەوە. شارەکان سەرزەمینێکی گونجاو و لەباری مۆبیلیزەکردنی ئافرەتانن بۆ ئەو دوو مەبەستە.

ئەمە جگە لەوەی کە بەشی هەرەزۆری فێرگە و قوتابخانە دینییەکان لە شارەکاندا ئامادەن و لەوێدا و لە ڕێگای ئەو دەزگایانەوە بەردەوامی بە جۆرێک لە دید و ڕوانینی دینی دەدرێت و لە ئاستی دەزگاییدا بڵاو دەکرێتەوە. ئامادەگیی ئەو ژمارە زۆرەش لە مزگەوت و پارتی سیاسییش لەناو شارەکاندا وا دەکەن ئیشکردن لەسەر ئەو تۆڕانەی پەیوەندیکردن و ڕێکخراوەییبوون کە پێشتر ئامادە بوون، لەوانەش بۆ نموونە ئیشکردن لەسەر چوونە ناو مزگەوت و فێرگە و شوێنە دینییەکانی ترەوە، وەگەڕخستنی چالاکانەی پەیوەندییە شەخسی و خێزانی و خزمایەتییەکان، هەروەها بەکارهێنانی پەیوەندیی هاوڕێیەتی و ناسراوی، هەموویان ئەگەری گەورەبوونی زیاتر بەم بزوتنەوانە لە شارەکاندا دەبەخشن.

لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا، کە دونیای گەورەبوون و ئاوسانێکی بەرچاوی شارە کوردستانییەکانە، لە ڕووە دینییەکەوە دونیای دروستکردنی هەزاران مزگەوت و بەهێزبوونی توانای ڕێکخستن و مۆبیلەکردنی دین بەگشتی و

ئیسلامی سیاسییە بەتایبەتی. لەناو ئەم دونیا تازەیەدا توانای کۆنترۆڵکردنی ئایینیانەی ژیانی تایبەت و ژیانی گشتی سەدان جار گەورەتر بووە، بە بەراورد بە دەیەکانی بەر لە دونیای ڕاپەڕین. نەک تەنها کادری دینی و ڕێکخراوی دینی و ناوەندی دینیی زۆر دروست کراون و ئەمانەش دەتوانن ئەم ڕۆڵە ببینن، بەڵکو بوونی ژێرخانێکی میدیایی دینی، لە فۆرمی چەندەها ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و سایتی ئینتەرنێت و تواناکانی تری دونیای دیگیتاڵیدا، ژیانی تاکەکەس لەو شارانەدا بەردەوام لەبەردەم بەریەککەوتنێکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا بووە بە ڕەمز و خواست و دیدی ئۆرگانە دینییەکان و ئۆرگانە جیاوازەکانی ئیسلامی و سەلەفیەتی دینییەوە. ئەمڕۆ کۆنترۆڵکردنی ئایینیانەی ژیانی گشتی و بەشێکی گرنگی ژیانی تایبەتییش کۆنترۆڵکردنێکی دینییە، سەلەفیەتی دینیی یەکێکە لە هێزە سەرەکییەکانی ناو ئەم سیستەمە نوێیەی کۆنترۆڵکردن لە دونیای ئێمەدا.

### شار و دیاردەی فرەدینی

یەکێک لەو دەرکەوتە سەرەکییانی ژیانی شار، شارەکانی ناو دونیای مۆدێرن، شارە گەورە و قەرەباڵغەکانی دونیا، بریتییە لە ئامادەگیی دیاردەی فرەدینی و فرەدینداری. هیچ شارێکی ئەم سەردەمە نییە چەندان و دینی جیاواز و چەندان گروپی دینیی هەمەجۆر و چەندان گروپی کەمدین و بێدینیشی تێدا نەبێت. شار مانای فرەدینی و فرەدینیداری. دەشێت لە گوند و شارۆچکە بچوکەکاندا جۆرێک لە هاوشێوەیی و لێکچوونی فەرهەنگی و دینی هەبێت، بەڵام ئەم لێکچوون

و هاوشێوەییە لە شارەکاندا یان بزر دەبێت، یان دەچێتە پاڵ شێوازی تری دینداری و بێدینیی جیاوازەوە. ئەم دۆخە بۆ سەرجەمی شارەکانی هەرێمی کوردستانیش ڕاستە، ئەمرۆ لە هەمو ئەو شارانەدا زیاد لە دینێک دەبینرێت، زیاد لە شێوازێک لە دینداری ئامادەیە و زیاد لە جۆرێک لە جۆرکانی نادین و بێدینییش ئامادەیە. گەشەی ئیسلامی سیاسی خۆیشی لە سەرەتای نەوەدەکانەوە تا ئەمڕۆ سەرچاوەی کۆمەڵێک دابەشبوون و لێکترازانی سیاسییە کە خۆیان لەپاڵ شێوازی جیاواز لە دینداریدا نماییش دەکەن. واتە بەرەی ئیسلامی سیاسی خۆشیان ڕۆڵیان هەبووە و بەشدار بوون لە دابەشبوونی دین خۆی و لە جیاکردنەوەی شێوازەکانی دینداری لە یەکتر و لە چۆنیەتیی بەسیاسیکردنی دین خۆشیدا.

ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ئەمڕۆکە لە کوردستاندا بەڕەسمی لانی کەم چوار پارتی سیاسیی ئیسلامی هەیە و لەناو هەر پارتێکیشدا زیاد لە باڵ و ئاراستە و خولیایەک هەیە، کە هەم ڕوانینیان بۆ دین و دینداری جیاوازە و هەم تێگەیشتنیان بۆ ڕۆڵی دین لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ناجۆرە و هەم تەفسیرکردنیان بۆ "جەوهەر"ی دین خۆیشی جیاوازە. یەکێک لە مەترسییەکانی سەلەفیەت لە کوردستاندا ئەوەیە، کە بتوانێت ئەو جیاوازییە دینییانەی سەرەوە لەناو ببات و ڕوانینی سەلەفیانە بۆ دین و دینداری بەگشتی بکات و بیخاتە شوێنی ئەو دۆخە پلورالیەی دین. بە مانایەکی دیکە یەکێک لە مەترسییە گەورەکان ئەوەیە، کە سەلەفیەتی دینیی فرەڕەنگییەکانی ناو کایەی دین خۆی، بە دینی سیاسییشەوە،

لەناو ببات و خۆی ببێت بە تاکە ئەلتەرناتڤی هەموویان و سەرجەمی کایەی دین بە ڕەنگی خۆی ڕەنگڕێژ بکات.

**بەوەهابیکردنی ئیسلام**

شارەزایانی بواری مێژووی دروستبوون و بڵاوبوونەوەی ئیسلامی سیاسی باس لەوە دەکەن لە ساڵانی هەفتاوە سعودیە خەریکی"بەوەهابیکردن"ی ئیسلامە لە سەرتاسەری دونیادا (Kepel ٢٠٠٤). ئەمەش بە هۆی ئەو توانا مادییە گەورەیەوە کە سعودیە لە فرۆشی نەوتەوە بەدەستی دەهێنێت، ئەو توانایەی لە ئەدەبیاتی زانستیدا بە "پیترۆ دۆلار" ناو دەبرێت (ە. س. پ). هەروەها هێما بۆ ئەوە دەکەن کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام فرەڕەنگیی ئایینی بە ڕادەی ئەمڕۆ لەلایەن وەهابیزمی سعودییەوە لەژێر هەڕەشە و فشاردا نەبوە. ئەم مەترسیی لەدەستدانی فرەڕەنگیی دینی و جێگرتنەوەیان بە فۆرمێک لە فۆرمەکانی سەلەفیەتی وەهابی، مەترسییەکی گلۆباڵییە و توانا ئابوورییەکانی وڵاتانی خەلیجی لەپشتە. لە پەیوەندیدا بە کۆمەڵگای ئێمەوە دەشێت ئەم ترسە گلۆباڵییە دابەزێت بۆ ئاستە لۆکاڵییەکەی و مەترسیی ئەوە دروست بکات ئیسلام لە ناوخۆی کوردستاندا بەم ڕەنگە وەهابییە سەلەفییە گلۆباڵییە ڕەنگڕێژ بکرێت. بەتایبەتی لەپاڵ ئەو ڕاستیەدا کە پەیوەندیی نێوان سعودیە و ناوچەکە لە پەرەسەندنێکی گەورە و بەرفراواندایە و توانای بەوەهابیکردن و بەسەلەفیکردنی دین توانایەکی هێجگار گەورەیە. تێکەڵبوونی ئەم ئاستە گلۆباڵییە بە ئاستە ناوچەیی و ناوخۆییەکان، وا دەکات کێشەی سەلەفیەتی دینیی لە کوردستاندا، جیاواز بێت

لە کێشەی ئیسلامی سیاسی بەگشتی. سەلەفیەتی دینی تەنها دینێکی داخراو و دژەیەکسانی و دژەئافرەت و دژەکرانەوە گەشە پێ نادات، بەڵکو مەترسیی بەسەلەفیکردنی شێوازەکانی تری دینداریشی لێ دەکەوێتەوە کە دەشێت لە دینداریی سەلەفییانە کراوەتر و ئینسانیتر و پێشکەوتووتر بن.

سەلەفیەتی دینیی تەنانەت برێکی زۆر لە میکانیزمە دینییە سونەتییەکانیش بۆ تازەکردنەوەی دین و دینداری وێران دەکات، لەپێش هەمووانیشەوە موغامەرەی ئیجتیهاد و لێکدانەوەی نوێ بۆ تێکست و کەلەپوورە دینییە سەرەکییەکان. لەباتیی ئەمانە گەڕانەوە بۆ ژمارەیەکی کەم لە سەلەفی بەناو ساڵح و لە شێوازی ڕوانین و لێکدانەوەی ئەوان بۆ دین و شێوازی پیادەکردنی دینداری دەکات بە تاقە مۆدێلێکی ڕاستەقینەی تێگەیشتن لە دین و دەرەوەی ئەو تاقە مۆدێلەش وەک لادان لە دین و بیدعە و کوفر مامەڵە دەکات. سەلەفیەت لەم ئاستەدا بەگژاچوونەوەیەکی بەرفراوانی فیکریی عەقڵانییە لە هەموو دەرکەوتەکان و لە هەموو بوارەکانیدا، بە دەرکەوتەکانی ئەم عەقڵانیەتەوە لەناو فیکری دینیی خۆشیدا. وەک ئۆلیڤەر ڕوا دەڵێت ئەم شێوازە لە دینداری "دینە بەبێ فەرهەنگ"، دین بلا ثقافة، دینێکە پڕ لە "جەهلێکی بەموقەدەسکراو" کە هێزە سەلەفییەکان وەک "دینداریی پاکژ" وێنا و نمایشی دەکەن" (Roy 2010). شارە گەورەکان ئەو ژینگە دینییەن کە تیایدا بەریەککەوتنی فۆرمە جیاوازەکانی دین و نادین دروست دەبێت و سەلەفیەتی دینی بەو مانایەی ئۆلیڤێر ڕوا باسی دەکات، واتە وەک دینێکی بێ فەرهەنگ و دابڕاو لە هەموو سیاقێکی فەرهەنگی، دێتە کایەوە و خۆی وەک دینێکی پاکژ و گلۆباڵی وێنا دەکات.

**خورافەتی دینداریی پاکژ**

یەکێک لە دەسکەوتە گەورەکانی سۆسیۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیای دین ئەوەیە، کە وەهمی پاکژبوونی دینداریمان نیشان ئەدات. زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەمێژە شێوازە جیاوازەکانی دینداری و تێگەیشتنی جیاواز لە دین و ڕۆڵە جیاوازەکانی دینیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا نیشان داوە. سەلەفیەتی دینی بەم مانایە شێوازێکە لە دینداریی تایبەت کە لەسەر وەهمی "پاکژیی دینی"، واتە وەهمی پاککردنەوەی دین لە سەرجەمی ئەو فۆرمانەی تری دین و نادین و فەرهەنگ و ڕوانین و بۆچوون کە لە سیاقێکی مێژوویدا ئامادەیە، کار دەکات و دەژی. ئەم پاکژییەش لە ڕێگای گەڕاندنەوە بۆ سەلەفێک بەیان دەکات کە گوایە هەڵگری تاقە تێگەیشتنێکی ڕاستە بۆ دین. ئەگەر دینداریی‌یەکی پاکژ بوونی هەبێت، ئەوا دینداریی ئەو سەلەفە ساڵحانەیە.

لە دونیای ئەمڕۆدا کە کۆمەڵگاکان بەرەو ئەوە دەڕۆن ببن بە "کۆمەڵگای زانیاری" و "پەیوەندیی کراوە"ی نێوان بەش و مرۆڤ و فەرهەنگە جیاوازەکانی دونیا، سەلەفیەتی دینی گەڕانێکی نائومێدانەیە بەدوای "دینداریی پاکژ" و "فەرهەنگی پاکژ" و "باوەڕی پاکژ"دا لەناو ئەو کردە بەرفراوانەی بەناو یەکدا چوون و نزیککەوتنەوەی بەش و فەرهەنگ و کۆمەڵگاکانی جیهان لە یەکتری. هاوکات لەناو کۆبوونەوەی دونیایەک جیاوازیی دینی و نادینیی نوێدا لەناو ڕووبەری زۆرێک لە شارەکانی جیهاندا. سەلەفیەت بەم مانایە جووڵەیەکە دژ بە سەردەمەکە و دژ بەو خولیا سەرەکی

و ئەگەرە بنەڕەتییانەی جیهان ئەمڕۆکە دەیخاتە بەردەمی کۆمەڵگاکان و تاکەکەسەکان. لە زۆر ڕووەوە سەلەفیەت دینداریی کەسێکە نەیەوێت لە دونیای ئەمڕۆدا بژی، یان نەیەوێت ئاڵۆزییەکانی ناو ئەو دونیایە ببینێت و ئەزموون بکات، بە ئاڵۆزییەکانی ناو کایەی دینیی خۆشیەوە. سەلەفیەت ئامرازێکی نائومێدکەرە و کەسایەتییەکی دینیی بریندار هەڵی گرتوە بۆ پینەکردنی نوقسانییە گەورەکانی بوونی خۆی لەناو ئاڵۆزییەکانی دونیا و پرۆسەی بەپلورالبوونی بەردەوامی فەرهەنگ و دین و کۆمەڵگاکاندا. گەڕانە بەدوای مۆدێلێک لە داڕشتنەوەی دونیادا کە مێژووی سەرجەمی کۆمەڵگاکانی دونیا بەجێیان هێشتوە. بەڵام سەپاندنی ئەم پرۆژە تێپەڕ و مردووە بەسەر کۆمەڵگادا کارێکی مەحاڵ نییە، ئەوەی پێویستە بۆ سەپاندنی ئەم مۆدێلە لەپاڵ پارە و چەک و توانای مادیدا، بوونی دونیایەکی گەندەڵ و پڕ جیاوازیی چینایەتی و کۆمەلایەتی و پڕ غەدر و بێدادیی ئاشکرایە، کە مرۆڤ لە نائومێدیدا بەرەو هەر پرۆژەیەکی ئەلتەرناتیڤ پاڵ پێوە بنێت، لەناویشیاندا پرۆژەی سەلەفیەتی دینی.

## سەلەفیەت وەک کارخانەی دروستکردنی دوژمن

سەلەفیەت لە بەگژاچوونەوەیدا بۆ شێوازە جیاوازەکانی تری دنیداری و جۆرەکانی نادینی و بێدیندا خۆی دەگۆڕێت بۆ ماشێکی گەورەی بەرهەمهێنانی دوژمن. ئەم دوژمنایەتییە تەنها دوژمنایەتییەکی مەدەنیی شارستانی و فەرهەنگی نییە، بەڵکو دادەبەزێت بۆ ئاستی ژیانی ڕۆژانە و دراوسێ دەکاتە دوژمنی دراوسێ و کەسێکی سەر بەم دین دەکاتە

دوژمنی کەسی سەر بە دینێکی دیکە. هاوکات سەلەفیەتی دینی شەپازلەیەکی گەورەیە لە بیرۆکەی هاوڵاتیی یەکسان و دەربازبوون لە دابەشکردنی دونیا لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی دیندار لە بێدین و موسڵمان لە ناموسڵمان. بەم مانایە سەلەفیەت دژ بە بیرۆکەی شارە وەک ڕووبەرێکی پڕ لە جیاوازیی هەمەجۆر، سەپاندنی خەون و خولیایەکی پاکژییەکی خورافییە بەسەر ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دینیدا کە جیاوازیی ئاکارە سەرەکییەکەیەتی.

**سەلەفیەت و دووبارەکردنەوەی جەنگە کۆنەکان**

سەلەفیەت ناچارمان دەکات سەرجەمی ئەو شەڕانەی کە مۆدێرنە و تازەگەرەکانی دونیای ئێمە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە لەگەڵ دونیای تەقلیدیدا دەیکەن، جارێکی دیکە دووبارە بکەینەوە. لە ڕێزگرتن لە ئافرەتان بۆ هاتنەدەرەوە لە ماڵ بەرەو کۆمەڵگا و بەشدارییان لە ژیانی گشتییەوە بیگرە، بۆ ڕێگرتن لە دروستبوون و هاتنەکایەی بیرۆکەی هاوڵاتیبوونی یەکسان لە دەرەوەی ئینتیمای دینیدا، تا بە ڕێگرتن لە بەدەمەوەچوونێکی عەقڵانیانەی بەها تازەکانی دونیا دەگات کە تیایاندا ڕێزی زانست و ڕێزی مرۆڤ و ڕێزی بیرکردنەوەی عەقڵانی بەهای سەرەکین. سەلەفیەت تەنها نامانگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، بەڵکو دەخوازێت بمانباتەوە بەردەم یەک وێنە لە وێنە زۆرەکانی دونیای کۆن خۆشی، ئەو وێنەیەی کە لە دونیای ئێمەدا دەخوازێت هەمووان وەک عەبدوللەتیفی سەلەفی لێ بکات. هەموومان ببین بە کۆپیی کۆمەڵێک سەلەفی ساڵح و شتێک بە ناوی کەسایەتیی

سەربەخۆی تاکەکەسەوە نەمێنێتەوە. ئەم سەلەفیەتە دینییە، چ لە باڵە جیهادییە داعشیەکەیدا و چ لە باڵە مەدخەلییە هێمنەکەیدا، وامان لێ دەکات جارێکی تر زۆر بەتوندی شەڕێک بکەینەوە بۆ بەرگریکردن لە سەرجەمی ئەو دەسکەوتانەی کە ماوەی سەدەیەکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە بڕ و ڕادەی جیاواز بەدەست هاتوون. ئەو جەنگە فەرهەنگی و ڕۆشنبیرییانە دووبارە بکەینەوە کە لەگەڵ هەموو ئەو هێزانەدا کراون کە دژ بە یەکسانیی مرۆڤەکان و یەکسانیی نێر و مێ و دژ بە کورتکردنەوەی تێگەیشتن لە دین بۆ یەک تێگەیشتن بوون. سەلەفیەتی دینی کۆمەڵێک شەڕمان پێ دەکاتەوە کە سەر بە ڕابردووی میلەت و کۆمەڵگای ئێمەیە و ئەنجامدانی ئەم شەڕانەش جگە لە بەفیڕۆدانی وزە و توانایەکی گەورەی کۆمەڵگای ئێمە شتێکی دیکە نییە.

**سەلەفیەت و وێنەی خودا لە شێوەی هیتلەردا**

سەلەفیەت کارخانەی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی سایکۆلۆژیای ترسە، ترسی دینی لە نادین و لەو فۆرمانەی تری دینیش کە لە خۆی ناچن. سەلەفیەت وێنەیەکی تەواو سادە بۆ دین و خوداپەرستی دروست دەکات کە بە هەموو پێوەرێکی مێژوویی و عەقڵانی وێنەیەکی هەڵەیە و خودایەکیش دروست دەکات کە تووڕە و هەڕەشەکەر و سزادەرێکی گەورەیە. لە ڕاستیدا وێنەی سەلەفیەت بۆ خودا وێنەی بوونەوەرێکی تووڕەیە کە خولیای سەرەکیی ئەوەیە مرۆڤ بکاتە بوونەوەرێکی تەسلیمبوو و ئیتاعەتکەر، بیکاتە بوونەوەرێک هیچ ئەرک و کارێکی تری نەبێت جگە

لـە تەلسـیمبوون بـەو وێنەیـە و ژیـان و مـردن لەپێنـاوی ئـەو وێنەیـەدا. سـەلەفیەت لەمـەدا وێنـەی خـودا ڕێـک لەسـەر وێنـەی ستەمگەرە گەورەکانـی نـاو مێـژوو دروسـت دەکاتـەوە، خودایەکـی تـەواو زۆردار و بێڕەحـم و نامیهرەبـان، کـە زیاتـر لـە شـێوەی هیتلـەر و سـەدام حوسـەیندا ئامادەیـە، نـەک لـە وێنـەی عابیـد و شـاعیر و مرۆڤـە میهرەبانەکانـدا. ئـەم خودایـە بوونەوەرێکـە چێـژی کەموێنـە لـە سـووتاندن و برژانـدن و پارچەپارچەکردنـی ئینسـان دەبینێـت.

خودایەکـی لـەو بابەتـە لەنـاو ڕووبـەرە ئاڵۆزەکانـی شـاری مۆدێرنـدا ڕەچەتەیەکـی ترسـناکە بـۆ بەرپاکردنـی جەنگـی دینیـی خوێنـاوی و بەرهەمهێنانـی هێزگەلێـک لـە فۆرمـی داعشـدا.

# سەرچاوەکان

AlSayyad, Nezar & Massoumi, Mejgan (2010). The Fundamentalist City?: Religiosity and the Remaking of Urban Space. Routledge.

Bayat, Asef (2009). Life as Politics: How Ordinary People Change the Middle East. Stanford University Press

Berger, Peter & Luckmann, Thomas (1995). Modernity, Pluralism and cricis of Meaning. Bertelsmann Foundation Pubs.

Cox, Harvey (1966). The secular city: secularization and urbanization in theological perspective. New York: Macmillan Co,.

Kepel, Gilles. Jihad: The Trial of Political Islam. London: I.B. Tauris, 2002.

Meijer, Roel (2009). Global Salafism: Islam's New Religious Movement. C Hurst & Co Publishers Ltd.

Roy, Plivier (2010). Holy Ignorance: when religion and culture parts ways. Columbia University Press.

# بەشی هەشتەم

## سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوە و گوێگرتن

## لەدایکبوونی جەمهوورێکی نائایدیۆلۆژی

## سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوە و گوێگرتن

### سەرەتا

یەکێک لەو دیاردانەی من لەم دە ساڵەی دواییدا تێبینیم کردوە، بوونی "جمهوورێکی گەورە"ی پڕ حەز و شەوقێکی تایبەتە بۆ ئامادەبوون لە کۆڕە ئەدەبی و فیکرییەکان و بۆ گوێگرتن و دیالۆگ، لە دەرەوەی شارە گەورەکانی کوردستاندا. لەو زنجیرە کۆڕانەدا کە من لەم چەند ساڵەی دواییدا و لە کاتی گەڕاندنەوەمدا بۆ کوردستان ئەنجاممان داوە، من ئەم جمهوورە تازەیەم لە هەڵەبجە، لە دەربەندیخان، لە قەڵادزێ، لە ڕانیە و لە کەلار و لە کۆیە بینییوە و لە نزیکەوە ئەزموونم کردوە. گومانیشم نییە لە شارە بچووک و مامناوەندییەکانی تری کوردستاندا هەمان دۆخ لەئارادایە و هەمان جمهوور بوون و ئامادەگیی هەیە. دوابەشی ئەم کتێبە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ تێڕامان لەم دیاردەیە لە چوارچێوەی تێڕامان لە گەشەکردن و گۆڕانکارییەکانی "کایەی ڕۆشنبیری" و "کولتوور" لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا.

**جمهوور کێیە؟**

یەکێک لە دەسکەوتە سەرەکییەکانی سۆسیۆلۆژیای خوێنەر و خوێندنەوە ئەوەیە، کە توانای جیاکردنەوەی زیاد لە جمهوورێکی خوێندنەوەی لەیەکتری هەیە. من لێرەدا و لەبەر کەمیی ماوە و زۆر بەکورتی هەوڵ ئەدەم بۆ ئەو جیاکارییە بگەڕێمەوە، کە لەم سۆسیۆلۆژیایەدا لەنێوان "جمهووری نووسەر" و "جمهووری ناشر"دا دکرێت. ئەم دووانەش یەک جمهوور نین. "جمهووری نووسەر" جمهوورێکی ڕەمزییە، بەشێکە لە کردەی نووسین و داهێنان خۆی، گرێ دراوە لە کردەی نووسینەوە وەک چالاکییەکی کۆمەلایەتی و تاکەکەسیی تایبەت. هەر نووسەرێک کە دەنووسێت لە خەیاڵی خۆیدا جمهوورێک دروست دەکات کە تێکستەکانی ئارستە دەکات و لە ساتەوەختی نووسیندا لە دیالۆگ و ڕاگۆڕکێیەکی بەردەوامدایە لەگەڵیدا. ئەم جمهوورە جمهوورێکی ناوەکییە، لەناو نووسەرەکە خۆیدایە، بەشێکە لە پیشەی نووسین و نووسەربوون. نووسەر گوێ لە ڕەخنە و نارەزاییەکانی ئەم خوێنەرە ناوەکییە دەگرێت و ئاگای لە هەڵسەنگاندنە بەردەوامەکانیەتی بۆ ئەو تێکستانەی کە دەیاننووسێت. ئەم شێوە جمهوورە لەو جۆرە کەسانە پێک هاتووە کە بەها ئەدەبی و هونەری و ئیستاتییەکان دەناسن و خاوەنی زەوقێکی ئیستاتیکی و فیکریی بەرزن و دەتوانن تێکستی باش لە خراپ و تێز و تیورەی زانستی لە قسەی گشتی جیا بکەنەوە. بە مانایەک لە ماناکان ئەم جمهوورە ئەو ڕەقیبە ئیستاتیکی و فیکرییە ناوکییەیە کە لە ناوەوەی نووسەرەکە خۆیدا دروست بووە و بەشێکە لە کردەی نووسین خۆی.

ئەم جمهوورە شتێکە دەکرێت بە "ویژدانێکی ئیستاتیکی" یان "ویژدانێکی فەرهەنگی" و "ئەدەبیی" و "زانستیی" ناوی ببەین. لەم نووسینەدا کە باس لە جمهوور دەکەم، مەبەستم ئەم جۆرە جمهوورە نییە. ئەوەی من دەمەوێت باسی بکەم جۆری دووهەمی جمهوورە کە "جمهووری ناشر"ە، واتە جمهووری ئەو دەزگا و ناوەندانەیە کە بەرهەمەکان بە مەبەستی فرۆشتن و ساخکردنەوەیان لە بازاڕدا چاپ و بڵاو دەکەنەوە. ئەمەش ئەو جمهوورەیە کە کتێب و نووسینەکان دەکڕێت و ئامادەی بۆنەکان و کۆڕەکان و سیمینارەکان دەبێت. ئەم جمهوورە لە دەرەوەڕا دەکەوێتە گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێ لەگەڵ نووسەران و ڕۆشنبیراندا. ئەو کەسانەن کە بوونێکی سەربەخۆیان هەیە و لەگەڵ نووسەردا دەکەونە ڕاگۆڕکێ و بەرخوردی تایبەتەوە. ئەم جمهوورەش جمهوورێکی هێجگار فرەجۆر و جیاوازە، دابەش بووە بەسەر چەندەها گرووپ و یەکەی کۆمەڵایەتیی جیاوازدا، سەر بە فەرهەنگ و کولتوور و دین و پیشە و ژینگە و ناوچەی جیاوازە و هەریەکێکیشیان مێژووی تاکەکەسیی تایبەت و مێژووی خوێندنەوە و فێربوونی جیاوازی هەیە و دەشێت بەسەر چەندان ئاراستەی ئەدەبی و سیاسی و ئایدیۆلۆژی و ئیستاتیکدا دابەش بووبێت.

### نەوەیەکی گەنج وەک خوێنەر و گوێگر

یەکەمین شتێک کە لە دونیای ئێمەدا شوێنی سەرنجە، ئەوەیە لە هەموو ئەو شێوانانەدا کە دەشێت ئەم جمهوورە دەرەکییە بوونی هەبێت، جمهوورێکی گەنج لە گوێگر و قسەکەر ئامادەن کە زۆربەیان لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا لەدایک

بوون. منداڵی ئەو دونیایەن کە لە چارەکەسەدەی ڕابردوودا لەدایک بوون و لەناو وردەکاریی ڕووداوە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانیدا گەورە بوون و هۆشیارییان بەرامبەر بە دونیا بەرامبەر بە نووسین و بەرامبەر بە تێکستەکان کراوەتەوە. سەرنجی یەکەمی من ئەوەیە ئەم نەوەیە لە خوێنەران لە زۆر ڕووەوە لە جمهووری ساڵانی نەوەدەکان و سەرەتاکانی دوو هەزار جیاوازە، زۆر جیاوازتریشە لە جمهووری نووسینی ساڵانی هەفتا و هەشتا. ئەگەر بمەوێت چەمکێک داتاشم بۆ ناساندنی ئەم جمهوورە تازەیە، دەکرێت بڵێم "جمهوورێکی نائایدۆلۆژی"یە، کەسانێکن ئەو سەنگەرگیرییە ئایدیۆلۆژییە بەرفراوانەیان جێ هێشتوە کە لە دوو دەیەی یەکەمی دونیای دوای ڕاپەڕین و لە ساڵە دژوارەکانی هەفتاکان و هەشتاکنیشدا ئامادە بوو. لە کۆڕەکاندا هەم گەنجی ئیسلامی و نائیسلامی، کوڕان و کچانی چەپگەر، خوێنەری لیبرال و نیمچەلیبرال، تاکەکەسی حیزبی و ناحیزبی، کەسانێکیش کە حەزی فێربوون دەیانجووڵێنێت، ئامادە بوون. زۆربەی هەرەزۆریشیان کە قسەیان دەکرد و دەکەوتنە ڕاگۆڕکێ و دیالۆگەوە ئەو حەماسەتە ئایدیۆلۆژییەی ساڵانی نەوەد و دوو هەزار لای ئەمان یان هەر نەبوو، یان ئامادەگییەکی گەورە و بەرچاوی نەبوو.

کە ئەمە دەڵێم نامەوێت باس لە "کۆتایی ئایدیۆلۆژیا" بکەم، هەر لە بنەڕەتیشەوە باوەڕم بەوە نییە واقیعێکی کۆمەڵایەتی بوونی هەبێت خاوەنی ئایدیۆلۆژیای تایبەت نەبێت، پێشم وایە ئایدیۆلۆژیا ڕەهەندێکی گرنگی ژیانی تاکەکەسی و

دەستەجەمعییشە و وەک بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی، هەم لە ئاستی دەزگایی و ڕێکخراوەییدا ئامادەیە، هەم لە ئاستی زمان و وێناکردن و ڕوانیندا، هەم لە ئاستی ڕەمزیدا. ئەوەی دەمەوێت لێرەدا بیڵێم ئەوەیە ئەو پێداگرتنە سەرسەختانەی جاران لەسەر "ڕاستی" و "دروستی"ی دیدە ئایدیۆلۆژییەکان هەبوو، ئەو نەفیکردنەی ئەم یان ئەو ئایدیۆلۆژیا بۆ ئەوی تری هەبوو، ئەو قرتاندنی پەتی پەیوەندیەی دیدە جیاوازەکانی لەیەکتری دادەبڕی، بەو بڕ و ڕادە و گوڕ و هێزەی جارانەوە لەئارادا نەبوو. بەتایبەتی لای ئەو جمهوورەی کە دێت گوێ بگرێت و ئامادەی کۆڕەکان دەبێت. ئەم "جمهوورە تازەیە" گەر هەڵگری ئایدیۆلۆژیایەک یان زیاد لە ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتییش بێت، ئەم ئایدیۆلۆژیایە وایان لێ ناکات گوێ نەگرن، ئامادەگیی ئەوەیان تیا نەبێت ڕا و بۆچوون و دیدی دیکە، جیاواز لەوانەی خۆی، ببیستێت، بەبێ ئەوەی حەماسەتی ئایدیۆلۆژیانەی هەڵبستێت و ڕێگر بێت لە لەدایکبوونی لانی هەرەکەمی پەیوەندیکردن و کارلێک و کارلێکی پێچەوانە لەگەڵ یەکدا. لەو کۆڕانەدا کە من پێشکەشم دەکرد شتێک کە ئاشکرا تێبینی دەکرا غیابی تەواوی "حەماسەتی ئایدیۆلۆژی" بوو لەناو ئەو "ڕووبەرە گشتییانە"دا کە کۆڕەکانی تێدا دەکرا. جۆرێک لە "عەقلانیەتی پەیوەندیخواز" بە مانا هابرمازییەکەی ئامادە بوو، کە هەم فەزایەکی تازە و هەم جۆرێکی تازەی لە ئاخاوتن و ڕاگۆڕکێی دروست کردبوو، کە ئەگەری کارتێکردنی چەندجەمسەری خوێنەران و گوێگران لەسەر یەکتری گەورەتر دەکات (Niemi 2005:

513). بە مانایەکی دیکە لە ئێستادا جمهوورێک ئامادەیە کە بەئاسانی لە قاڵب نادرێت و بەو شێوەیە ئاراستە ناکرێت کە ئایدیۆلۆژیستەکان لە دەیەی یەکەمی دونیای دوای ڕاپەڕیندا بۆیان دەکرا. جمهوورێکە توانای ئەوەی هەیە پردی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا دروست بکات کە لە خۆی ناچن و بە زمانی ئەو لە دونیا ڕانامێنن و ڕاڤەی ناکەن.

## جمهوور، نەک نوخبە

ئەوەی پێویستە خوێنەر لێرەدا لێی ئاگادار بێت ئەوەیە: من باس لە "جمهوور" دەکەم، نەک لەو "نوخبە" ئایدیۆلۆژییانەی لە کوردستاندا ئامادەن و بەسەر دید و ڕوانینە ئایدیۆلژییەکانیان خۆیاندا کڕ کەوتوون، باسی ئەوانەش ناکەم ڕۆژێ بونیادگەر و ڕۆژێک وجودی و ڕۆژێک مارکسی و ڕۆژێکی دیکە پووچگەران. بەکورتی باسی ئەو نوخبانە ناکەم کە ناتوانن بستێک بچنە ئەودیوی ڕوانینە ئایدیۆلۆژییە تایبەتەکانی خۆیانەوە بۆ ئەوەی گوێیان لە شتگەلێک بێت جیاواز و ناکۆک یان دژ بە دیدی خۆیان. تا ئەمڕۆش لە دونیای ئێمەدا چەندان نوخبەی ئایدیۆلۆژیی هەن کە ئاکاری سەرەکییان داخران و چەمانەوەیەکی دۆگماییانەیە بەسەر چەند تێز و تیۆرییەکی تایبەتدا، کە بەشێکی کەمی ئەم تێز و تیورانە پەیوەندییان بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دونیای ئێمەوە هەیە و لە زۆر ڕووەوە دووبارەکردنەوە و گواستنەوەی هەندێک تێزی چەند نووسەرێکی ئەورووپی و نائەورووپین.

**خەونی بەئایدیۆلۆژیاکردنی هەمووشتێک**

دروستبوونی ئەم جمهووره "نائایدیۆلۆژییە"، لە زۆر ڕووەوە هەم کاردانەوەیەکی ڕەفزکەرانەیە بە ڕووی ئەو دونیایەدا کە لە هەوڵی ئەوەدایە هەموو ڕووبەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بەئایدیۆلۆژی بکات، هەم ناڕەزاییدەربڕینە بەرامبەر بەو دونیایە و بەو نوخبانەی ئەو دونیایە بە ڕەنگی چەندان ئایدیۆلۆژیای جیاواز ڕەنگڕێژ دەکەن. ئەمڕۆ سەرجەمی ئایدیۆلۆژیا سەرەکییەکانی دونیای ئێمە لە قەیرانێکی گەورەدان، هەم ئیسلامیزم لە هەموو شێوەکانیدا لە قەیراندایە، هەم ناسیۆنالیزم، هەم ئەو ئاراستە چەپانەی کە جگە لە نوخبەیەکی بچووک توانای گەیشتنیان بە هیچ کەرتێکی کۆمەڵایەتیی نییە، چ ئەو دیدە نیولیبرالانەی دابڕاون لە هەر ڕەهەندێکی گشتی و هاوبەش. هەریەکێک لەم ئایدیۆلۆژیانە بەدەست چەندان کێشەی تایبەتەوە دەناڵێنێت، کە ئێرە شوێنی باسکرنیان نییە، بەڵام هەموویان لەوەدا هاوبەشن کە هیچ زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیی هاوبەش بۆ پێکەوەبوونێکی دەستەجەمعیی هێمنی هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەیان پێ نییە و هەرکەسەیان بەسەر کۆمەڵێک هەقیقەتی ڕەهادا کڕ کەوتوە و هەرکەسەشیان بە شێوازێک ئەوی تر نەفی دەکات و لانی کەم لە ئاستە ڕەمزییەکەدا وێرانی دەکات. پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی نەفیکردن و سڕینەوەیە، شتێک بە ناوی دروستکردنی "چوارچێوەیەکی هاوبەش"، یان "ڕووبەرێک بۆ بەیەکگەیشتن" وەک کردەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی دەستەجەمعی لە خەیاڵدا نییە.

هەریەکێک لەمانە "هەقیقەت"ێک بە هەوادارەکانی دەفرۆشێت کە لەسەر وێرانکردنی "هەقیقەت"ی ئەوانی تر کار دەکات، تا رادەی بە دوژمن و گەمژە و بەجاهیلکردنێکی تەواوەوەتیی ئەوانەی لە خۆی ناچن. بە مانایەکی دیکە شتێک بە ناوی "دیموکراتیبوونی بیرکرنەوە" لەناو ئەم روانینانەدا بوونی نییە. بۆیە هیچ یەکێکیان توانای دۆزینەوەی "زەمینەی هاوبەش" و پێشنیارکردنی "ژیانێکی هاوبەش"ی قابیلی باوەڕپێکردن و پاراستن و گەشەپێدانیان نییە. هیچ یەکێکیان گوتارێکی گشتیی وای پێ نییە کە جێگای هێزی جیاواز و کەسی جیاوازی تێدا ببێتەوە. هیچ ئایدیۆلۆژیایەک لەم ئایدیۆلۆژیایانە بەرز نەبۆتەوە بۆ ئاستی "جیهانبینی"یەک کە کەسە جیاوازەکانی ناو ئەو جیهانە بتوانن بەشێک لە تەفیسرەکانی بۆ دونیا و بۆ پێگەی ئەوان لەو کۆمەڵگایەدا قبوول بکەن. هاوکات لەناو دیدە ئایدیۆلۆژییەکەیاندا "بۆشایی"ەک بوونی نییە هەر گوگێر و بیسەر و بینەرێک، بتوانێت خۆی ئەو بۆشاییە بە زمان و ماناکانی خۆی پڕ بکاتەوە و لەناو گشتێتیی ئەو گوتارە ئایدیۆلۆژییەدا نوقم نەبێت و بتوانێت شوێنێک بۆ خۆی دروست بکات. گوتارە ئایدیۆلۆژییەکانی دونیای ئێمە هێندە سادە و بێقوولایی و دۆگماییین ناتوانن هیچ درز و بۆشاییەک لەناو خۆیاندا دروست بکەن کە ئەگەری هاتنەکایەی دیدی شەخسی و تێگەیشتنی تایبەت بە تاکەکەسەکان ببەخشێت. کە باس لەو بۆشاییە دەکەم، باس لەوە ناکەم ئەم هێزانە لاپەڕەیەکی سپی بدەنە دەست تاکەکەسەکان بۆ ئەوەی خۆیان بە ویستی خۆیان ئەو لاپەڕەیە ڕەش بکەنەوە، بەڵکو باس لە ڕووبەرێک دەکەم کە جێگای دەنگی جیاواز

و ڕوانینی جیاواز و لێکدانەوەی جیاوازی تێدا ببێتەوە و توانای ئەوەی هەبێت ئومێد و چاوەڕوانیی کراوە بە کۆمەڵگا ببەخشێت. لە کوردستاندا زۆرینەی ئایدیۆلۆژیاکان نەک ئەم توانایەیان نییە، بەڵکو کورتیش بوونەتەوە بۆ شوناسی ئەو نوخبانەی کە هەڵیان گرتوون و بەشێکن لە میکانیزمەکانی پاراستنی پێگە و شوێن و خواستەکانی ئەو نوخبانە. بە مانایەکی دیکە بازاڕێکی ئایدیۆلۆژی لە کوردستاندا هەیە و هەرکەسە و کەرەستە و شتومەکە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی نمایش دەکات و زمانی ئەم نمایشکردنەشی زمانی هێرش و بەگەمژەزانینی هەموو ئەوانەیە کە دەکەونە دەرەوەی دوکانە ئایدیۆلۆژییەکەی ئەوانەوە.

ئەگەر بمەوێت تا دواخاڵ لەگەڵ ئەم شیکردنەوەیدا بڕۆم وا باشە بۆ ئەو جیاکارییە بەناوبانگە بگەڕێمەوە کە کۆمەڵناسی ئەڵمانی: کارل مانهایم لەنێوان "ئایدیۆلۆژیا" و "یۆتۆپیا"دا دەیکات. ئەم جیاکارییە دەتوانێت هاریکارمان بێت بۆ تێگەیشتن لە دۆخی ئەو ئایدیۆلۆژیانەی ئەمڕۆکە لای چەند نوخبەیەک لە کوردستاندا ئامادەیە و خۆشحاڵانە وایان کردوە جمهوورێکی "نائایدیۆلۆژی" دروست ببێت، کە بکەونە دەرەوەی هێڵە تۆخەکانی ئەوانەوە (Mannheim 1964).

### ئایدیۆلۆژیا و یۆتۆپیا

کارل مانهایم باوەڕی وایە هەموو فیکرەیەک، هەموو تێزێک، یان ئەوەتا فیکرە و تێزێکی ئایدیۆلۆژییە، یان یۆتۆپی. ئەوەشی دەستنیشانی ئەوە دەکات تێزێک یان بیرێک ئایدیۆلۆژی یان یۆتۆپی بێت، خودی تێزەکە خۆی نییە، بەڵکو دۆخی

گشتیی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تیایدا ئامادە دەبێت. بۆ نموونە ئەوەی دەشێت لە واقیعی ئێمەدا وەک یۆتۆپیا دەر بکەوێت، دەشێت لە هەندێک شوێنی تردا واقیع بێت و ئەوەی لە دونیای ئێمەدا وەک واقیع ئامادە بێت، دەشێت لە شوێنێکی دیکەدا یۆتۆپیا بێت. بەم مانایە پێوەرێکی پێشوەخت بوونی نییە پێمان بڵێت ئایدیۆلۆژیا کامەیە و یۆتۆپیا چییە، ئەوەی دەستنیشانی ئەوە دەکات ڕوانینێک وەک ئایدیۆلۆژیا یان یۆتۆپیا ببینرێت و ئامادە بێت ڕەوت و شوێنبەندی و سیاقە کۆمەڵایەتییەکەیەتی. لە دیدی مانهایمدا ئایدیۆلۆژیا ئەو ڕوانین و تێز و بیرکردنەوانەیە کە دەیانەوێت دونیا بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە هەیە، ئەو شێوازەیە لە بیرکردنەوە و هەوڵدان بۆ جێگیری و نەگۆڕان و هێشتنەوەی شتەکان وەک خۆیان ئاراستەی دەکات و ئێستا و ئاییندەش بەو زمان و چەمک و ڕوانینە لێک ئەداتەوە کە سەر بە ڕابردووە. ئایدیۆلۆژیا هەوڵی ئەوە ئەدات ئێستا بە لۆژیکی ڕابردوو بخوێنێتەوە و بەو لۆژیکەش تەفیسری بکات و وەک ئەو ڕابردووەش بیهێڵێتەوە و نەهێڵێت گۆڕانی بەسەردا بێت. هەرچی یۆتۆپیایە کۆمەڵێک بیر و بۆچوونی دیەکەیە، کە دەخوازێت ئێستا بەجێ بهێڵێت و بەرەو ئاییندە بڕوات، ڕوانینێکە دەخوازێت ئەوەی هەیە و باڵادەستە بگۆڕێت و دونیایەکی نویی لێ دروست بکات. ئەمە وا دەکات یۆتۆپیا هەمیشە ڕووی لە ئاییندە بێت. زۆر بەکورتی، بەردەوامیدان بە ئێستا و بەوەی دروست کراوە، ئەرکی ئایدیۆلۆژیایە و بیرکردنەوە لە دونیایەک جیاواز لەوەی هەیە و دروست کراوە، ئەرکی یۆتۆپیایە.

بە بۆچوونی من ئەوەی لە كوردستاندا ڕوو دەدات ئەوەیە كە هیچ یەكێك لەو ئایدیۆلۆژیایانەی كە هەن هەڵگری هیچ ڕەگەزێكی یۆتۆپی نین كە هێما بۆ ئایندەیەكی جیاواز لەوەی هەیە، بكات. هەریەكێك لەو ئایدیۆلۆژیایانە واقیع و پراكتیكێكی هێندە ناشیرن و بۆگەنیان دروست كردوە، هێما بۆ هیچ واقعێكی ئایندەییی جیاواز و قابیلی باوەڕپێكردن ناكەن. لە ڕەوتی كاركردنی خۆیاندا ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی كە هەن و كار دەكەن گۆڕاون بۆ جۆرێك لە عەشیرەتگەریی تازە و نەك تەنها بە لۆژیكی عەشیرەت كار دەكەن، بەڵكو سەرجەمی ئەو هەڵسوكەوت و پراكتیكانەش نماییش دەكەن كە لە فۆرمە هەرە خراپەكانی عەشیرەتگەرییەوە دێن: شكانی تەواوی بەرامبەر و بێڕێزییەكی گەورە و كەموێنەر بەرامبەر بە هەموو ئەوانەی لە خۆیان ناچن. بەم مانایە سەرجەمی یۆتۆپیاكان لەناو ئایدیۆلۆژییەكاندا مردون، گەر نەمردبێتیشن ئەوا تەواو تا ڕادەی سڕینەوە و كوژانەوەیەكی سەرتاسەری ڕۆیشتوون. بە بۆچوونی من یەكێك لە هۆكارەكانی دروستبوونی ئەو جمهوورە "نائایدیۆلۆژییە"ی باسم كرد، لەم تێكچوونە گەورەیەی پەیوەندیی نێوان یۆتۆپیا و ئایدیۆلۆژیاوە هاتوە، تێكچوونێك وای كردوە سەرجەمی یۆتۆپیاكان لەناو ئایدیۆلۆژیاكاندا تێك بشكێن و بسڕێندرێنەوە. بە مانایەكی دیكە دروستبوونی ئەو جمهوورە نائیادیۆلۆژییە بەرهەمی بۆگەنبوونی خەونە ئایندەییەكانی ناو هەریەكێك لەو یۆتۆپیایانەن كە لەپاڵ ئەو ئایدیۆلۆژیایانەدا دروست بوون.

**بەرخۆریزم وەک ئایدیۆلۆژیا**

لە شوێنی تر و لە نووسینی تردا بەدرێژی باسی ئەوەم کردوە کە ئایدیۆلۆژیای بالادەست لە کوردستانی ئەم دەیەی دواییدا نە ناسیۆنالیزمە، نە ئیسلامیزمە، نە سۆسیالیزمە، نە لیبرالیزم، نە هیچ "ئیزم"ێکی تری لەو بابەتانەشە، بەڵکو بەرخۆریزمە (مەریوان قانع ٢٠١٢). لە زۆر سەرەوە "بەرخۆریزم" لە دەیەی دوایید ئەلتەرناتیڤی هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیانە بووە و کۆمەڵگای ئێمە لە هەموو ئاستەکانیدا نوقمی ناو ئەخلاقیات و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی بەرخۆرییانە بووە. لە پێشەکیی کتێبی *لە چ ئێستایەکدا دەژین؟* باس لەم دیمەنەی بەرخۆری لە کوردستاندا دەکەم: "بەرخۆریی بووە بە دیاردەیەکی جەماوەریی بەرفراوان و لەوە کەوتووە ئاکاری ئەم یان ئەو گروپی تایبەتی ناو ئەو کۆمەڵگایە بێت بەتەنها. هەم چینەکانی خوارەوە و هەم چینی ناوەڕاست و هەم ئەو نوخبە دەسەلاتدار و دەوڵەمەندە، کە بە شێوەیەکی ئەفسانەیی لە سالانی ڕابردوودا دەوڵەمەند بووە، هەموویان بەشێکن لەو شەپۆلی بەرخۆرییەی لە ولاتەکەدا دروست بووە. ئەم بەرخۆرییە ڕووی لە هەموو ئاراستەکانە، وەک چۆن بەرخۆری ڕووبەرێکی گەورەی لە چالاکییە دونیایی و عەلمانییەکانی ئینسانی ئێمەی گرتۆتەوە، بە هەمان شێوە چالاکییە دینییەکانی دونیای ئێمەش ڕووکارێکی بەهێزی بەرخۆرییان وەر گرتوە. وەک چۆن کەرتە نەخوێندەوار یان کەم خوێندەوارەکانی دونیای ئێمە لە بەرخۆرییەوە ئالاون، ئاواش بەشە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکەی ولات بەرخۆرن. هەموو یەکە کۆمەلایەتییەکانیش بەرخۆرن،

هەم خێزان، هەم خێڵ، هەم حیزب، هەم مزگەوت، هەم دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی و هەم دەزگاکانی دەوڵەت خۆیان." ئەم دیاردەی بەرخۆرییە دیاردەیەکی "خۆبەخۆ" و "سروشتی"نییە، گەشەکردنێکی "خۆرسک"ی کۆمەڵگای ئێمە دروستی نەکردوە، بەڵکو دیاردەیەکی سیاسی و ستراتیژیەتێکی تایبەتیی کارکردنی دەسەڵات و مۆدێلێکی تایبەتی دەسەڵاتداریێتی دروستی کردوە و ئاراستەشی دەکات." "بوونی بەرخۆری بە ئایۆلۆژیا لەو جێگەیەدا بەرجەستە دەبێت کە بەرخۆری تیایدا دەبێت بە سەرچاوەی شوناس، دەبێت بە سەرچاوەی بەها باڵادەستەکان، دەبێت بە بەشێک لە چاوەڕوانییە سەرەکییەکانی ئینسان و دەبێت بە بەشێک لەو پەیوەندییانەی کە کەس و گروپ و هێزە کۆمەڵایەتییەکان بەیەکەوە گرێ ئەدات. لەم دۆخانەدا کۆمەڵگا بەگشتی وەک بازاڕ یان وەک مۆڵێکی گەورە دەر دەکەوێت تا هەر شێوازێکی تری پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی". (خوێنەر بۆ وردەکارییەکانی ئەم بۆچوونانە دەتوانێت بۆ کتێبی *لە چ ئێستایەکدا دەژین؟* بگەڕێتەوە).

ئەوەی دەخوازم لێرەدا جەغتی لێ بکەم ئەوەیە بەرخۆریزم ئایدیۆلۆژیایەک نییە توانای لێکدانەوە و تەفسیرکردنی دونیای هەبێت بۆ ئەوانەی لەناویدا نوقم دەبن، بەتایبەتییش لەو ساتانەدا کە بەرخۆریزم تووشی قەیران دەبێت و ناتوانێت بنەما ئابوورییەکانی خۆی بپارێزێت و لە زۆر ئاستیدا هەڵدەوەشێتەوە، وەک دۆخی ئەمڕۆکەی کوردستان. فەشەلی بەرخۆریزم بۆشاییەکی گەورەی لە دونیای ئێمەدا دروست کردوە، کە دەشێت بە دروستبوونی

"بۆشاییەکی نائایدیۆلۆژی" ناوی بنێین، واتە بۆشاییەک دروست بووە کە ئایدیۆلۆژیاکانی ناو دونیای بەرخۆری ناتوانن پڕی بکەنەوە، چونکە هەیمەنەی بەرخۆریزم هەموو ئەوانی تەواو کەمنرخ و بێبایەخ کردوە، ئەمە جگە لەوەی هەموویان بووبوون بە دەرکەوتێک لە دەرکەوتە زۆرەکانی بەرخۆریزم. لەدوای ئەو شکست و قەیرانە گەورانەوە کە بەرخۆریزم بەدوای خۆیدا هێناویەتی، نە.ناسیۆنالیزم و نە ئیسلامیزم و نە دیدە چەپگەراکان، ناتوانن و نەیانتوانیوە ئەم بۆشاییە پڕ بکەنەوە. لەم ئاستەدا هۆکارێکی تری دروستبوونی ئەو "جمهووره نائایدیۆلۆژییە" دروستبوونی ئەم قەیرانە گەورەیە کە بەرخۆریزم لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی، ئەم بنەما کۆمەڵایەتی و مێژووییە تایبەتەیە ئەو جمهووره نائایدیۆلۆژییەی لەسەر دروست بووە.

**ئاکارەکانی ئەم جمهووره تازەیە**

لە سەرەتای ئەم نووسینەدا هێمایەکی خێرام بۆ هەندێک ئاکاری ئەم جمهووره نوێیە کرد، لێرەدا دەمەوێت کەمێک زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بوەستم و هێڵە گشتییەکانی کەمەکێک ئاشکراتر نیشان بدەم:

یەکەم: وەک وتم ئەم جمهووره گەنجە زۆر لە جمهووری سالانی نەوەد و دواتر هێمنتر و گوێگرتر و عەقڵانیترە. گەنجانێکن لە ڕێگای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە و لە ڕێگای دونیای دیگیتاڵییەوە ئاگاداری هێڵە گشتییەکانی زیاد لە ئایدیۆلۆژیایەک لە ئایدیۆلۆژیاکانی ناو کوردستانن. تێکستی زۆرێک لە نووسەران دەناسن، دەتوانن لەسەر ئەو تێکستانە

قسـە بکـەن و ڕای خۆیـان بـە شـێوەیەکی هێمـن دەر ببـڕن.

دووهـەم: ئـەوەی تێبینـی دەکرێت لاوازبوونـی ئـەو ڕۆحـی پەلامـاردان و هێرشـبردنە شـەڕانگێزەیە کـە تـا ئێسـتاش لای نوخبـە ئایدیۆلۆژییەکانـی کوردسـتان ئامادەیـە و جـاران لای بەشێکی زۆری گوێگرانیش هەبوو. ئەو هێرشـە برینداركەرانەی جـاران هەبـوون ئەمـڕۆ لای ئـەو جمهـوورە بـەو بـڕ و ڕادەیـە نەمـاوە، بۆ نموونـە ئیسـلامییەک ئامادەیە گوێی لـە ڕەخنەکردنی ئیسـلام بەگشـتی و ئایدیۆلۆژیای ئیسـلامی سیاسـی بەتایەبـەت بگرێت، بەبـێ دەنگەدەنـگ و بریندارکـردن و ئیهانەکـردن.

سـێهەم: کـە بـاس لـە دروسـتبونی جمهوورێکـی گوێگرتـر و هۆشـیارتر دەکـەم، تەنهـا بـاس لـە گوێگرتنـی فیزیایـی نـاو هۆڵـی کـۆڕەکان ناکـەم، بەڵکـو بـاس لـە لاوازبوونـی زۆرێـک لـەو ڕێگرە ئایدیۆلـۆژی و سـایکۆلۆژییانەش دەکـەم کـە ناهێڵن تاکەکەسـێک گوێ لـە تاکەکەسـێکی دیکە بگرێت. بـەم مانایەشـە کـە دەڵێـم شـتێک بـە نـاوی "عەقڵانیەتـی پەیوەندیخـواز" لـە ڕوانینـە هابرمازیەکـەدا لای ئـەم جمهـوورە دروسـت بـووە.

چـوارەم: بەشـی هـەرەزۆری ئـەم جمهـوورە نوێیـە جمهوورێکـی تـەواو ناڕازییـە بـەوەی کـە هەیـە و دروسـت کـراوە، نـەک تەنهـا لـە ئاسـتە سیاسـییەکەیدا، بەڵکـو لـە ئاسـتی ئایدیۆلۆژیشـدا. ئـەم جمهـوورە بـەدوای ئایدیۆلۆژیایەکـدا ناگەڕێـت قەناعـەت و باوەڕەکانـی خـۆی پـێ ببەخشـێت، بەڵکـو بەدوای چارەسـەرکردنی ڕەگوڕیشـەکانی بێزاری و بێئومێدی و پەراوێزکەوتنـی خۆیدا دەگەڕێت. زمانێکـی دەوێت ئـەو کێشـانە ببینێت و بەرجەسـتە بـکات، ئینجا بشـتوانێت هەندێـک دەرچـەی مێژوویـی کۆنکرێـت پێشـنیار بـکات، نـەک ئـەوەی هەندێـک

وێنەی ڕەنگاوڕەنگیی بەهەشتێکی ئایندەیی ئایدیۆلۆژییان پێ بفرۆشێت.

پێنجەم: ئەم جمهوورە تەنها لە ڕووی سیاسییەوە ناڕازی نییە، بەڵکو لە ڕووی فەرهەنگی و کولتوورییشەوە ناڕازییە. ناڕازییە بە شێوازە باڵادەستەکانی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ، پەیوەندییەکانی ناو خێزان و کولتوور و فەرهەنگی مزگەوتەکان. لەو کۆڕانەدا کە من خۆم وەک قسەکەر تیایاندا ئامادە بووم ئەوەیەکم دەبینی نەدەترسان باسی نهێنییەکانی ناو ژیانی خێزانی و ژیانی تاکەکەسیی خۆیان بکەن و ڕەخنەگرانە باس لە دەزگا سەرەکییەکانی وەک خێزان و مزگەوت و پارتە سیاسییەکان بکەن. هاوکات سەرقاڵبوونیان بە ئەزموونی تاکەکەسانەی خۆیانەوە وەک مرۆڤ، وای لێ کردوون لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە لە دۆخی تەحەداکرنی ئەو دونیایەدا بژین کە ئامادەیە. پێم وایە بەشێکی گرنگی ئەم جمهوورە بۆ ئەوەی بتوانێت مانایەک بە ژیانی خۆی بدات، زۆر جار خۆی وەک غەریبێک لەناو ئەو دونیایەدا وێنا دەکات.

شەشەم: ئەم جمهوورە بەپەرۆشەوە دەیەوێت لەو دونیایە تێبگات کە تیایدا دەژی. بۆیە گەڕان بەدوای بکەری ڕۆشنبیرییدا کە توانای شیکردنەوەی ئەو دونیایەی هەبێت، لە دەرەوەی پیاوانی دین و نووسەرانی ئەدەبیاتدا، یەکێکە لە ئاکارە سەرەکی و جیاکەرەوەکانیان.

حەوتەم: ئەم جمهوورە کەسانێکن تاقەتی جەدەلیان لەپێناو جەدەلدا نەماوە، پرسیاری زۆر کۆنکریتییان هەیە و بەدوای وەڵامی کۆنکریتییشدا دەگەڕێن، گۆڕانی ژیانی شەخسیی

خۆشیان یەکێکە لە ئاراستەکەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی پرسیارەکانیان.

هەشتەم: ئەم جمهوورە بە ڕادەیەکی باش ڕەگەزی مێینەی تێدایە و ژنان بەشێکی گرنگ و بنەڕەتیی ئەم جمهوورە تازەیە پێک دەهێنن.

**کایەیەکی ڕۆشنبیریی نوێ**

کایەی ڕۆشنبیریی ئێمە ئەو سادەیییەی لەدەست داوە کە لە دە ساڵی یەکەمی دوای ڕاپەڕیندا هەیبوو. ئەمڕۆ هەم خوێنەر و گوێگری جیاواز پەیدا بووە، کە ئەم گوێگرە نائایدیۆلۆژیانە شێوازێکیانە، هەم گرووپی ڕۆشنبیریی جیاواز و هەم مینبەری جیاواز و هەم ئاراستە و تەوژمی ڕۆشنبیریی جیاواز دروست بوون. چەپ و ڕاست و دینی و نادینی و عیرفانی و دونیاگەر هەموویان مینبەر و گۆڤار و پێگە و جمهووری تایبەتیی خۆیان هەیە. جگە لەمانە هەم ژمارەی گۆڤار و ڕۆژنامە و سایتەکان زیادیان کردوە، هەم ژمارەی ئەو ئاکادیمیانەی کە لەناو کایەی کولتووردا ئامادەن، هەم ژمارەی ئەو خوێندەوار و ڕۆشنبیرانەی کە زمانە جیهانییەکان دەناسن و دەتوانن کاری وەرگێڕان بکەن. ئەو کایە ڕۆشنبیرییەی لە نەوەدەکان و سەرەتای ساڵانی دوو هەزاردا گۆڤار و گرووپی ڕەهەند تیایدا چالاک بوون، ئەمڕۆ گۆڕانی تەواوی بەسەردا هاتووە. هەم بکەر و بەرهەمهێنەری کولتووری زیادی کردوە و هەم تەواو فرەجۆریش بوون، هەم خوێنەرانیش فرەڕەنگ و فرەجۆر بوون. لەناو کایەی ڕۆشنبیریی ئێمەدا ئەو پرۆسەیە ئامادەیە کە کۆمەڵناسەکان ناوی پرۆسەی "بەرهەمهێنانی جیاوازی"،

یان "بەجیاوازبوون" یان "هەمەڕەنگبوون"ی لێ دەنێن، بە ئینگلیزی پرۆسەی "differntiation".

وەک زۆرینەی تیوریستەکانی ئەم بوارە باسی دەکەن ئەم پرۆسەی "هەمەڕەنگبوونە" دەشێت دوو دەرەنجامی ناکۆک و هاوسایەی لێ بکەویتەوە. واتە دەشێت لە سەرێکەوە هەم جۆرێک لە ئامێزانبوونی کولتووری دروست بکات و ئەو شتە لەدایک ببێت کە ناوی "کایەی کولتوور" یان "کایەی ڕۆشنبیریی"ە وەک کایەیەکی سەربەخۆ لەپاڵ کایەکانی تردا. بەڵام لە سەرێکی دیکەوە دەشێت چەندان شێوازی ململانێ دروست بکات لەنێوان گروپە کولتووری و ڕۆشنبیرییەکانی ناو کایەکە خۆیدا. هەردوو پرۆسەکەش بەخەستی لە دونیای ئێمەدا ئامادەن، بە کۆمەڵێک ئاکار و تایبەتمەندیی تایبەتەوە. واتە لە سەرێکەوە کایەیەکی کولتووریی سەربەخۆ لە دروستبووندایە، بە هەموو نوقسانییەکانیەوە، لە سەرێکی دیکەوە چەندەها گروپ و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی دروست دەبن کە لە ململانێیەکی سەختدان بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەرمایەی ڕەمزی و ڕۆشنبیری لە دونیای ئێمەدا. یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی ئەم دۆخە ئەوەیە، کە ناکۆکییەکانی ناو ئەم کایەیە لە دونیای ئێمەدا بە ڕادەیەک گەورەیە کە پرۆسەی "هەمەڕەنگبوون"ی کولتووری و ڕۆشنبیرییان گۆڕیوە بۆ "پرۆسەی بەجەماعەت" و "بەگروپ" و "بەقوتببوون"ێکی داخراو و ناکۆک و دژبەیەک. لە کایەی ڕۆشنبیریی ئێمەدا بەدەگمەن نەبێت دوو ڕۆشنبیر نادۆزیتەوە نرخی کار و بۆچوونەکانی یەکتر بگرن و دوو گروپیش بوونیان نییە بەهێمنی لەپاڵ یەکدا بن و هەوڵی ئەوە بدەن

لەیەکتری فێر ببن و دونیا فیکری و تیوری و ڕۆشنبیرییەکەی یەکتری دەوڵەمەند بکەن، یان لانی کەم دژایەتییەکی تەواوی یەکتری نەکەن. بێزرخکردنی کاری یەکتری یەکێکە لە ئاکارە سەرەکییەکانی ناو کایەی ڕۆشنبیری و خۆبەقوتبزانینیش ئەو میکانیزمەیە کە ئەم دۆخە ئاراستە دەکات.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە لە دونیای ئێمەدا لە سەرێکەوە شتێک بە ناوی "کایەی کولتوور" و "ڕۆشنبیریی"ەوە دروست بووە بە پێگە و بکەر و جووڵەی جیاوازەوە، بەڵام سیستمە سیاسییە باڵادەستەکە تەنها لەوەدا سەرکەوتو نەبووە کە لۆژیکی کارکردنی خۆی بەسەر کایەکەدا بسەپێنێت، لۆژیکی ململانێکردنێکی ملشکێنانە، بەڵکو لەوەشدا سەرکەوتوو بووە کە لەشکرێکی ویکچوو لە "ڕۆشنبیریی بەیعە" لەناو ئەو کایەیەدا دروست بکات کە کاریان بەیعەدانێکی ڕەمزی و ڕۆشنبیرییە بەو سیستمە سوڵتانییەی ئامادەیە. لەناو کایەی ڕۆشنبیریدا چەندان گروپ هەن هەریەکەیان لەپاڵ ئەم یان ئەو پارتی سیاسی و لەپاڵ ئەم یان ئەو کەسایەتیی حیزبی و لەپاڵ فلان یان فیسار چاپخانە و دەزگا و هەندێک کەسایەتیی تایبەتی ناو گروپە دەوڵەمەند و ملیۆنەرەکەی دونیای ڕاپەڕیندا، درست بوون و کار دەکەن. ئەمەش ململانێکانی ناو کایەی ڕۆشنبیری نەک تەنها تیژتر کردۆتەوە، بەڵکو ڕقاویتر و کوێرانەتریشی کردۆتەوە. نەک تەنها برێکی گەورەی ناکۆکییە سیاسییەکانی ناو دونیای ئێمە بۆ ناو کایەی ڕۆشنبیری گواستراوەتەوە، بەڵکو ناکۆکییەکانی ناو کایەکە خۆشی سەختتر و فراوانتر کردۆتەوە. ئەمەش وای کردوە جۆرێک لە ململانێی تاکەکەسی و گروپچێتی دروست

ببێت، کە لە سەرێکەوە درێژکراوەی ململانێی سیاسی و ئابوورییە ئاشکرا و نهێنییەکان بێت، لە سەرێکی دیکەوە ململانێی بێت لەسەر ناو و ناوبانگ و نفوز، واتە ململانێی بێت لەسەر "سەرمایەی رەمزی."

ئەو جمهوورەی لەسەرەوە باسم کرد، لە زۆرێک لە میکانیزمەکان و لە ململانێکان و لە هەڵسوکەوتەکانی ناو کایە ڕۆشنبیری، نەک تەنها بەوردی ئاگادارە، بەڵکو تەواو بێزار و ناڕازییە.

## ڕۆڵی ڕۆشنبیر

ڕۆشنبیر ڕۆڵێکی نەگۆڕ و جێگیری هەمیشەیی و هەتاهەتاییی نییە، یاسایەکی سۆسیۆلۆژیی بوونی نییە پێمان بڵێت ئەرکی ڕۆشنبیر بەڕەهایی چییە و کامەیە. ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەک و لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەک و لە سەردەم و زەمانێکەوە بۆ سەردەم و زەمانێکی تر دەگۆڕێت. ڕۆشنبیرێک لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا بژی، ئەرکێکی هەیە جیاواز لەوەی لە کۆمەڵگای ئەفغانیدا بژی، ڕۆشنبیرێکی ڕوسی ئەرکێکی لەسەر شانە، جیاوازە لەو ئەرکەی لەسەر شانی ڕۆشنبیرێکی کوردە. ئەمەیە وا دەکات ڕۆشنبیرانی ناو سەردەم و کۆمەڵگا و ژینگە جیاوازەکان بەبەردەوامی لەگەڵ پرسیارگەلێکی لە بابەتی ئەوەی ئایا ڕۆڵی ئەوان وەک ڕۆشنبیر چییە؟ دەرگیر بن، ئایا پێویستە چی لەناو ئەو ژینگەیەدا بکەن و ئەنجام بدەن کە تیایدا ئامادەن؟ بەم مانایە ئەوەی بەرەو قسەکردنمان لەسەر چییەتی ڕۆشنبیر و ڕۆڵەکانی دەبات، نابێت هەندێکی ڕوانینی نەگۆڕ و کۆمەڵێک

یەقینی ئایدیۆلۆژی و فیکری بێت، یان هەندێک بۆچونی بەبەردبووی پێشوەخت بڕیارلەسەردراو بێت. ئەوەی وامان لێ دەکات پرسیار سەبارەت بە ڕۆڵی ڕۆشنبیر و شێوازی ئامادەبوونی بکەین، پێویستە ئەو واقیعە مێژووییە کۆنکریتی و ئاڵۆزە بێت کە لەئارادایە و لەناویدا ڕۆشنبیر وەک یەکێک لە بکەرە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان ئامادەیە.

شتێک کە سەرنجی منی ڕاکێشاوە، بێزاربوون و بێتاقەتبوون و پاشەکشەی تەواوی بڕی هەرەزۆری ئەو ڕۆشنبیرانەن کە لە ڕەخنەگرتن و ململانێکردن لەگەڵ دەسەڵات نەدەترسان، ئەوانەی لەناو ڕووبەری گشتیدا ڕەخنەگرانە ئامادە بوون و لەسەر ڕووداو و هاتنەپێشەوەکان قسە و ڕەخنە و هەڵوێستی ئاشکرایان هەبوو. ئەم نوخبە ڕۆشنبیرییە نەک تەنها پاشەکشەی کردوە و بێدەنگ بووە، بەڵکو وا هەست دەکەیت هەموو کوردستان بسووتێت ئەوان واز لە نووسینی پەخشان و شیعر و ڕۆمان و شانۆ و کورتەچیرۆک ناهێنن و کارەساتەکانی ناو ژیانی گشتی نایانجووڵێنێت. ئەم دۆخە بە ڕادەیەکە شتێک بە ناوی ململانێی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات لە کوردستاندا نەماوەتەوە، یان تەواو تەواو لاواز بووە. ئەمەش وای کردوە زۆرینەی ئەهلی قەڵەم و فیکر، بە شێوازی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، لەناو نەخشەکانی دەسەڵاتدا ئامادە بن.

ڕێک لەو دۆخی بێدەنگییەدایە کە گەمارۆدانێکی تەواوی کاری ڕۆشنبیریی لەئارادایە، نەک تەنها بە هۆی ئەو دۆخە قەیراناوییەوە کە دروست کراوە و بڕستی لە زۆرینەی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایە بڕیوە. بەڵکو بەهۆی دەستگرتنی

تەواوەتیی نوخبەیەکی بچووکدا بەسەر بەشی هەرە زۆری دەزگا ڕۆشنبیرییەکان و دەزگاکانی پەخش و بڵاوکردنەوەشدا. ئەمڕۆ کە بە کردەوە زۆرینەی هەرەزۆری ڕۆشنبیران فەرمانبەری دەوڵەت یان فەرمانبەری پارتە سیاسییەکانی کوردستانن. ئەمە وای کردوە ڕۆشنبیران وەک زۆرینەیەکی بێدەنگ لە وڵاتەکەدا ئامادە بن، یان بەشی زۆریان خەریکی شیعر و ئەدەبیات بن و ئەمەش وەک تاکە ئەرکێک و تاکە ڕۆڵێک ببینن کە پێی هەستن. کە باس لە خۆخەریککردن بە شیعر و ئەدەبیاتەوە دەکەم، بە هیچ شێوەیەک نامەوێت لە نرخی ئەو دووانە کەم بکەمەوە، بەڵام کردنی ئەم دوو فۆرمە لە ئەدەبیات بە میکانیزمێک بۆ هەڵاتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵگا، کێشەیەکی ئەخلاقیی گەورە دروست دەکات، کە نیشانەی پرسیار لەسەر ڕۆشنبیربوونی ڕۆشنبیران دادەنێت. دەبێت ئەو خاڵە لای هەمووان ئاشکرا بێت هیچ کۆمەڵگایەک بەتەنها بە شیعر و ئەدەبیات ناژی، بەتایبەتی کۆمەڵگایەک بەردەوام لەژێر فشار و دەستێوەردانی شێوێنەرانەی زیاد لە هێز و لایەنێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بێت. کۆمەڵگایەکە خەریکە لەوە دەخرێت کۆمەڵگا بێت و هاوبەشێکی ئەخلاقی و ڕەمزی تیادا بێت، کە لانی کەم ڕۆشنبیران بەرگری لێ بکەن و بیپارێزن. دروستبوونی ئەو جمهوورە نائایدیۆلۆژییەی ئەم وتارە باسی دەکات، دیسانەوە کاردانەوەیەکی ڕەخنەگرانەیە بە ڕووی چۆنیەتیی ڕێکخستن و ئیشکردنی کایەی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا.

بەشێک لەم بابەت و تێزانە لە دوابەشی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باس دەکرێن و تیشکی زیاتریان دەخرێتە سەر.

## سەرچاوەكان

مەریوان وریا قانع (٢٠١٢). *لە چ ئێستایەكدا دەژین؟*. سلێمانی، دەزگای ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە.

Mannheim, K. (1936) Ideology and Utopia. London: Routledge.

Niemi, Jari I. (2005). Jürgen Habermas's Theory of Communicative Rationality: The Foundational Distinction Between Communicative and Strategic Action. Social Theory and Practice Vol. 31, No. 4, pp. 513-532

# پیشەسازیی دروستکردنی نوخبە

**سەرەتا**

لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا کۆمەڵێک نوخبە دروست دەبن کە پێشتر لە مێژووی ئێمەدا نە بوونیان هەبووە، نە میکانیزمەکانی دروستبوونی نوخبە بەو شێوەیە بووە کە ئەم نوخبە تازانەی دونیای دوای ڕاپەڕینی پێ دروست دەبن. ئەو ڕۆڵ و ئەرکانەش کە نوخبەکان لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێیان دەسپێردرێت تەواو نوێن و لە قۆناغەکانی پێشتردا لەئارادا نەبوون. هەروەها میکانیزم و ئاسۆکانی گەشەکردن و بەرەوپێشەوەچوونی ئەم نوخبانەش تەواو تازەن و پێشتر بەو فۆرم و ناوەرۆکەی ئەمڕۆوە بوونیان نەبووە.

دونیای دوای ڕاپەڕین لە هەموو کایە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا نوخبەی تازە دروست دەکات، لەوانەش: نوخبەی سیاسی، نوخبەی ئابووری، نوخبەی سەربازی، نوخبەی ئەمنی، نوخبەی میدیایی، نوخبەی دینی، نوخبەی ئەکادیمی، نوخبەی ئەخلاقی، نوخبەی داوەری، نوخبەی کولتووری و نوخبەی ڕۆشنبیری. ئەم نووسینە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ خوێندنەوەی پرۆسە جیاوازەکانی دروستبوونی ئەو نوخبانە و ئەو پرسیارە سەرەکییەش کە دەیکات پرسیارە

دەربارەی چۆنیەتیی دروستبوونی ئەو نوخبانە و چییەتیی ئەو پەیوەندییانەی بە دەسەڵاتەوە گرێیان ئەدات؟

**نوخبە چییە و کێیە؟**

لە زانستی کۆمەڵناسیدا نوخبە بەو کەمینە خاوەن نفوز و کاریگەرییە دەگوترێت کە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرزی لەناو کۆمەڵگادا هەیە و کاریگەریی لەسەر توێژ و هێزە کۆمەڵایەتییەکانی تر هەیە. ئەمانە ئەو کەسانەن کە ناوەندە گرنگەکانی دەسەڵات، لەناو کایە و بوارە جیاوازەکاندا دەگرنە دەست. لەو کەسانە پێک دێن کە بە بەراورد بە کەسانی تری ناو کۆمەڵگا، بەتواناتر و لێهاتووتر و شارەزاترن و ڕۆڵی سەرکردایەتیکردن لەناو کایە و بوارەکانی خۆیاندا دەبینن. چەمکی نوخبە یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو سۆسیۆلۆژیای سیاسی و باسکردنیشی لە چوارچێوەی باسکردنی دەسەڵات و چین و هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا دێت. لە زۆر ڕووەوە شیکردنەوەی دیاردەی نوخبە بەشێکە لە شیکردنەوەی سیستمی سیاسی و چۆنیەتیی دروستبوون و ڕێکخستن و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە کۆمەڵگادا. بەشێکە لە شیکردنەوەی دروستبوونی ئەو بەشەی کۆمەڵگا کە بەکردەوە دەزگا و ناوەند و پێگە گرنگەکان بەڕێوە دەبات. بەکورتی نوخبە هێمایە بۆ ئەو کەمینە کۆمەڵایەتییانەی لە کۆمەڵگادا ئامادەن و دەسەڵات و نفوزێکی دیاریکراویان هەیە و لە زۆر ڕووەوە ڕۆڵی سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵگا لە ئاست و بواری جیاوازدا دەگێڕن و هەوڵی وەدیهێنانی پرنسیپ و ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا وەک گشتێک

ئەدەن، هاوکات خاوەنی هەستکردنێکی گەورە و تایبەتن بە بەرپرسیاریتی.(Hartmann ٢٠٠٦: ٣٣-٣٤)

**دروستبوونی نوخبەکانی دوای ڕاپەڕین**

وەک وتم دونیای دوای ڕاپەڕین دونیای دروستبوونی کۆمەڵێک نوخبەی جیاوازە و میکانیزمەکانی دروستبوونی ئەم نوخبانەش لەم شەش تێزە سەرەکییەدا پێشکەش دەکەم.

یەکەم، دروستبوونی نوخبە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیی زۆر تایبەت ئاراستەی دەکات، کە پەیوەندیی بە توانا و لێزانی و بەهرە و زۆرێکی تر لە ئاکارە کەسییە تایبەتەکانی ئەندامانی ئەو نوخبەیەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێ گەمە و پەیوەندیی سیاسی و بنەماڵایی و حیزبی لە پشتی دروستبوونیانەوەیە، کە وەلای ڕەها بۆ کەس و پارت و بنەماڵە حوکمڕانەکانی کوردستان ژێرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و میهەنیەکەی دەستنیشان دەکات. ئەمەش مانای ئەوەی بەشی هەرەزۆری ئەو نوخبانەی لە کوردستاندا پێگە سیاسی و ئابووری و یاسایی و ئەکادیمی و دەزگایی و دینی و ڕۆشنبیری و میدیاییە گرنگەکانیان لەژێر دەستدایە، کەسانێکن نە لێهاتوویی و نە توانا و نە شارەزایی لەپشتی پرۆسەی "بەنوخبەبوون"یانەوە نییە، بەدەستهێنانی پێگەکانیان بەناو ململانێیەکی پیشەیی یاسایی و ئەخلاقیی ئازادا تێنەپەڕیوە، کە کەسە بەهەرەمەند و بەتواناکانی لە کەسە بێتوانا و بێبەهرەکان جیا کردبێتەوە. بەڵکو بوونی وەلا و گوێڕایەڵیی تەواو بۆ نوخبە حوکمڕان و دەسەلاتدارەکە پێگەکانی پێ بەخشیون. خاڵێک کە گرنگە

لێرەدا ئاماژەیەکی خێرای پێ بکەین، ئەوەیە لانی کەم بەشێک لە ئەندامانی ئەم نوخبە تازانە، نوخبەبوونیان لە ڕێگای کەسوکار و خێزان و بنەماڵەوە بۆ نەماوەتەوە، بەڵکو ئینتیما و وەلائی سیاسی دروستی کردون. نوخبەبوونیان پابەستی پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان نییە، بەڵکو پابەستی وەلائی سیاسییانە. هەموو ئەمانە وا دەکەن دروستبوونی نوخبە تازەکانی دونیای دوای ڕاپەڕین بەشێک بێت لە پرۆسەی دروستبوون و خۆبەهێزکردن و شکڵبەندیی هێزە دەسەڵاتدار و حوکمڕانەکەی دوای ڕاپەڕین خۆی. ئەو میکانیزمە سەرەکییەش کە ئەم پرۆسەی دروستکردنی نوخبەیە بەڕێوە دەبات: بەکارهێنانی سەرجەمی نوخبەکانە بۆ بەهێزکردنی بەردەوامی پێگەی حوکمڕانیی نوخبە سیاسییە باڵادەستەکەی ناو هەرێم.

تێزی دووهەم، ئەو دۆخەی سەرەوە وا دەکات ئەم نوخبە تازانە لە قورساییە کۆمەڵایەتی و سیاسییە لاوازەکەی خۆیان ئاگادار بن و پرۆسەی دروستبوون و گەشەکردنی خۆیان لە ڕێگای وەلائی سیاسییەوە بەباشی بناسن. ئەم نوخبە تازانە ئەو ڕاستییە باش دەزانن کە لێهاتوویی و شارەزایی و لێزانی، یان هۆشیارییەکی پێشکەوتوو و ئاییندەی تایبەت، یان هەستکردنێکی ئەخلاقیی گەورە بە بەرپرسیارێتی، نەیکردون بە نوخبە، بۆیە خۆیان وەک هاوڵاتیی خاوەن ماف و خاوەن بەرپرسیارێتی نابینن، بەڵکو خۆیان زیاتر وەک "شێوازێکی نوێی ڕەعیەت" دەبینن کە وەلائی ڕەها دروستی کردون و وردەکارییەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییان بە دەستی سەروەرەکانیانەوەیە. واتە بە دەستی کەسە

بەهێزەکانی ناو ئەو سیستمە سوڵتانییەوەیە کە لە ڕێگای بەڕەعیەتکردنی نوخبەکانەوە، خەریکی بەڕەعیەتکردنی هەموو کۆمەڵگایە. دەرەنجامی ئەم دۆخەشە ئەوەیە ئەم نوخبانە کە دەبن بە ڕەعیەت لەبەردەمی حوکمڕاناندا، لە هەمان کاتدا دەبن بە پۆلیس بەسەر کۆمەڵگاوە و لەباتیی نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵگا لەبەردەم دەسەڵاتدا، دەبن بە ئامرازێکی بەهێزی دەستی دەسەڵات بۆ کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی کۆمەڵگا.

تێزی سێهەم، ئەم نوخبانە چونکە هەموویان وەلائاتی سیاسیی جیاواز بۆ هێزی سیاسی و کەسایەتیی خاوەن نفوز و باڵی جیاوازی ناو پارتە سیاسییەکان لە پشتی پرۆسەی بەنوخبەبوونیانەوەیە و ئەو وەلائاتە کردوونی بە ئەندامی ئەم یان ئەو نوخبە، نەک هەبوونی دیدێکی گشتگیر و بیرکردنەوە لە پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی کە ژیانی گشتیی کۆمەڵگا کۆڵەکە سەرەکییەکەی بێت، بۆیە هەرگیز نەیانتوانیوە و ناشتوانن وەک نوخبەیەکی یەکگرتو و هاریکار و گشتی کار بکەن. بە مانایەکی تر نوخبە جیاوازەکان ناتوانن لەناو خۆیاندا وەک "نوخبەیەکی هاوشێوە" ئامادە بن و ئەوەی بەیەکیانەوە گرێ ئەدات توانا و شارەزایی و لێهاتوویی هاوبەش و چونیەک بێت، کە یەک مەبەست یان یەک پرۆژە، یان یەک ستراتیژیەتی سیاسیی هاوبەش ئاراستەیان بکات. بەڵکو هەموو دابەشبوونەکانی ناو کایەی سیاسیی لەناو خۆیاندا بەرهەم دەهێننەوە و سەروەریی دەکەن. بەکورتی نوخبەکانی دوای ڕاپەڕین نە دەتوانن دیدێکی هاوبەش دروست بکەن، نە شێوازێکی هاوبەشی کاری پێکەوەیی، نە کۆمەڵێک بنەما و ڕێسای هاوبەش، نە ئەخلاقیاتێکی کۆمەڵایەتیی هاوشێوە، کە

بتوانن هەموویان بە یەکدییەوە کۆ بکەنەوە، یان بیناگۆڕێت بۆ ئەو شێوازە لە نوخبە کە لە سۆسیۆلۆجیای نوخبەدا ناوی "نوخبەی ستراتیژی"ی لێ دەنرێت (Hartmann 2006: 33-34).[1] لە سەروو هەموانیشەوە ئەم نوخبە پارچەپارچە و دابەشبووانە ناتوانن لانی هەرەکەمی ئومێد و مەبەستی هاوبەشیشیان هەبێت. بەشێک لە پارچەپارچەبوونە زۆر و قووڵەکانی دونیای ئێمە پەیوەندیی بە پارچەپارچەبوونی نوخبەکانەوە هەیە.

تێزی چوارەم، هەموو ئەمانە وا دەکەن ئەم نوخبانە خاوەنی دینامیکیەتی ناوەکی و سەربەخۆی خۆیان نەبن، لە دەرەوەی ئەو وەلا و پەیوەندییانەشدا کە بە هێزە دەسەلاتدارەکانەوە گرێیان ئەدەن، هێزێکی سەربەخۆ و کاریگەر نەبن و نەتوانن ببن بە ڕووبەرێک بۆ کۆکردنەوەی بکەرە سیاسی و مەدەنی و دینی و ڕۆشنبیرییە جیاوازەکان بەیەکەوە لەدەوری کۆمەڵێک پرۆژە سەبارەت بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە و دارشتنەوەی "ژیانی گشتی" بە شێوەیەکی دادپەروەرانەتر و پلورالتر و دیموکراسیانەتر. واتە نەتوانن ببن بەو "نوخبە ستراتیژیی"ەی کەباسمان کرد.

تێزی پێنجەم، ئەو نوخبانە چونکە پێگە سیاسی و سۆسیۆلۆژییە لاوازەکەی خۆیان باش دەناسن، بۆیە ڕوانینیان بۆ خۆیان، ڕوانینی نوخبەیەک نییە باوەڕی بە هێز و توانا و لێهاتوویی و خەون و چاوەڕوانییەکانی خۆی

١ _نوخبەی ستراتیژی چەمکێکی گرنگی ناو سۆسیۆلۆژیای نوخبەکانە. خاوەنی ئەم تێزە، کۆمەڵناسی ئەڵمانی: سوزانە کێلەرە. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر تێزەکانی ئەم خانمە بڕوانە هەمان ئەو کتێبەی سەرەوە کە هێنامان پێ کردوە.

هەبێت، بەڵکو هەموویان خۆیان وەک درێژکراوەی هێزێک لە دەرەوەی خۆیاندا دەبینن، هەندێک جار درێژکراوەی هێزی کەسێکی ناو بازنە بەهێزەکانی دەسەلات، کە توانای هەموو جۆرە یاریکردنێکی پێیان هەیە. بە مانایەکی دیکە ئەم نوخبانە هێزێک نین بتوانن ڕۆڵی ناوکۆییەکی کۆمەڵایەتی، یان پردێک ببینن و هێزە ناکۆکەکان و بەشە ناڕازی و جیاوازەکانی کۆمەڵگا لەدەوری خۆیان کۆ بکەنەوە، ئەمەش وا دەکات کاریگەریی پۆزەتیڤیان لەسەر گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتیی تەواو لاواز و پەراوێزی بێت و وەک لە سەرەوە وتمان وەک ئامرازێک لە ئامرازە زۆرەکانی دەستی هێزە حوکمڕانەکان کار بکەن.

تێزی شەشەم، ئەوەی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا ڕوو دەدات، تەنها گۆڕانی "نوخبەی سیاسی" نییە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەوەی جاران پێیان دەوت نوخبەی "پێشڕەو" و "تەلیعە"ی کۆمەڵگا، بۆ چینێکی کۆمەڵایەتیی نوێ، کە هەموو شێوازەکانی سەرمایەی لە کوردستاندا مۆنۆپۆڵ کردوە و هەموو ئامرازەکانی بەکارهێنانی توندوتیژییشی لەژێر دەستدایە، بەڵکو یەکێک لەو کارە ترسناکانەی کە ئەم نوخبە سیاسییە ئەنجامی داوە و بەردەوامیش ئەنجامی ئەدات، بریتییە "لە نوخبەخستنی نوخبەکان"، واتە ڕێگرتن لە دروستبوونی نوخبەی سەربەخۆ و ئازاد لە دەرەوەی کۆنترۆڵ و ستراتیژیەتی حوکمڕانی و ئیشکردنی خۆیاندا و لە دەرەوەی ستراتیژیەتی دروستکردنی کۆمەڵێک "نوخبەی ساختە"دا. ئیشی ئەم نوخبە ساختانەش بریتییە لە خەساندن و بەیدەستکردنی کۆمەڵگا و ڕێگرتن لەوەی کۆمەڵگا بتوانێت

لە دەرەوەی ستراتیژە گەورەکانی دەسەڵاتدا بیر بکاتەوە و بژی و دەستکاریی خۆی بکات.

**چۆنیەتیی کارکردنی کایەکان**

ئەو پرۆسانەی سەرەوە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا وایان کردوە هیچ کایەیەک لە کایە کۆمەڵایەتییەکانی دونیای ئێمە نە کایەی سەربەخۆ بن، نە توانیبێتیان بەسەربەخۆیی کار بکەن. گروپە حوکمڕان و دەسەڵاتدارەکان، بە شێوازی جیاواز، نوخبەی ساختەیان دروست کردوە و لە ڕێگای ئەوانەوە دەستیان خستۆتە ناو سەرجەمی کایەکان و نەیانهێشتوە هیچ یەکێکیان بە پێی یاسا و بەها و ئەخلاقیاتە ناوەکییەکانی خۆی کار بکات. هەروەها ڕێگر بوون لەوەی ئەو کایانە بتوانن بەها و سەرمایەی ناوەکیی سەربەخۆ بە خۆیان دروست بکەن و ئەو بەها و سەرمایانە ململانێ و هاریکاری و گەشەکردنی ناوەکیی کایەکان بەڕێوە ببەن. بۆ نموونە گەر کایەی ئابووری وەر بگرین، لێرەدا شتێک بە ناوی ئابوورییەکی ئازادەوە بوونی نییە کە پێگە و میکانیزمە سەرەکییەکانی لەژێر دەستی نوخبە سیاسییە باڵادەستەکەدا نەبێت و ئەوان ئەوە دیاری نەکەن ئەو ئابوورییە چۆن کار بکات. کارخانە گەورەکان یان هیی خێزانە سیاسییەکانە، یان هیی کەسایەتییە بەهێزەکانی ناو حیزبە، یان هیی حیزب خۆیەتی. ئەگەر کایەی سەربازی وەر گرین، سەرکردە سەربازییەکان و ئەو نوخبەیەی سەرجەمی کایە سەربازییەکە بەڕێوە دەبەن، جەنەڕاڵە شارەزا و ئەفسەرە پیشەیییەکانی ناو کایەکە نین، بەڵکو کوڕ و برا

و خزم و کەسی خێزان و نوخبە باڵادەستەکە خۆیانن. گەر کایەی میدیا وەر بگرین، جگە لەوەی زیاد لە ٩٥ لە سەدی میدیای دونیای دوای ڕاپەڕین، یان میدیایەکی حیزبییە یان میدیای سێبەر، ئەو نوخبەیەی کە کایەی میدیا بەڕێوە دەبەن، میدیاکارە شارەزا و بەتواناکان نین، بەڵکو ئەوانەن کە حیزب و نوخبەی دەسەڵاتدار دایناون و بەو شێوەیە بەکاریان دەهێنێت کە خۆیان دەخوازن. بە کورتییەکەی ئێمە لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا لەبەردەم واقیعێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕەمزیداین، کە کایەکانی ناو ئەو واقیعە لە ناوەوە پەک خراون و لۆژیکی ئیشکردنیان لە لۆژیکێکی ناوەکییەوە گۆڕاوە بۆ لۆژیکێکی دەرەکی و بە شێوازی جیاوازیش پڕ کراون لە نوخبەی ساختەی ئاراستەکراو. ئەمەش وای کردوە هیچ کایەیەک لەناو خۆیدا توانای بەرهەمهێنانی نوخبەی سەربەخۆی نەبێت و نوخبەکانی ناو کایەکان کردەیەکی دەرەکی دروستیان بکات، کە زۆر جار لۆژیکی ئەو کردەیە تەواو ناکۆکە بە لۆژیکی ناوەکیی ئەو کایانە.

**چوار شێواز لە سەرمایە**

لە هەموو کۆمەڵگایەکدا لانی کەم چوار شێوازی سەرەکیی سەرمایە ئامادەن، کە ئەمانەن: سەرمایەی ئابووری، سەرمایەی کۆمەڵایەتی، سەرمایەی مەعریفی و سەرمایەی ڕەمزی. کێشەی ژمارە یەکی کوردستان لەوەدایە کە بەشی هەرە زۆری ئەم سەرمایانە سەرمایەی مۆنۆپۆڵکراون لەلایەن نوخبە دەسەڵاتدارە حوکمڕانەکەی هەرێمەوە. ئابووریی سەرەکی لە کوردستاندا ئابووریی نەوتە و ئەم ئابوورییەش

کورت بۆتەوە بۆ ئابوورییەکی حیزبی و خێزانیی داخراو. هەرچی سەرمایەی ڕەمزییە قورسایی و فۆرمەکانی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، هەندێک شێوازی سەرمایەی ڕەمزی لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا پەکیان خراوە، هەندێکی فۆرمی نوێی ئەم سەرمایەیە دروست کراوە، بۆ نموونە سەرمایەی دینیی بەهێز بووە و سەمارەیەی ڕەمزیی نادینی لاواز. سەرمایەی مەعریفیی گەرچی ئەو نرخەی جارانی نەماوە، بۆ نموونە لە ڕێگای بەلێشاودابەشکردنی بڕوانامە و لەقەبی ئەکادیمی بەسەر خەڵکانێکی زۆردا، بەڵام ئەوەشی کە ماوە شێوازی وەگەڕخستنەکەی و ئەو دەزگایانەی کە پێویستە تیایاندا دەستبەکار بن، مۆنۆپۆڵکراون، ئیتر لە زانکۆ و قوتابخانە و پەیمانگاکانەوە بیانگرە، بۆ ئەو دەزگایانەی تر کە وەک ناوەندی لێکۆڵینەوە و ناوەندی فەرهەنگی و کولتووریی ئامادەن. سەرمایەی کولتووری سەرمایەیەکە بەشێکی گەورەی دەزگا و ڤێستیڤاڵە ئاراستەکراوەکان بەرهەمیان دەهێنن و بڵاویان دەکەنەوە، یان ئەو گروپە کولتوورییانەی کە بەئاشکرا و بەنهێنی لەباوەشی ئەم یان ئەو پارت و ڕێکخراو و کەسایەتی سیاسیدا ئامادەن. ئەم مۆنۆپۆڵکردنەی شێوازە جیاوازەکانی سەرمایە سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکیی ڕێگەگرتنە لە دروستبوونی نوخبەی سەربەخۆ و کاریگەر لە وڵاتەکەدا.

بەکورتییەکەی وەک چۆن سەرمایەی ئابووری لە جومگە و شارەگە سەرەکییەکانیدا مۆنۆپۆڵ کراوە، ئاواش فۆرمەکانی تری سەرمایە، یان بەتەواوی مۆنۆپۆڵ کراون، یاخود شێوێنراون و بێنرخ کراون، یاخود فۆرمی نوێیان

تیادا دروست کردوە کە لەژێر کۆنترۆڵی نوخبە حوکمڕانەکە و دەزگا جۆربەجۆرەکانیدایە.

### نەمانی "هاوبەشی" کۆمەڵایەتی

ئەو دۆخە تازانەی لە سەرەوە باس کران وا دەکەن نوخبە جیاوازەکان نەتوانن گەشە بە دیدێکی هاوبەش بۆ گشتێتی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بدەن. نەتوانن "نوخبەیەکی ستراتیژی" دروست بکەن. هەروەها نەشتوانن کۆمەڵێک پێوەر و بەهای هاوبەش دروست بکەن کە لانی کەم خودی نوخبەکان خۆیان لە دەوری کۆ ببنەوە. لە هەمووشی ترسناکتر ئەوەیە ئەم نوخبانە ناتوانن "ئەجندایەکی مێژوویی هاوبەش" بەرهەم بهێنن کە دەستنیشانی ئەولەویەتەکانی ئەو کۆمەڵگایە بکات. ئەمەش جارێکی دیکە توانای کاری پێکەوەیی نوخبەکان ویرانتر دەکات و وا دەکات هیچ یەکێکیان نەتوانێت لەگەڵ ئەوی دیکەیاندا کار بکات و بەپارچەپارچەیی بمێننەوە. ئەم دۆخی پارچەپارچەبوونە بە ڕادەیەکە تەنانەت لەناو یەک نوخبەدا توانای کاری پێکەوەیی و کۆبوونەوەی بەشە جیاوازەکانی ئەو نوخبەیە لەدەوری ئەجێندا و پرۆژەیەکی مێژوویی و دەستەجەمعی بوونی نەبێت. با ڕۆشنبیران وەک نموونە وەر بگرین.

لەناو ڕۆشنبیرانی دونیای دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام حوسەین و پەرەسەندنی ئابووریی نەوتدا، شتێک بوونی نامێنێتەوە ناوی پرۆژەیەکی دەستەجەمعی بێت و بتوانێت ڕۆشنبیران کۆ بکاتەوە، زۆربەی هەرەزۆری ڕۆشنبیران یان دەبنە تاکەکەسی دابڕاو و سەرقاڵ بە کارە

شەخسییەکانی خۆیانەوە، یان لە بۆنە جیاوازەکاندا دەر دەکەون و بەیاننامەیەک یان نووسینێکی پێکەوەیی ئیمزا دەکەن، یان لە گروپ و دەستەی بچووک و تایبەتدا کۆ دەبنەوە و خەریکی لاساییکردنەوەی ئەزموونی گوڤاری ڕەهەند و نووسەرەکانیانن (کە زۆر جار سایکۆلۆژیا، نەک توانای فیکری و تیوریی تێپەڕاندنی گوڤاری ڕەهەند، دەیانجوولێنێت). هاوکات کەسانێک دروست دەبن لەدەوری ئەم یان ئەو نووسەر و فەیلەسوفی خۆرئاوایی کۆ دەبنەوە و هەموو ڕەخنەکردنێکی ئەو فەیلەسوف و نووسەرانە بە تەکفیرکردنێکی فیکری و زۆر جاریش ئەخلاقیی دەزانن، هەندێکی تر لەدەوری یۆنانی کۆن و ئەرستۆ و ئەفلاتون کۆ دەبنەوە و ئەوانی تر لەدەوری ئەم یان ئەو ڕۆشنبیری دینیی ئێرانی یان هیندی کۆ دەبنەوە، کەسانێکی دیکەش جگە لە خۆیان هەموو کورد یان بە فاشیست یان بە گەمژە یان بە بێمانا دەزانن و بە چەپ و ڕاستدا قسە بە لیبرالیزم و کاپیتالیزم و فێمنیزم و زۆر شتی دیکە دەڵێن، هەندێکی دیکە دیوارێک، نا شورایەکی گەورە، لەنێوان فیکر و سیاسەتدا پێشنیار دەکەن و دەبنە هەڵگری گوتاری بەناسیاسیکردنی هەموو شتێکی دونیای ئێمە، کەسانێکی تر ڕێگای عیرفانیەت دەگرنە بەر، بەبێ ئەوەی واز لە پێدراوە هەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای بەرخۆریی بهێنن، هەندێکی دیکەش ڕەخنەی مۆدێرنە دەکەن بەو لۆژیکە ئایینییەی هەندێک خوێندەواری ئایینیی ئێرانی و هیندیی دەیکەن، بڕێکی دیکە دەکەونە دوای خوێندەوارە سەلەفیەکانی سعودیە و کەسانێکی تر تا ئەمڕۆش بەدەوری سەید قوتبدا دەخولێنەوە، هتد... هاوکات

زۆرینەیەکی بێدەنگ و بێکێشەش هەن کە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە ژیانی گشتیی کۆمەڵگاوە نەماوە، ئەمە جگە لە لەشکرێک لە ڕۆشنبیری بەیعە کە دەسەڵات چۆنی بوێت و کەی بیەوێت بەو شێوەیە بەکاریان دەهێنێت، بەتایبەتی لەو ساتە ستراژتیژیانەدا کە پاراستنی دەسەڵاتی نوخبە حوکمڕانەکە و کەسایەتییە سەرەکییەکانی پێویستیان پێیەتی. بەکورتییەکەی هیچ کۆمەڵە ئامانج و چاوەڕوانییەکی هاوبەش ئەم نوخبە ڕۆشنبیرییە و ڕۆڵ و کارەکانیان بەیەکەوە کۆ ناکاتەوە. جەنگ و جەدەلی نابەرهەمهێنەر و نابەرپرسیاری ناو کایەی ڕۆشنبیری هیچی لە جەنگ و جەدەلی سیاسییەکان لەگەڵ یەکدا کەمتر نییە.

**تەلاقدانی کۆمەڵگا**

ئەگەر بکرێت ئەو دۆخەی سەرەوە لە یاسا یان لە مۆدێلێکی باڵادەستدا کۆ بکەینەوە، دەکرێت بڵێین یاسای سەرەکی کارکردنی نوخبە جیاوازەکانی ئەمڕۆکەی کوردستان یاسای "دوورکەوتنەوەیە لە کۆمەڵگا" و "خەمی گشتی"، یاخود پشتکردنە "ژیانی گشتی" و چەمانەوەیە بەسەر "ژیانی تایبەت"دا. هەر یەکێک لە نوخبەکان بە شێوازێکی تایبەت لە کۆمەڵگا و خەمە گشتییەکان دوور دەکەوێتەوە و هەریەکەشیان بە شێوازی تایبەت خۆی گرێ ئەدات بە نوخبەی حوکمڕانەوە لە کوردستاندا. ئەگەر زۆرینەی کۆمەڵگاکانی جیهان لە ڕێگای نوخبەکانیانەوە قسە بکەن و لە ڕێگای ئەوانە تەعبیر لە خەون و حەز و چاوەڕوانییەکانیان بکەن، هەروەها لە ڕێگای ئەوانە "ئەولەویاتە مێژووییەکان" دەستنیشان

بکـەن و کۆمەڵگا لـەدەوری "ژیانێکـی گشـتیی هاوبـەش" کـۆ بکەنـەوە، ئـەوا ئـەوەی ئەمڕۆکـە ئـاکاری سـەرەکیی کۆمەڵگای کوردسـتانی بێـت وێرانبوونـی نوخبـەکان و هەڵوەشـاندەوەی سیاسـی و ئەخلاقی و ویژدانیـی ئـەوان و پارچەپارچەبوونیانـە. ئـەو نوخبانـەی کـە لـە دونیـای دوای ڕاپەڕیندا دروسـت بـوون نوقمی ناو بەدەسـتهێنان و گەورەکردنی دەسکەوتە تایبەتەکانی خۆیانن لەنـاو دۆخـە گشـتییەکەدا و زۆربەیـان لەگـەڵ خواسـتی هێـزە دەسـەڵاتدار و باڵادەسـتەکاندا دەڕۆن. واتـە ئـەم نوخبانـە نوخبەبوونـی خۆیـان بـە ویسـت و بڕیـار و سـتراتیژییەکانی باڵادەسـتبوونی حوکمڕانانـی هەرێمـەوە گـرێ داوە. وەک پێشـتریش وتـم ئـەم نوخبانـە نوخبەیـەک نیـن دوای ململانـێ و کێبەرکێیەکـی کۆمەڵایەتـی و یاسـایی و فەرهەنگیـی خۆیـان، خۆیـان دروسـت کردبێـت، بەڵکـو سـتراتیژ و کارکردنـی هێـزە حوکمڕانەکانـی کوردسـتان دروسـتی کـردون و زۆربەشـیان درێژکـراوەی ئـەو سـتراتیژانە و پیادەکـەری ئەوانـن.

**نوخبەکان و کولتوور**

بەو ئاکارانەی سـەرەوە نوخبەکانی دونیای ئێمە وەک کۆمەڵێک نوخبـەی ئیفلیـج لەنـاو ژیانـی کۆمەڵایەتـی و سیاسـیدا ئامـادەن و دەر دەکـەون. وەک هێزگەلێکـی بێهێـز، وەک گروپـی بێئومێد و بێپـڕۆژە و بێخـەون، وەک کەسـانێک کـە شکسـتباوەڕی و نائومێدی بەشـێکی ئۆرگانـی و ناوەکیـی پرۆسـەی دروسـتبوون و کارکردنیانـە. یەکێک لـە سـتراتیژەکانی داپۆشین و بەخشـینی ڕەوایەتیی بـەم نوقسـانییە بونیـادی و بـەم عەجزە کۆمەڵایەتـی و مێژووییـە ئەوەیـە، کـە دەرەوەی خۆیـان تاوانبـار بکـەن،

بەتایبەتی "کولتوورێکی دواکەوتوو"ی کۆمەڵگا تاوانبار بکەن کە گوایە هەم دەست و پێی ئەوان و هەم دەست و پێی هەموو هێزە چالاکەکانی تری ناو کۆمەڵگای گرتوە. هەندێکیان زیاتر دەڕۆن و باس لەوە دەکەن کە کۆمەڵگاکە خۆی هیچە و هیچ وزەیەکی گۆڕانکاری و تازەبوونەوەی تێدا نییە، نەک هەر ئەمە، بەڵکو کۆمەڵگاکە خۆی حەزی بە ستەمپەرستی و دیکتاتۆرئەڤینییە. ئەم فەرهەنگی بێخەون و بێئومێد تەسلیمبوون و شکستباوەڕییە تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بگۆڕێت بۆ ئەو دیاردە بەناوبانگەی لە دەروونناسیدا ناوی "ڕقبوونەوە لە خود"ی لێ دەنرێت. فەرهەنگی ئەم نوخبانە، کە لە قووڵاییدا فەرهەنگی پاڵدانەوە و بەیعەنووسین و هەمووشتێکقبووڵکرنە و پەیوەستە بە دۆخی دونیای دوای ڕاپەڕین و شێوازێکی زۆر تایبەتیی دروستبوونیان، لە ڕێگای ئەم "ڕقلەخۆبوونەوە"وە بەگشتی دەکرێت و دەکرێت بە بەشێک لە فەرهەنگێکی چەند هەزار ساڵەی نەگۆڕی کۆمەڵگا. وا نیشان ئەدرێت وەک ئەوەی کۆمەڵگا لەم ناوچەیەدا لەوە باشتری بۆ دروست ناکرێت و خراپیی سیاسی و حوکمڕانان و ئیفلیجیی نوخبەکان ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەوخۆی دۆخی دواکەوتووی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تیایدا دەژین. بەمەش هەموو بەرپرسیاریەتێکی مێژوویی و ئەخلاقیی لەکۆڵی خۆیان دەکەنەوە و بە ملی کۆمەڵگاکەدا هەڵی دەواسن.

بێگومان زۆر کۆمەڵگا لە دونیادا هەڵگری کۆمەڵێک بەها و نرخ و یاسای کولتووری و فەرهەنگییە، کە دەشێت وەک خەزێنەیەک بۆ پایەدارکردنی ستەمگەریی ئامادە بن و کار بکەن، یان دەشێت وەک ڕەگوڕیشە کولتوورییەکانی

ستەمگەری و بێدادیی کۆمەڵایەتی و خراپبەکارهێنانی دەسەڵات، لەئارادا بن. بەڵام بوونی ئەم ڕەگوڕیشەیە شتێکە و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە و پاراستن و چالاککردنەوەیان لەناو دونیای کۆمەڵایەتیدا شتێکی دیکەیە. یەکەمیان ئەگەر پێدراوێکی بابەتیی بێت، دووهەمیان کردەیەکی هۆشیارییانە و ئیرادەگەرانەیە. هیچ کولتوورێکی دێرین و هیچ ڕەگوڕیشەیەک بەبێ بکەری تازە ناتوانێت بەردەوام بێت و کار بکات، یەکێک لە کێشەکانی کۆمەڵگای ئێمە ئەوەیە کە بڕێک لە نوخبەکانی ڕێک ئەو ڕۆڵە داخراو و کۆنەپارێزە دەگێڕن. کردەی هاتنی کولتووریی چەند هەزار ساڵێک لەمەوبەر بۆ ناو دونیای ئەمرۆ پەیوەندی بەو کولتوورەوە خۆیەوە نییە، هەروەها کردەیەکی خۆبەخۆ و ئۆتۆماتیکیش نییە، شتێک لە حەتمیەتی مێژوویی لەپشتیەوە بوونی نییە، بەڵکو ئەم هاتنە کۆمەڵێک بڕیار و ستراتیژ و خەون تەماحی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی مەیسەری دەکات. ئەم شتانەن ئەوەی هەزاران ساڵ لەمەوبەر بەرهەم هێنراوە بۆ ئەمرۆ دەگوازنەوە، نەک کولتووری دێرین و ڕەگوڕیشەکان خۆیان. بەکورتی، ئەم گواستنەوەیە قەدەرێک نییە لە نێوچاوانی ئەو کۆمەڵگایە نووسرابێت، بەڵکو بڕیار و هەڵبژاردنی نوخبە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییە باڵادەستەکانی ناویەتی و ئەوان ئەو فەرهەنگە دێرینە بۆ دونیای ئەمرۆکە دەهێنن و دەیکەن بە بەشێک لە ئێستا.

بەم مانایە ئەوەی ئەمرۆکە لە دونیای ئێمەدا لە ستەمگەری و خراپەکاری و بێدادیی کۆمەڵایەتیی و چەوساندنەوەی ژنان و بێنرخردنی ئینسان بەرپرسیارە کولتووری کۆن و

دێرین نییە، بەڵکو ئەوانەن کە ئەو کولتوورە چالاک دەکەن و بەرهەمی دەهێننەوە، بەکاری دەهێنن، دەیخەنەوە گەڕ، زیندووی دەکەنەوە و بە هەموو کونوقوژبنێکی کۆمەڵگادا بڵاوی دەکەنەوە.

لەوەش بترازێت کولتوور هەرگیز یەک شێوە و یەک ناوەڕۆک و یەک مانا نییە، بەڵکو کۆمەڵێک مانا و بەها و ڕوانین و سونەت و وێناکردنی هەمەجۆر و ئاڵۆز و ناکۆکە بەیەکتری، ئەمانە تەنها کاتێک دەتوانن کار بکەن و ببنە هێزێک بۆ دروستکردنی دونیا، کە بکەرێک یان کۆمەڵە بکەرێک هەڵیان بگرێت و کاریان پێ بکات. فەرهەنگ و کولتوور بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و خۆبەخۆش هۆشیاریی مرۆڤەکان و گروپەکان دروست ناکەن، بەڵکو کردەی دروستبوونی ئەو هۆشیارییە بەناو چەندەها حیساباتی ورد و هەڵبژاردن و بڕیاری بەئاگا و تەفسیری ئیرادەگەرانەدا تێدەپەڕێت. جگە لەمە ئەو ڕەگوڕیشە کولتوورییە کۆنانە و ئەو کەلەپورەی کە هەیە دەکرێت بە دەیان شێوازی جیاواز لێک بدرێتەوە و لە دەیان گۆشەنیگای جیاوازەوە لە سەردەم و قۆناغی جیاوازدا مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، ئەوەی کە مانایەک لە ماناکانی ئەم یان ئەو کولتوور بەسەر ئەوانی تردا زاڵ دەکات، ئەوەی بە کولتوور "جەوهەر"ێک دەبەخشێت، پەیوەندی بە ڕەگوڕیشە فەرهەنگی و کولتوورییەکان خۆیانەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە هاوکێشەکانی دەسەڵات و بە ستراتیژیەتەکانی تەفسیرکردن و بە سیاسەتی پێناسەکردنەوە لەمڕۆدا هەیە. واتە پەیوەندیی بە کاری ئەو نوخبانەوە هەیە کە لە کۆمەڵگادا ئامادەن و کار دەکەن. ئەوەی وای کردوە ئەمڕۆکە بەشێکی گەورەی

کۆمەڵگاکان بۆ دین بگەڕێنەوە، مانای بەهێزیی کولتووری دینیی خۆی نییە، چونکە هەر ئەم کۆمەڵگایانە ڕۆژگارێک بەکارهێنەری بەشێکی زۆری بەهاکانی مۆدێرنە بوون، بە بەهای ڕووتکردنەوەی ڕێژەیی لەش و دانەپۆشینیشەوە، دینداریی ئەمڕۆکە بەرهەمی کاری کۆمەڵێک نوخبەی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگییە، کە لە ساڵانی هەفتاوە لەسەر بەدینیکردنی سەرجەمی ژیانی کۆمەڵایەتی کار دەکەن.

تاوانبارکردنی کولتووری کۆن وەک ئەوەیە گوناهی کێشەکانی دونیای ئەمڕۆمان بخەینە گەردنی باو و باپیرانمان، بیبەستینەوە بەو نەوانەوە کە سەدان و هەزاران ساڵ بەر لە ئێمە ژیاون و مردوون. ئەم شێوازە لە مامەڵەکردنی کولتوور و بینینی وەک سەرچاوەی کێشەکانمان هەم لە تێنەگەیشتن لە دونیای ئەمڕۆوە سەرچاوەی گرتوە، بۆ نموونە تێنەگەیشتن لە چۆنیەتیی دروستبوون و ئیشکردنی نوخبەکانەوە، هەم لە ڕاکردن لە بەرەنگاربوونەوەیەکی ڕاستەقینەی کێشەکان و هەم لە عەقڵیەتی گەڕان بەدوای هۆکارێکی دەرەکیدا بۆ ئەوەی هەموو گوناهەکانی بدەینە پاڵ، هەم لە دۆخی شکستباوەڕی و تەسلیمبوونی نوخبەکانەوە.

**کولتوورگەرایی و ڕقبوونەوە لە خود**

نوخبەی کولتوورگەرا زۆر جار جەوهەرێکی کولتووریی نەگۆڕ بە کۆمەڵگا دەبەخشێت و پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کە ئەم کۆمەڵگایە بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگایەکی گەمژە و نەزان و خورافی و توندوتیژ و بەدڕەوشت و ستەمپەرست بووە. دیکتاتۆریەت و ستەمپەرستی ئاکاری کولتووریی

کۆمەڵگا بووە و لە ڕۆژگارە دێرینەکانەوە بۆ ئەمڕۆش ئەو کولتوورە بەبێ گۆڕانکاریی ماوەتەوە. بە بۆچوونی من ئەم شێوازە لە ڕەخنەکردنی کۆمەڵگا ڕەخنەکردنی خود نییە، کە بێگومان پێداویستییەکی سەرەکی و بنەڕەتیی هەموو هەستانەوە و گۆڕانکارییەکی مێژوویی ڕاستەقینەیە، بەڵکو "ڕقبوونەوەیە لە خود"، ڕقبوونەوە لە خود لە ڕێگای ڕقبوونەوە لە کۆمەڵگا. ڕقێک کە ئەرکی سەرەکیی وێرانکردنی خودی دەستەجەمعی و خودی کولتووری و خودی ڕەمزییە، بە مەبەستی تەبریرهێنانەوە بۆ هیچنەکردنی ئەو نوخبانەی ئەو جۆرە گوتارەیان هەڵگرتوە. بە بۆچوونی من ئەم شێوازە لە شیکردنەوەی کولتوورگەرایی دوو ئەرکی سەرەکی جێبەجێ دەکات. یەکەمیان، پاراستنی نارسیسمی ئەو نوخبەیە خۆی کە پێی وایە ئەو لە میلەت و خەڵک و کۆمەڵگا جیاوازە و وەک ئەوان گەمژە و نەزان و بێمانا و بێکردەوە و بێزەوق و بێهونەر بێجوانی نییە. دووهەمیان، تەبریرکردنی تەواوی ئەو دەسەڵاتدارێتییەیە کە لەئارادایە بە ناوی ئەوەوە هەرکەسێک بچێتە شوێنی ئەوان و حوکمڕان بێت، هەمان تاس و هەمان حەمام دووبارە دەکاتەوە، چونکە، وەک ئەمانە دەڵێن، کۆمەڵگاکە خۆی نەخۆشە و کولتوورەکەی خراپە، بۆیە جگە لە کەسانی نەخۆش و قەبیحیش شتێکی دیکە بەرهەم ناهێنێت. ئاشکرایە ئەم شێوازە لە ڕەخنەکردن ڕەخنە نییە بە مانا عەقڵانی و مێژووی و مادییەکەی، ڕەخنە نییە وەک هێزێک بۆ گۆڕان و تازەبوونەوە، بەڵکو بەرجەستەکردنی سایکۆلۆژیای ڕقبوونەوەیە لە خود خۆی بە مەبەستی گەشەدان بە شکستباوەڕی و تەبریرهێناوە بۆ

هیچنەکردن. ئەمە جگە لەوەی دژایەتیکردنی ئەو فەرهەنگە تایبەت و خۆماڵییانەشە کە بە درێژاییی چەندان سەدە ئامادە بوون و بەشێک بوون لە ژیان و مانەوەی ئەو کۆمەڵگایانە، بە هەموو دەسکەوت و نەهامەتییەکانیانەوە.

ئەو شێوازانە لە ستمگەری و دیکاتۆریەت و کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی کۆمەڵگا کە ئەمڕۆ ئامادەن، ئەو فۆرمە لە ئابووری کە سەروەر کراوە، ئەو دەزگایانەی کە هەن و دروست کراون، هیچیان بەرهەمی کولتووری کۆن نین، هەموو کولتووری کۆنی نەتەوە جیاوازەکانی دونیا بەسەریەکەوە کۆ بکەرەوە ناتوانن ئەو ستمەگەرییە مۆدێرنانە دروست بکەن کە ئێمە لە سەدەی بیستەمدا بینیمان. سیستمە سیاسییەکانی ئەمڕۆکە بەرهەمی دونیای ئەمڕۆن، ئەو بەها کولتووری و ڕەمزییە کۆنانەش کە بەکاری دەهێنن و دەیکەن بە بەشێک لە ئایدیۆلۆژیای خۆیان و لەپاڵیدا وەک یەکێک لە کۆڵەکە زۆرەکانی دروستبوونی ستمەگەری بەکاری دەهێنن، هەموویان لەم سەدەیەدا سەرلەنوێ پێناسە کراونەتەوە و خراونەتە پاڵ ڕوانین و پراکتیکی تر، کە هیچیان لە ڕابردوودا بونیان نەبووە. شێوازە مۆدێرن و تازەکانی دیکتاتۆریەت و ستەمگەریی هێز و تەکنیک و ستراتیژیەتی نوێی دەسەڵارداری دروستی کردوون، کە لە توانای کەلەپوور و کولتووری کۆن و سونەتی و تەقلیدیدا نییە دروستیان بکات.

## کولتوور وەک خودا

ستەمگەری و دیکتاتۆریەتی مۆدێرن، بە ستەمگەری ئەزموونی هەرێمی کوردستانەوە، بەرجەستەبوونی "جەوهەر"ێکی

کولتووری نییە کە لە کۆنی کۆنەوە بۆ ئەمڕۆ هاتبێت و بە درێژایی مێژوو دیکتاتۆر لەدوای دیکتاتۆر و ستەمگەر لەدوای ستەمگەریی بەرهەم هێنابێت. ئەم کولتوورگەرایییە ناتوانێت هاریکارمان بێت بۆ ئەوەی لە سادەترین دیاردەکانی ناو کۆمەڵگا تێبگەین و خراپترین و لاوازترین و ناڕاسترین ڕوانینێکیشە بکرێت دونیای خۆمانی پێ ڕاڤە بکەین. ستەمگەری لەمڕۆکەی کۆمەڵگای ئێمەدا بەرجەستەبوونێکی تازە و سەردەمیانەی ماهیەتێکی کولتووریی دێرین نییە، بەڵکو بەرهەمی دونیایەکی تەواو نوێیە کە کۆمەڵێک هێز و نوخبەی تەواو نوێ دەخوازن پێناسی دیاردە و ڕووداوەکانی بکەن، ستراتیژەکانی حوکمڕانیی تیادا دابڕێژن و بە چەندان میکانیزمی جیاوازیش بیسەپێنن. ئەم دونیایە دونیایەکی نوێیە چ وەک کولتوور و چ وەک ستراتیژیەت و چ وەک شێوازی کارکردن و چ وەک تەکنیک و چ وەک تەکنۆلۆژیای حومکمڕانی. کولتوورگەرایی لێکدانەوەی نوخبەیەکی ڕۆشنبیرییە کە نە ئاگای لە دەسکەوتە زۆرەکانی ناو زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکانە، نە ئاگای لەوەیە ئەو دونیایە چۆن ڕۆژانە دروست دەکرێت و دروست کراوە.

لەم ڕوانینە کولتوورگەرایییەدا، کولتوور زیاتر وەک خودایەک دەر دەکەوێت و ڕۆڵی خودایەکیش دەبینێت کە هەموو شتەکان ڕێک دەخات و ئاراستە دەکات. مەرج نییە کولتوورگەرا هەمیشە چەمکی کولتوور بەکار بهێنێت، هەندێک جار لەباتیی دەستەواژەی کولتوور دەستەواژەی "عەقڵ" بەکار دەهێنێت و لەوێشدا باس لە بوونی عەقڵێکی جێگیر و نەگۆڕ و هاوشێوە دەکات کە ئەویش وەک خودا لە فیکری

دینیدا، بەناو مێژوودا تێدەپەڕێت و هەموو شتەکان دروست و ئاراستە و دەستنیشان دەکات. لەم شێوازە ڕوانینەدا چەمکی "کولتوور" و چەمکی "عەقڵ" هەمان ئەو ڕۆڵە دەبینن کە خودا لە فیکری دینیدا دەیبینێت. خودایەکە کە لە دەرەوەی مێژوو و دەرەوەی کۆمەڵگا و دەرەوەی پەیوەندییە ئینسانی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا ئامادەیە و لەوێشەوە هەموو دیاردەکان و ڕووداوەکان ئاراستە دەکات. ئەمەش، وەک ئاشکرایە، نەک تەنها لێکدانەوەیەکی خورافییە، بەڵکو لێکدانەوەیەکی نابەرپرسیار و نائەخلاقییشە. ستمگەرییەک لە دونیای دوای ڕاپەڕیندا دروست بوویێت و بکەری مێژوویی و کولتووری و کۆمەڵایەتیی نوێ دروستیان کردبێت، هەڵەیە بەرپرسیارێتییەکەی بدەینە پاڵ کولتوورێکی دێرین و پاڵ کەسانێک کە چەندان سەدە بەر لە ئێمە لەم ناوچەیەدا ژیاون.

**نوخبەی حوکمڕان**

ئەوانەی لە کوردستاندا حوکمڕانن، مەبەستم ئەو نوخبەیەیە کە سەرچەمی سەرمایەکانی مۆنۆپۆڵ کردوە، نوخبەیەک نییە هەندێک پرنسیپی ئەخلاقی و سیاسیی ئینسانی ئاراستەی بکات، هەروەها نوخبەیەک نییە کۆمەڵێک پرنسیپی نیشتیمانی و نەتەوەیی ڕێنیشاندەری بێت، ئەم نوخبەیە جگە لە سوود و قازانجی خۆی و جگە لە پاراستنی پێگەکانی دەسەڵاتدارێتیی خۆی شتێکی دیکە ئاراستەی ناکات. ئەمەش وای لێ دەکات لەوە بکەوێت نوخبە بێت بە مانا پۆزەتیڤەکەی نوخبە، هەروەها لەوەش دەکەوێت کەسانێکی ئاسایی ناو کۆمەڵگای

ئێمە بن، بەڵکو گۆڕاون بۆ بوونەوەری ترسناک کە شتێک بە ناوی ویژدانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی لەلایان کار ناکات. ئەمانە کەسانێکن هەموو پێگەکانی دەسەلاتیان لەبەردەستدایە، لەشکر و هێزی چەکداریان هەیە، پارە و سەرمایەیان هەیە، پەیوەندیی هەمەجۆریان بە دونیای دەرەوەوە دروست کردوە، بەلام هیچ بەهایەکی مەدەنی و ئەخلاقیی تەندروست و هیچ فەرهەنگێکی بەرپرسیارێتی و هیچ ڕستێک لە یاسا ئاراستەیان ناکات. ئەمانە زیاتر "غەریزەی دەسەلات" و "شەهوەتی حوکمڕانی" کارەکانیان پێ ئەنجام ئەدات. لەمێژە شتێک بە ناوی "قازانجی گشتی"، یان "ئیرادەی گشتی"، یان "موڵک و ماڵی گشتی" لە قاموسی سیاسی و ئەخلاقیی ئەم نوخبەیەدا نەماوەتەوە و نییە. هیچ هەستێکی سیاسی و ئەخلاقییشیان بەرامبەر بە ئاییندەی ئەو میلەت و کۆمەڵگایە نییە کە حوکمڕانیی دەکەن. بەو شێوەیەش حوکمڕانی دەکەن کە دەسەلاتی خۆیان و منداڵەکانیان بە ئەبەدی و هەتاهەتایی بکەن.

ئەو ڕۆحی بەزین و بێئومێدی و شکستباوەڕییەش کە ئەمڕۆ لە دونیای ئێمەدا ئامادەیە، بەشی هەرە زۆری بەرهەمی ئەو نوخبە بەڕەعیەتکراوانەن کە لەم نووسینەدا باس کران، ئەو نوخبانەی لە نوخبەبوون خراون و بوون بە ئامرازێکی گرنگی دەستی هێزە حوکمڕانە داخراوەکانی کوردستان. شتێکیش بە ناوی ئاییندە و ئومێدەوە لەناو بیرکردنەوە و سایکۆلۆژیای ئەم نوخبە بەڕەعیەتبووانەدا نەماوەتەوە.

## سەرچاوەکان

Hartmann, Michael (2006). The sociology of elites. London, Routledge.